ناوی کتێب: مێژووی زانایانی کورد.

ناوی دانەر: مەلا طاهیر مەلا عبدالله بەحرکەیی.

ژمارەی بەرگ: بەرگی سێیەم.

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم.

ساڵی چاپکردن: ٢٠١٠ز

ناوی چاپخانە: چاپخانەی ئاراس.

لەسەر ئەرکی کۆڕبەندی هزری ئیسلامی چاپ کراوە.

تیراژ: ١٠٠٠ دانە.

نەخشەسازی بەرگ: أحمد فاتح.

خەتی بەرگ: عبد الباسط ملا مسعود.

دیزاین و سەرپەرشتی چاپ وپێداچوونەوە: أبوبكر مەلا طاهیر.

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾ ﴾

سورة يوسف

– غ –

## غازی داود ئەییوبی (١١٦٥)

ناوی غازییە، کوڕی داودی کوڕی محەممەدی کوڕی ئەییوبی کوڕی شادی کوڕی هارونی کوڕی ناصری کوڕی موعەظظەمی کوڕی عادیلی ئەیبوبییە، لە مەلیکەکانی بنەماڵەی سوڵتان صەلاحەدینە لە ٦٣٩ك – ١٢٤١ز لە قەلای (کەرك) هاتووتەدنیا، لە (قاهیرە) پەروەردە بووە، زاتەکی بەرێز بووە، فەرموودەی خوێندووە و لەو بابەتە دەرسی داوە، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٧١٢ك – ١٣١٢ز خۆی و خێزانەکەی کۆچی دواییان کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٣/٧٣.

٢. شذرات الذهب ٦/٣١.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٢٧.

– ف –

## فائیز عبداللە بێتواتەیی (١١٦٦)

ناوی فائیزە، کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا محەممەدئەمینی کونەفلوسەیە، ساڵی ١٩٣١ز لە گەڕەکی عەرەب لە (هەولێر) هاتەدنیا، لە ١٩٣٧ز چووە قوتابخانەکانی پەروەردە، ساڵی ١٩٤٦ز لەسەر داوای باوکی خوێندنی پەروەردەی بەجێ هێشت، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، ساڵی ١٩٥٥ز ئیجازەی وەرگرت، ساڵی ١٩٦١ز کە بابی کۆچی دوایی کرد، کرا جێگری لە دەرسدانەوە و پێش نوێژی و کاروباری مەلایەتی، ساڵی ١٩٧١ز کرا بەڕێوەبەری پەیمانگای ئاینی مزگەوتی حاجی قادر دەباغ، هەروەها کرا ئەندامی کۆڕی زانستی ئەوقاف، دوایی کرا بەڕێوەبەری پەیمانگای ئیسلامی هەولێر، پاشان چووە (گەلالە) بۆ بەشداری شۆڕشی ئازادی کورد، ساڵی ١٩٧٥ز گەڕاوە مزگەوتەکەی خۆیان لە (هەولێر).

کۆچی دوایی: تووشــی نەخۆشــییەکی کوشــندە بــوو، بردیانــە نەخۆشــخانەی (موصل) لەوێ لە ١٧ی مــانگی ڕەمــەزانی پــیرۆز، ســاڵی ١٤١٠ك – ١٢/٤/١٩٩٠ز کۆچی دوایی کرد، لە مزگەوتی یونس پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) شوشترا و خەڵاتی لەبەر کرا و نوێژی لەسەر کرا، هێندراوە (هەولێر) لە گۆڕستانی شێخی چۆلی، لــە تــەك باب و باپیرانی بە خاك سـپێردرا، منیش لــە کۆتـایی سەرەخۆشــی ١٤/٤/١٩٩٠ز لــەو مزگەوتە، ئەو هۆنراوەیەم دانا و خوێندمەوە:

لە پێش چاوم دەڕنی (هەولێر) هەموو چۆل و بیابانە

ئەگەرچی دۆست و مامۆستا گەلێ لێرانە وەستانە

زمانم ناگەڕێ خۆ باوکی (خالید) ناوەکەت بینم

گەلێ زوو کۆچی خۆت تێکنا ئەدی نەتزانی نیسانە

چ ناقەوما ئەگەر جار جار دوو چاوەکاڵەکەت گەش با

ئەوا (سەیدا)ش بە دیدارە لەبەر توو لێرە مێوانە[1]

بە خۆت چووی و ئەمەت هێلا ژیانمان پاشی توو تاڵە

دەبێ سێبوری دڵمان دەین کە ئەو ڕێیە لە پێشمانە

هەرێت دابوو بفەرمووی بۆ (بەحرکە) تا لە خزمەت بین

بمێنێ با لە بۆ جەننەت ئەوێ مەجلیسی یارانە

لە (موصل) توو وەفاتت کرد، ئەویش بەختی سپی خۆت بوو

تکا کارتە (نەبی یونس)، لە بۆ توو خاوەنی خوانە

گومانمان نابی جێگاکەت، لە باغاتی بەهەشت دایە

دەبا شادمانیــی تێکرا تەن سەر و سینە و دل و جانە

---

(١) مەبەست سەیدا مەلا ئەحمەدی ئاکرەیە، دۆستی خۆشەویستی بوو، لە موصل هـەر لـەلای بـوو، لـە تازیـە بەشداربوو.

نزای یاران دەبارێنی لەلای یەزدانەوە ڕەحمەت
لەسەر گۆڕت کە پیرۆزە، لە تەك بابیر و باوانە
لە کۆتایی دەڵێم بۆ خانەدانی (ئال مودەرریس) بەس[٢]
بە تەنیا نین لەسەرخۆشی، کە سەرخۆشی لە هەموانە

مامۆستا دوو کوڕی مەلای هەنە – سوپاس بۆ خودا –:

١. مەلا خالید: پێش نوێژی مزگەوتی قادر دەباغە، بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئاینی سەر بە ئەوقافە.
٢. مەلا عیمادەدین: ووتارخوێنی مزگەوتی شێخی چۆلی یە، ماوەك ئەندامی ئەنجومەنی زانستی ئەوقاف بوو لە هەولێر.

خوای گەورە تەمەنیان درێژ بکا بۆ خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

سەرچاوەکان:

١. نادي الإسلام الى علم الكلام.
٢. دیوانی مەلا طاهیری بەحرکەیی ٣٧ – ٣٨.

## فاخیر محەممەد ڕوفاعی (١١٦٧)

ناوی فاخیرە، کوڕی سەید محەممەدی کوڕی سەید مەحمودە، ساڵی ١٩٢٨ز لە یەك لە گوندەکانی (ناوکوڕ) هاتووتە دنیا، لەلای خاڵی مەلا ئەحمەد خەلیفە لە گوندی (دووگوندانی گەورە) دەستی کرد بە خوێندن، ساڵی ١٩٥٥ز چووە (کەرکوك) لەلایەن مەلا عومەری ئۆمەرگومبەتی و مەلا فتح الله و مەلا عبدالمجیدی قوطب کۆتایی بە خوێندن هینا، لە ١٩٧٠ز کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن لە (قورنە)ی سەر بە (بەصرە)، لە ١٩٧٤ز گواستراوە بۆ (دیالی)، لە ١٩٧٥ز ناردرا (بەعقوبە)، لە ١٩٧٦ز چووە (سەلمان

[٢] ئال مودەرریس: نازناوی مامۆستا عەلییە، برا گەورەی مەلا فائیزە (خوا لێیان خۆش بی).

پاك)، لە ١٩٧٨ز لـەو دەوروبـەری کـرا (واعیـز)، هـەر لـەو سـاڵەوە هاتـە مزگـەوتی (مەئمون) لە (بەغدا).

سەرچاوە: تأريخ علماء بغداد ٥٣٥.

## فاطیمة ئیبراهیم هەکاری (١١٦٨)

ناوی فاطیمەیە، کچی ئیبراهیمی کوڕی داودی کوڕی نەصـری (هەکاری)یـە، ساڵی ٦٨٣ك – ١٢٨٤ز هاتووتەدنیا، زانایەکی فەرموودەناس و ڕێزدار بووە، زانیاری لە مەلایە چاکەکانی سەردەمی خۆی وەرگرتووە، مامۆستای فەرموودەناس زەینـەدینی عێراقـی بەشێکی فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) لەو خاتوونە وەرگرتووە، لە مـانگی ڕەمەزانی ساڵی ٧٥٨ك – ١٣٥٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٣١.
٢. الدرر الكامنة ٣/٢٢٠.
٣. مشاهير الكورد ٢/٢٤٦.
٤. معجم أعلام الكورد ٥٣٣.

## فاطیمة ئەحمەد ئەییوبی (١١٦٩)

ناوی فاطیمەیە کچی ئەحمەدی کوڕی یوسفی کوڕی ئەییوبە، ساڵی ٥٩٧ك – ١٢٠٠ز هاتە دنیا، خاتوونـەکی فـەرموودەناس بـووە، دەرسـی لـەلای مـەلا چـاکەکانی سەردەمی خۆی خوێندووە، لە (دیمشق) لە ماڵی خۆی دەرسی دەداوە، سـاڵی ٦٦١ك – ١٢٦٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٥٣٣.
٢. مشاهير الكورد ٢/٢٤٦.

## فاطیمة ئەحمەد حەڕانی (١١٧٠)

ناوی فاطیمەیە، کچی ئەحمەدی کوڕی قاسمی (حەڕانی)یە، ساڵی ٧١٠ك – ١٣١٠ز لە (مەککە)ی پیرۆز هاتووتەدنیا، دەرسی لەلای برای خۆی و مامۆستا طەبەری – باوکی دایکی – خوێندووە، ئیجازەی بە چەند زانایان داوە، ساڵی ٧٨٣ك – ١٣٨١ز لە (مەدینە)ی پیرۆز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە:معجم أعلام الكورد ٥٣٤.

## فاطیمة حوسێن دیاربەکری (١١٧١)

ناوی فاطیمەیە، کچی حوسێنی کوڕی عبداللە یە، نازناوی (أم محمد)ە، خانمەکی فەرمووردەناس بووە، صەحیحی بوخاری و چەند فەرموودەی خوێندووە، دەرسی بە ئیمامی زەهەبی داوە، ساڵی ٦٩٨ك – ١٢٩٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٥٣٢.

## فاطیمة عیسا نەقشبەندی (١١٧٢)

ناوی فاطیمةیە، کچی عیسای کوڕی طەلحەی کوڕی عومەری کوردی نەقشبەندییە، ساڵی ١٣٠٤ك – ١٨٨٦ز هاتووتە دنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بەخوێندن قورئانی پیرۆز و بەشێك لە شەریعەتی مەزهەبی شافیعی و ڕێزمانی عەرەبی لەلای ئەو تەواو کرد، تەریقەتی نەقشبەندی لەلا وەرگرت، چەند جار سەفەری حەجی کرد لەگەڵ شێخ ئەبولخەیری مەیدانی – مێردی – کە یەك بوو لە مریدەکانی باوکی، ئەو خانمە بەردەوام بوو لەسەر ئامۆژگاری ژنان، کۆمەڵ کۆمەڵ بۆ زانیاری دەهاتنە لای بەتایبەت ڕۆژانی هەینی، ساڵی ١٣٨١ك – ١٩٦٢ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی مەولانا خالید بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: نثر الجواهر والدرر ٢/٩٦٢ – ٩٦٣.

## فاطیمة مەولانا خالید (١١٧٣)

ناوی فاطیمەیە کچی مەولانا خالیدی شارەزورییە، سالّی ١٢٤١ك - ١٨٢٥ز هاتە دنیا، خانمەکی شەرع زان و ئاشنای تەریقەت بووە، لە شیعری کوردی و عەرەبی و فارسی شارەزا بووە، لە (دیمشق) ئامۆژگاری ژنانی دەکرد، سالّی ١٢٨٦ك - ١٨٧٠ز چووە (حەج)، لەوێ لە (مینا) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (معلاة) لە (مەککە)ی پیرۆز بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: تأریخ مشاهیر کورد ١/٤٤٥.

## فتح الله ئیبراهیم حەیدەری (١١٧٤)

ناوی فتح الله یە کوڕی ئیبراهیم ئەفەندی کوڕی حەیدەر ئەفەندی دووەمە، عیصامەدین عومەری خاوەنی کتێبی (الروض النضر) کە سالّی ١١٨٤ك - ١٧٧٠ز کۆچی دوایی کردووە، دەڵێ: {مامۆستا فتح الله حەیدەری مامۆستای خۆمە و چاکی دەناسم، هەر ئەو منی پێگەیاندووە، هەر ئەوە منی بە زانست ناساندووە، لەناو زانایان وەك رۆژی رۆناك شەوقدارە، لە هەموو جۆرە وێژە و رەوانبێژی ئاگادارە، داخەکەی سەردڵم، ئاخەکەی دڵ کوڵم، هێشتا هەر گەنج بوو کۆچی دوایی کرد، لە دیداری شیرینی تێر نەبوین باری کرد،}.

شێخ ئیبراهیم فەصیح دەڵێ: {چەند حاشیەی لەسەر تەفسیری بەیزاوی هەیە}، مامۆستا فتح الله ئەفەندی نامەکی بۆ عوسمانی کوڕی سەند نووسییەوە - کە فەقێی خۆیتی - بەبۆنەی کۆچی دوایی کوڕی، بە ڕاستی نمونەی جوانکاری و ڕەوانبێژییە، بەڕێز محەممەد عەلی قەرەداغی لە بەرگی شەشەمی بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، بەلاوی کردیتەوە.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٢٧.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٣٢.
٣. علماء ومدارس في أربيل ٤٩.
٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/١٨٨ – ١٨٩.

## فتح الله سعێرتی (١١٧٥)

مامۆستا فتح الله یەکە لە زانایە مەزنەکانی سەردەمی خۆی، لە سەرەتای سەدەی چواردەی کۆچی لە شاری (سعێرت) دەرسی داوە، نووسەر و شاعیر بووە، چەند دێرە شیعری نووسیوە بە کوردی بۆ پەسندکردنی کتێبی (الهدية المحمدية)ی ڕێزمانی کوردی.

سەرچاوەکان:
١. مشاهیر الكورد ٣٣٤.
٢. معجم أعلام الكورد ٥٣٦.

## فتح الله عومەر ماردینی (١١٧٦)

ناوی فتح الله یە، کوڕی عومەر زەکی کوڕی محەمەدئەمینی (دیاربەکری ماردینی یە)، زانایەکی شەرع زان و مەزهەب شافیعی بووە، ساڵی ١٢١١ك – ١٧٩٦ز چووە (مەدینە)ی پیرۆز، کتێبی (فتح الاماني في القراءات السبع)ی دانا.
سەرچاوەکان:
١. معجم أعلام الكورد ٥٣٦.
٢. هدية العارفين ٥/٨١٥.

## فتح الله محەممەد هەرتەلی (١١٧٧)

ناوی فتح الله یە، کوڕی محەمەدی کوڕی عەلییە، ساڵی ١٨٩٥ز لە گوندی (هەرتەل) هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە قۆناغی سوختەیی تێپەڕی، چووە (بێتواتە) لای مەلا نەبی حەیدەری، ماوەکیش لەلای مەلا عبدالفتاحی خەتێ بوو، هەروەها (ئوصول) و (کەلام)ی لەلای شێخ طاهای بالیسانی تەواوکرد، چووە (کۆیە) لای جەنابی

مەلا محەممەدی جەلی، ماوە تا ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (هەرتەل) دەستی کرد بە دەرسدانەوە، بەڕێز محەممەد عەلی قەرەداغی دەڵێ: {لە ١٥ ڕەجەبی ساڵی ١٣٣٧ك – ١٩١٩ز موختاری هەرتەل و سەرۆك عەشیرەتی پشت گەلی داوایان لە میرانی عبدالقادر بەگی میر مەحەلی حاکمی شەقڵاوە کرد بۆ مووچە بڕینەوەی مامۆستا، ئەویش داوایەکەی بۆ حاکمی سیاسی (کۆیە) بەرزکردەوە، جا دیارنییە ڕەزامەندی لەسەر داوایەکە دەرچووە، یا نا ؟}.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا یەعقوبی تالشی، مەلا عبدالصمدی سوێسنی، مەلا محەممەدی هەرتەلی، مەلا ئەحمەدی تاژانی، مەلا عبدالرحیمی تالشی، مەلا ئەحمەدی بالیسانی، مەلا عبدالقادری شێخ وەتمانی، مەلا مەحمودی دووگرتکانی، مەلا ڕەسولی عاللایی، مەلا ئەبوبەکری شەرکان، مەلا عەلی حاجی توفیق، مەلا مصطفای هیرانی.

کۆچی دوایی: مامۆستا مەلا فتح الله ساڵی ١٩٤٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.
٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٥/١٧٢ – ١٧٥.
٣. محمد بن عبدالله الجلي ١٢٥.

## فتیان مباح حەڕانی (١١٧٨)

ناوی فتیانە، کوڕی موباحی کوڕی حمەدی کوڕی سولەیمانی کوڕی موبارەکی کوڕی حوسێنە، خەڵکی (حەڕان)ە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، لە بەغدا خوێندیتی، هەرچەندە لە چاوان نابینابووە، بەڵام زانایەکی قورئان خوێن و فەرموودەناس و نەحو و ڕێزمان زان بووە، گەڕایتەوە حەڕان کرایتە موفتی و مودەڕریس، لە (تەجوید) دانراوی هەیە، ساڵی ٥٦٣ك – ١١٦٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٤/٢١٧ – ٢١٨.

٢. معجم المؤلفين ٨/ ٥٤ – ٥٥.

٣. معجم أعلام الكورد ٥٣٧.

٤. الذيل على طبقات الحنابلة ٣/ ٣١٥ – ٣١٦.

## فەرەج ئەبوبەکر ئورمەوی (١١٧٩)

ناوی فەرەجە، نازناوی (ئەبوروحە) کوڕی ئەبوبەکری کوڕی فەرەجە، خەڵکی شاری (ورمێ)یە، زانایەکی شەرع زان و ڕەوشت پاك بووە، لە شاری (نوقـان) شـەریعەتی خوێندووە، مامۆستا سەمعانی دەڵێ: لەگەڵ من پێکەوە تەفسیری (ئەعالیبـــی)مان خوێنـد، پاشان ئەو چووە شاری (مەرو)، دوایی چەند پارچە شیعرم بە دیاری بۆ نارد}.

سەرچاوە: الأنساب ١/١١٩.

## فضل اللە ئیبراهیم حەیدەری (١١٨٠)

ناوی فەضل اللە یە، کوڕی ئیبراهیم ئەفەندی کوڕی حەیدەر ئەفەندی دوومەمـە دەرسی لە خزمەت بابی و ئامۆزاکانی خوێندووە، لەگەڵ عیصامەدینی عومەری هاوچـەرخ بووە، بۆیە باشی ناسیوە و وەصفی دەکات، دەڵێ: {خووڕەوشتی چـاك بـووە، زانایـەکی چالاك بووە، زانست لەناو لـەبی وەك شـەمێ نـەرم بـووە، لـە بنەماڵەیـەکی زانسـتخواز پێگەیشتووە و پەروەردە بووە، ڕۆشنبیری ئەو چەرخەیە، خاوەن دەسەڵاتی ئەو کەرخەیە}.

مامۆستا ئیـبراهیم فەصـیح حەیـدەری دەڵـێ: {نـاوبراو، بـرای بـاپیری منـە، حاشیەی لەسەر تەفسیری بەیزاوی هەیە}، مامۆستا فەضـل اللە لە (مـاوەران) ڕۆیشـت بـۆ ناوچەی (سنە)ی ئێران، پاشان چووە (موصل)، لـەوێ چـووە (حەلـەب)، لـەوێ چـووە (قوسطەنطینییە) لەوێ سوڵتانی عوسمانی زۆر ڕێزی لێنا، گوندەکی پێشکەش کرد لـەلای (کەرکوك)، گەڕاوە (بەغدا).

سەرچاوەکان:

١. سلك الدرر ٤/٥ – ٦.

٢. عنوان المجد ١٢٧.

٣. معجم المؤلفين ٨/٧٣.

٤. علماء ومدارس في أربيل ٥٠.

٥. علماءنا في خدمة العلم والدين ٤٣٢.

## فضل اللە ئەحمەد سیواسی (١١٨١)

ناوی فەضل اللە یە، کوڕی شەمسەدین ئەحمەدە، خەڵکی (سیواس)ە، مەزهەبی حەنەفی بووە، زانایەکی بە توانا بووە، حاشیەی (ضیاء المصابیح) لەسەر شەرحی (مصابیح) داناوە، ساڵی ١٠٣٢ك – ١٦٢٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٨/٧٣.

٢. معجم أعلام الكورد ٥٤٠.

٣. هدية العارفين ١/٨٢٢.

## فضل اللە نەصر ئامێدی (١١٨٢)

ناوی فەضل اللە یە، کوڕی نەصری (ئامێدی)یە، چەند دانراوی هەیە، لەوانە: التحفة المكية و تشويق الحرمين.

سەرچاوەکان:

١. كشف الظنون ١/٣٧٤.

٢. هدية العارفين ٥/٨٢١.

## فطلومك ناصرالدين ئەييوبی (١١٨٣)

ناوی فطلومکە، کچی ناصیرەدین مەلیکی عادیل ئەبوبەکری کوڕی ئەییوبە، ساڵی ٧٤٤ك – ١٣٤٣ز لە (دیمشق) هاتووتەدنیا، دەرسی لەلای نەفیسەخانی کچی

نانەوا و مامۆستا عبدالغالیبی ماکسینی خوێندووە، پاشان خۆی دەرسی بە چەندان دایەتەوە، لەوانە زانای بەناوبانگی ئەو سەردەمی (ابن موسا)، لە (دیمشق) کۆچی کرد.

سەرچاوە: مشاهیر الکورد ٤٤٦.

– ق –

## قاسم ئەبوبەکر هەولێری (١١٨٤)

ناوی قاسمە نازناوی (ئەبومحەممەد)ە، کوڕی ئەبوبەکری کوڕی قاسمە، لە خزمەت باوکی گەڕاوە بۆ خوێندن، صەحیحی ئیمامی موسلیمی وەرگرتووە، لە (دیمشق) بەلاوی کردیتەوە، لە مانگی جیمادی یەکەم، ساڵی ٦٨٠ك – ١٢٨١ز لە تەمەنی هەشتا و پێنج ساڵیدا، کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/٣٦٧.

٢. معجم أعلام الکورد ٥٤٧.

## قاسم ئەحمەد کوردی (١١٨٥)

ناوی قاسمە کوڕی ئەحمەدە، مامۆستایەکی چاوبلند و دڵفراوان بووە، یەك بووە لە پیاو ماقوڵانی کوردی (دیمشق)، لە قوتابخانەی (ئەحمەدییە) دەرسی دەدا، دوایی ئەحمەد پاشای وەزیر کردییە پێش نوێژ و چاودێری ئەوقافی حەزرەتی یەحیا پێغەمبەر (درودی خوای لێ بی) و ئەوقافی ئەحمەد پاشا، لە ٦ی مانگی (محرم)، ساڵی ١٠٦٨ك – ١٦٥٧ز کۆچی کرد.

(محەممەد محبی) خاوەنی کتێبی (خلاصة الأثر)، لە باسی ژیاننامەی مامۆستا قاسم دەڵێ: { مامۆستا زۆر سەخی بووە، ئەوەش شتێکی سەرسوڕهێنەرە کوردبی و سەخی بی؟}

منیش دەڵێم: {ئەو قسەی مامۆستا محەممەد، لە کورت بینی یەوە هاتووە، لەوانەیە چەند کوردێکی کەمی دیتبی بۆیە وادەڵێ، ئەوەش نابێتە بەڵگە و زانیاری،

چونکە (الإستقراء الناقص)ە، واتە تەماشاکردنێکی کورت بینی یە، خۆزیا جەنابی هاتبا کوردستان، دەیدیت چ جۆرە مێوانداری دەکرا، زوو بە زوو لە بڕیارە هەڵەکەی پەشێمان دەبۆوە، سوپاس بۆ خودا، نەك بە دەیان و صەدان، بگرە بە هەزاران پیاوانی وامان هەبووە و هەیە، شەوان و ڕۆژان، دەرگا و دەروازەیان والآ بووە، بۆ خزمەتی هەموو جۆرە مێوانەك، بێ جیاوازی لە نێوان کورد و عەرەب و فارس و تورك، ﴿ويطعمون الطعام على حبه مسكينا ويتيما وأسيراً، إنما نطعمكم لوجه الله لا نريد منكم جزاء ولا شكورا﴾ (الانسان / ٨ و ٩).

نمونەی ئەو زاتانە، ئەوانەی دەیانناسین، شارەزاییمان لەسەریان هەیە، ئەمانەن: مەلا ئەفەندی هەولێر، شێخ مصطفەفای هەرشەمی، حەمە ئاغای کۆیە، جەمیل ئاغای گەردی بەحرکە، سەید ئەحمەدی خانەقا، شێخ محەممەدی کاخدری کەسنەزان، حاجی فاضیل جێژنیکان، ئەمین ئاغای دارەتوو، قادر ئاغای شۆشێ، شێخ ڕەشیدی لۆلان. لەو کاتە چاوی بە وانەکەوتبایە، وابزانم بە ناچاری دەیگۆ: (جێیەك ئاو بیگری هەر دەیگری)، یا: (نەتەوەی شێرانن نایدۆڕێنن).

سەرچاوەکان:


١. علماؤنا في خدمة العم والدين ٤٣٥.

٢. خلاصة الأثر ٢٩٢/٣.

٣. مشاهير الكورد ٢/ ١١١ – ١١٢.

٤. معجم أعلام الكورد ٥٤٨.


## قاسم ئەفەندی غوباری (١١٨٦)

مامۆستا قاسم ئەفەندی یەکە لە زانایە ناودارەکانی شاری (دیاربەکر)، ساڵی ١٠٢٧ك کرا نەقیبی ئەشراف، دوایی کرا قازی (مەککە)ی پیرۆز، پاشان کرا قازی (ئەستەمبۆڵ)، زاتەکی قسە شیرین و خۆشنووس بووە، بە تایبەت لە خەتی (جەلی) و خەتی (غوباری) دەستی بالآ بووە، ئەو مزگەوتی سوڵتان ئەحمەدی نووسیوە لە ئەستەمبۆڵ لە

(مەشاهیر) ساڵی ١٠٢٤ك بۆ کۆچی دوایی نووسراوە، بەڵام لەگەڵ مێژووەکەی سەرەوە ناگونجێ.

سەرچاوە: مشاهیر الکورد ٣٤٢.

## قاسم عبدالله شارەزوری (١١٨٧)

ناوی قاسمە کوڕی عبدالله ی کوڕی قاسمی کوڕی مظفری کوڕی عەلییە، یەکە لە مەلایە چاکەکانی (شارەزور) لە (موصل) دانیشتووە و دەرسی داوە، ماوەك کرایتە قازی، لە ٤ی مانگی شەشەران – شەووال –، ساڵی ٥٣٣ك – ١١٣٩ز لە (موصل) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأریخ مشاهیر کورد ١/٣٧.

## قاسم عبدالمنان گۆرانی (١١٨٨)

ناوی قاسمە کوڕی عبدالمنانی گۆرانی یە، شارەزوری بەجێ هێشت، چووە (شام)، لەوێ دەرسی شەریعەت و ئوصولی دەداوە، پاشان کرا چاودێری سامانەکانی وەقفی (دیمشق)، لە ١٠٥٧ك – ١٦٤٧ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (باب الصغیر)ی دیمشق بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: تأریخ مشاهیر کورد ١/١٨٩.

## قاسم محەممەد کوردی (١١٨٩)

ناوی قاسمە کوڕی محەممەدی کوردییە، قازی و مودەرریس بووە، کتێبی (جمع نسائم السنا في مدینة بوسنا)ی داناوە، ساڵی ١٠٥٠ك – ١٦٤٠ز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ٨/ ١٢٢.
٢. معجم أعلام الکورد ٥٤٩.
٣. هدیة العارفین ١/٨٣٣.
٤. مشاهیر الکورد ٢/١١٢.

## قاسم مظفر شارەزوری (١١٩٠)

ناوی قاسمە کوڕی مظفری کوڕی عەلی شارەزوریە، نازناوی (ئەبو ئەحمەد)ە، حاکم بووە لە (هەولێر)، چوویتە (بەغدا) لەوێ دەرسی فەرموودەی دایتەوە، ناوبراو باپیری قازییەکانی ئەو بنەماڵەیە، لە جزیرە و شام و موصل، ساڵی ٤٨٩ك – ١٠٩٦ز لە (موصل) کۆچی دوایی کرد.

دوو کوڕی زانای هەبوون: محەمەد و عبدالله.

سەرچاوەکان:


١. تأريخ أربيل ١/٢٠١ /٢/٣٠١.
٢. وفيات الأعيان ٣/ ٢٣٢ – ٢٣٣.
٣. أربيل في مختلف العصور ٢١.
٤. أربيل في العهد الاتابكي ٣٥.
٥. الأنساب ٣/٤٨٩.
٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٤١ – ٤٤٢.
٧. شذرات الذهب ٣/٣٩٣ /٤/١٢٣.
٨. طبقات الشافعية ٢/٩٦.
٩. الأعلام ٣/٣٦٠ /٦/٢٠.
١٠. تأريخ مشاهير كورد ١/٣٣.
١١. تأريخ السليمانية ٢٥٨.
١٢. معجم أعلام الكورد ٥٥٠ – ٥٥١.
١٣. اللباب ٢/٢١٦.
١٤. مشاهير الكورد ٢٤٤.


## قاسم یەحیا شارەزوری (١١٩١)

ناوی قاسمە کوڕی یەحیای کوڕی عبدالله ی کوڕی قاسمی کوڕی مظفری شارەزوریە، ساڵی ٥٣٤ك – ١١٣٩ز هاتە دنیا، لە (بەغدا) شەریعەتی لەلای عەلی

یوسفی دیمشقی خوێند، پاشان چووە (شام) لەوێ سوڵتان صەلاحەدین ڕێزی لێنا، کردیە قازی (شام) دوایی چووە (موصل)، پاشان چووە (بەغدا) لەوێ کرا سەرۆکی قازیەکانی حەنەفی و شافیعی، پاشان کرا قازی (حەما)، لە ٥٩٨ك کۆچی دوایی کرد، زانایەکی شەرع زان بوو، ماقول و بەسام بوو، لە فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) شارەزا بوو، دەستی شیعری هەبوو.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعية الكبرى ٤/١٧٥.

٢. شذرات الذهب ٤/٣٤٢.

٣. معجم البلدان ١/٢٥٨.

٤. معجم أعلام الكورد ٥٥١.

٥. البداية والنهاية ١٣/ ٣٦.

## قیوامەدین حەسەنی (١١٩٢)

مامۆستا قیوامەدین حەسەنی، یەکە لە زانایەکانی صەدەی دوازدەی کۆچی زانیاری لە نەحو و صەرف و دەستووری نووسین و ژمێریاری و فەلەکیات بەهێز بووە، لەو بابەتانە هۆنراوەی هەیە، لەوانە:

١. عروة الاسطرلاب: سەرەتایەکەی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| وبعد فالخلاصة الشريفة | مشحونة بالدرر اللطيفة |
| أرجو به التيسير للحساب | والذكر بالخير لدى الأحباب |

لە کۆتاییدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| تأريخها اذ نظمت فصيحة | قد أمليت بالعروة الصفيحة (١١٢١ك) |

٢. رمح الخط، في نظم رسم الخط: سەرەتایەکەی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| قال قوام شاكر للنعم | حمدا لمن علمنا بالقلم |
| نظمت للكتاب رسم الخط | نظماً رشيقاً مثل (رمح الخط) |

لە کۆتاییدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| فهذه قواعد الكتاب | والآن وقت الختم للكتاب |
| فالتزم القصد بلا تخط | وقوم الخط (برمح الخط) |
| هذا كتاب حسنه جلي | في نظمه وقدره علي |
| أرخته بـــ (صبح فيض منجلي) | فقلت (رمح الخط سمكه علي) |
| ١١٢٣ك | ١١٢٣ك |

٣. الصفيحه وتهذيب الاخلاق: سەرەتایەکەی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| قال قوام حامدا مقصرا | مصليا مسلما مستغفرا |
| يا طالب الفضل بالاستحقاق | عليك بالتهذيب للأخلاق |

لە کۆتاییدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| تم بعون الله ذي الجلال | تهذيب الاخلاق بلا ملال |
| دستور فضل حجمه صغير | في وضعه وقدره كبير |

ساڵی ١١٢٥ك – ١٧١٣ز تەواوی کردووە.

٤. الوافية: هۆنراوەی (شافیة)ی (ئیبن حاجیب)ە، سەرەتایەکەی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| وبعد فاحفظن صرف الشافيه | وسمها منظومة بـ(الوافية) |
| واغن بها يا ولدي الحفيا[1] | لا زلت في كرامة مهديا |

لە کۆتاییدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| تم بعون الله صرف الشافيه | ورخته فقلت (نظمي الوافيه)١١٣٣ك |
| أبياتها ( بليغة عليه ) | عدتها (منظومة قويه ) |
| ١١٦٢ | ١١٦٢ |

٥. صافیة: هۆنراوەی (کافیە)ی ئیبن حاجیبە، لە سەرەتای دەڵێ:

[1] لەگەڵ ئەبو طالیبی کوڕی خۆی دایە، کە ئەو هۆنراوەی بۆ داناوە.

| | |
|---|---|
| قال قوام الدين من بني الحسنْ | ثبته الله على القول الحسنْ |
| وبعد فالكافية المرضية | قد حوتِ القواعد النحوية |
| نظمتها كاختها في نسقِ | لابني (ابي طالب)نِ الموفق |
| وكل راغب من الفتيان | يطلب بالعلم رضا الرحمان |
| فخذ بها نظما لطيف القافية | وسمها لحسنها بـ (الصافية) |

ئەوەشی بۆ (ئەبو طالیب)ی کوڕی داناوە، لە کۆتاییدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| قد تمت الصافية العزيزة | تأريخها (المنظومة الوجيزة) |
| | ١١٣٤ك |
| أبياتها (شريفة طريفة) | عدتها (طريفة شريفة) |
| ٨٩٩ك | ٨٩٩ك |
| فالحمدلله ولطفه كمل | وفيضه عم وفضله شمل |

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٥/٢٨١ – ٢٨٨.

– ك –

## کامیل عەلی ماردینی (١١٩٣)

ناوی کاملە، کوڕی عەلییە، خەڵکی (ماردین)ە، ساڵی ٧٠٧ك – ١٣٠٧ز چووە (حەج)، گەڕاوە (دیمشق) لەوێ لە مانگی ڕەمەزان کۆڕێکی گەورە بەسترا چەند خاوەن دەستەڵات و پیاو ماقوولان ئامادەبوون مامۆستا ئامۆژگاری کردن، دوایی کۆڕێکی تریان بۆ بەستا ناوبراو زمان ڕەوان و زیرەك و شاعیر بوو.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٤٦.
٢. الدرر الكامنة ٣/٢٦١.

## کولاب حەمزە حەڕانی (١١٩٤)

ناوی کولابە کوڕی هەمزەیە، خەڵکی (حەڕان)ە، لە (نەحو) شارەزا بووە چەند دانراوی هەنە، لەوانە: الاراكة، الجامع في النحو، ما تلحن فيه العامة.

سەرچاوەکان:

١. كشف الظنون ٢/١٥٧٧.

٢. هدية العارفين ٥/٨٣٧.

٣. الفهرست ٨٢.

٤. معجم المؤلفين ٨/١٤٥.

– ل –

## لەبیب حوسێن دیاربەکری (١١٩٥)

ناوی لەبیبە کوڕی حوسێن ئەفەندییە، خەڵکی دیاربەکرە، یەکە لە قازییە بەرزەکان و ڕۆشنبیرەکانی سەردەمی خۆی، ساڵی ١١٨٢ك – ١٨٦٨ز لە (دیاربەکر) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٣٤٨.

٢. معجم أعلام الكورد ٥٦٥.

## لطف الله محەممەد ئەرضرۆمی (١١٩٦)

ناوی لطف الله یە، کوڕی محەممەدی ئەرزڕۆمییە، مەزهەبی حەنەفییە، لە شاری (حەلەب) دابەزیوە، لە زۆربەی زانستەکان شارەزا بووە، ساڵی ١٢٠٢ك – ١٧٨٧ز کۆچی دوایی کرد لە (حەلەب).

دانراوەکانی: (تفسير القرآن الكريم) و (اختصار المواقف) و (معارج النور في شرح اسماء الله الحسنى) و (المطالب الموعودة والمكاسب المحسودة).

سەرچاوەکان:
١. معجم المؤلفین ٨/١٥٥.
٢. هدیة العارفین ١/٨٤٠.
٣. إیضاح المکنون ٢/٤٩٦.

**لطفی ئەفەندی دیاربەکری ( ١١٩٧ )**

مامۆستا لوطفی ئەفەندی خەڵکی شاری (دیاربەکرە) لەو شارە کرایتە موفتی، رۆشنبیر و شاعیر بووە، ساڵی ١٢٦٣ك – ١٨٤١٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: مشاهیر الکورد ٣٤٨.

– م –

**ماجد کوردی ( ١١٩٨ )**

مامۆستا شێخ ماجید لە کوردەکانی دەوروبەری (موصل)ە، ماوەك لە موصل دانیشت، دوایی چووە چیای (حەمرین)، لەوێ ماوە تا ساڵی ٥٦١ك – ١١٦٥ز کۆچی دوایی کرد، هەر لەوێ بە خاك سپێردرا.

شێخ ماجید یەك بووە لە زانایە بەرزەکانی سەردەمی خۆی، هاوچەرخ بووە لەگەڵ شێخ عبدالقادری گەیلانی، پیری تەریقەت بووە، خاوەن کەشف و کەرامات بووە، زاتەکی دڵپاك و کردەوە چاك بووە، فەرموودە پیرۆزەکانی هەموو پەند و ئامۆژگارینە، بەڵام زۆربەیان زاراوەی تەصەووفی دوور و قوڕن، زانینیان زەحمەتە، بۆ نمونە بە عەرەبی دەڵێ: {من اشتاق إلی ربه أنس، ومن أنس طرب، ومن طرب قرب، ومن قرب سار، ومن سار حار، ومن حار طار، ومن طار قرت عینه بالاقتراب}.

مانایەکەی بە کوردی – ئەوەی من لێی دەزانم – ئەوەیە: {کەسێ دڵی ببزوێ بۆ خودا بۆی دادەبەزی، ئەوەی دابەزی دێتە سەما، ئەوەی هاتا سەما نزیك دەبی، ئەوەی نزیك بوو دەڕوا، ئەوەی ڕۆیی دەشێوێ، ئەوەی شێوا دەفڕی، ئەوەی فڕی چاوگەش دەبی بە گەیشتنی خوداوەند}.

سەرچاوەكان:

١. جامع كرامات الأولياء ٢/٤٤٦ – ٤٤٧.

٢. منهل الأولياء ٢/١٠٨ – ١١٠.

٣. تأريخ مشاهير كورد ١/٦٢.

## ماجید محەممەد صالح (١١٩٩)

ناوی ماجیدە، كوڕی محەممەد صالحی كوڕی شێخ فەیزواللە ی كوردییە، ساڵی ١٢٩٢ك – ١٨٧٥ز لە شاری (مەككە)ی پیرۆز هاتووتە دنیا، پاش تەواوكردنی خوێندنی خەریكی بەلاوكردنەوەی زانیاری و زانست بوو، چاپخانەی تایبەتی خۆی هەبوو، لە دەرەوە كتێبی دەهینا چاپی دەكرد، چەند پلە و پایەی پێدرا، نوێنەری بەڕێوەبەری زانیاری گشتی بوو، ماوەك كرا بەڕێوەبەری ئەوقاف، ساڵی ١٣٤٩ك – ١٩٣٠ز لە (مەككە)ی پیرۆز كۆچی دوایی كرد.

دانراوەكانی: معجم كنز العمال، معجم التخاميس: ئەوە شیعرە، المنتخبات الماجدية: ئەدەبیاتە، فهرس مخطوطات المكتبة.

سەرچاوەكان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٥٢.

٢. الأعلام ٧/٢٣٨.

٣. معجم أعلام الكورد ٦٧٣.

٤. نثر الجواهر والدرر ٢/١٤١٥.

## مبارەك حەسەن شارەزوری (١٢٠٠)

ناوی موبارەكە كوڕی حەسەنی كوڕی ئەحمەدی كوڕی عەلی كوڕی فەتحانی شارەزورییە، ساڵی ٤٦٢ك – ١٠٦٩ز هاتووتەدنیا، لە (بەغدا) دابەزیوە، لەوێ كرایتە سەرۆكی قورئان خوێنان، ساڵی ٥٥٠ك – ١١٥٥ز كۆچی دوایی كردووە.

دانراوەکـانی: (الزخـائر في القـراءات) و (المصـباح الزاهـر في القـراءت العشـر البواهر).

سەرچاوەکان:


١. تأريخ أربيل ١/١٨٦.

٢. المنتظم ١٠/٤١٢.

٣. الأعلام ٣/٢٦٠.

٤. الأنساب ٣/٤٨٩.

٥. أربيل في العهد الاتابكي ٢٨٨.

٦. هدية العارفين ٦/٢.

٧. معجم المؤلفين ٨/١٧١.

٨. كشف الظنون ١/٨٢٢.

٩. شذرات الذهب ٤/١٥٧.

١٠. سير أعلام النبلاء ١٢/١٥٨ – ١٥٩.


## مبارەك حەسن هەولێری (١٢٠١)

ناوی موبارەکە کوڕی حەسەنی کوڕی موبارەکی کـوڕی ورودی هەولێرییـە، نازناوی ئەبو عبدالرحمانە، ناسراوە بە (الـشعار) لەبەر ئەوەی خەریکی فرۆشتن و شەکردنی (موو)ی ئاژەڵ بـووە، پاشـان دەسـتی بـە بازرگـانی کـردووە، لـە زۆر وڵاتـان گـەڕاوە، فەرموودەی لە (بەغدا) خوێندووە، سەفەری کردووە بۆ (بەصـرا) و (دیمشـق) و (میصـر) زانایەکی زیرەك و زەین تیژ بووە، بڕوای تەواو بووە، شاعیرەکی چاك بووە، ساڵی ٦٢٤ك -١٢٢٧ز لە (بەصرە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأريخ أربيل ١/٣١٦.

## مبارەك عبیداللە دیاربەکری (١٢٠٢)

ناوی موبارەکە نازناوی ئەبو رضایـە، کـوڕی عوبێـداللە ی کـوڕی حوسـێنە، ناسراوە بە (ئەغلاقی)، لەوانەیە باب و باپیرانی دارتـاش بـووبن، (کیسـەرە) و (کلیـل) و (پشکە) و (شمشیرە) یان دروست کردبی، مامۆستا بـاوکی خـەڵکی (دیاربـەکرە)، لـەوێ باری کرد چووە شاری (واسیط) لەوێ نیشـتەجێ بـوو، ئـەو کـوڕە لـەوێ بـوو، لـەوێ پەروەردە بوو، مامۆستا زانایەکی ڕاستگۆ و بە دین و ئەمین بوو، لە (بەغدا)ی خوێنـدووە. عبدالکریم سەمعانی خاوەنی کتێبـی (الأنساب) دەڵـێ: {یەکـەم جـار چـوومە (واسـیط) چەند فەرموودەم لێ وەرگرت}.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ١/٢٠٤.

٢. اللباب ١/٧٨.

## مبارەك محەممەد تفلیسی (١٢٠٣)

ناوی مبارەکە کوڕی محەممەدی کـوڕی عەلییـە، خـەڵکی شـاری (تفلـیس)ە، مەزهەبی شافیعی بووە، دەرسی لەلای موبارەکی کوڕی ئەثیر خوێندووە، مێژوونووس بووە ئیمامی سوبکی دەڵێ: {مێـژووی شـافیعییانی دانـاوە بـە دوو بـەش}، سـاڵی ٦٤٤ك – ١٢٤٦ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. هدیة العارفین ٢/٣.

٢. معجم المؤلفین ٨/١٧٣ – ١٧٤.

## مبارەك محەممەد جزیری (ابن الأثیر) (١٢٠٤)

ناوی موبارەکە کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدی کـوڕی عبـدالکریمی کـوڕی عبدالواحیدی جزیرییە، نازناوی (مجدالدین)ە، برا گەورەی (عزالدین)ی خـاوەنی کتێبـی (أسد الغابة) و (ضیاء الدین)ی خاوەنی کتێبـی (المثل السـائر)ە، هـەر سـێك ناسـراون بـە

(ابناء الأثیر) بژاردە مەلا چاکی جزیرەی بۆتانن لــە کوردســتانی تورکیــا، بــەڵام مامۆســتا عبدالرحمانی سیوطی (خ) لە کتێبــی (بغیة الوعــاة) بە (هەولێر)ی ناوی نووسیوە، مامۆســتا موبارەك ساڵی ٥٤٤ك – ١١٤٩ز لە جزیرە هاتووتەدنیا.

مامۆســتا یــەك بــووە لــە زانایــە ناســراوەکانی ســەردەمی خــۆی، لــە گــەورە نووسەرەکان و دانەرەکان دەژمێردرا، یەك بوو لە ماقولەکان، شارەزایی تایبەتی هەبوو لــە فەرموودە و شەریعەت، لە چەند وڵاتان گــەڕا بــۆ وەرگــرتنی زانیــاری، ســاڵی ٥٦٥ك – ١١٦٩ز چووە (موصل)، بەردەوام خەریکی نووسین و کتێب دانان بوو، تــا لــە ئەنجامــدا نەخۆش کەت، دەست و پێیەکانی لە جوولە کەتن، سولّتان (نــورەدین) داوای لــێ کــرد پلەی وەزیری پێ ببەخشی بەڵام لەبەر ئەوەی حەزی لە پلەی دنیا نەبوو نەیکرد.

مامۆستا عێزەدینی برای گچکەی دەڵێ: {کــاکم نــەخۆش کــەت پــەکی کــەت، چارەمان نەما هانامان بردەبەر دەکتۆرێکی مەغریبــی، دەگەری ڕێککــەوتین تیمــاری بکــا، دوای چابوونەوە تەواوی پارەکە وەربگری، دکتۆرەکە مــاوەك تیمــاری کــرد، زۆر باشــتر بوو، خەریك بوو بە پێ بکەویتەوە، گازی کردم فەرمووی: پارەی دکتۆرەکە بــدە ڕەوانــی بکەوە، پێم گۆت: کاکە گیان چەند ڕۆژەك مــاوە بــا تــەواو چــاك ببــی، فــەرمووی: نــا، ئەوەندە بەسە ئەگەر تەواو چاك ببمەوە، دەبی تێکەڵی دنیا ببم، بچمە لای سوڵتان، ئەویش پێم دەڵێ وابکە، وابنووسە، وابڵێ، ئێستا بۆ من باشترە، لە ماڵی خۆم دانیشتوومە، پادشــا و گەدا دێنە لام، بۆ پرسیارانی ئایین و شەریعەت، ناچار پارەکەمان دا دکتۆرەکە، بە ڕێمان کرد}.

ناوبراو لەلایەن سەرۆکی (موصل) ســەیفەدین قایمــاز مــاوەك کــرا خەزنــەدار، دوایی کرا کارگێڕی وڵاتی (جزیرە)، دوایی کرا نووسەری دیوانی مەلیك، ساڵی ٥٨٩ك – ١١٩٣ز (عزالدین مەسعود) لەلای خۆی پلــەی پێــدا، دوای ئــەو لــەلای ئەرســەلانی کوڕی ماوە، ئەویش زۆر ڕێزی لێ دەنا.

دانراوەکانی:

١. النهاية في غريب الحديث.
٢. جامع الأصول في أحاديث الرسول.
٣. البديع في شرح الفصول.
٤. الباهر في الفروق.
٥. تهذيب فصول ابن الدهان.
٦. الانصاف في الجمع بين الكشف والكشاف.
٧. الشافي في شرح مسند الإمام الشافعي.
٨. البنين والبنات، والآباء والأمهات.
٩. المصطفى المختار، في الأدعية والأذكار.
١٠. شرح غريب الطوال.
١١. ديوان رسائل.
١٢. المختار في مناقب الأخيار.
١٣. صنعة الكتابة.

کۆچی دوایی: پێش کۆچی مێوانخانەکی بۆ هەژاران دروست کرد، لە گوندێك نزیك (موصل) ماڵی خۆی (وەقف) کرد، تاکو لەو خێراتە خەرج بکرێت، ساڵی ٦٠٦ك – ١٢٠٩ز لە (موصل) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. النهاية في غريب الحديث / پێشەکی ٩ – ١٨.
٢. وفيات الأعيان ٣/٢٨٩.
٣. طبقات المفسرين ٢/٣٠٢.
٤. البداية والنهاية ١٣/٥٥.
٥. أربيل في العهد الاتابكي ٩٨.

٦. کشف الظنون ٢/١٩٨٩.
٧. هدية العارفين ٢/٦ – ٣.
٨. مشاهير الكورد ١/٦٧.
٩. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٥٤ – ٤٥٦.
١٠. معجم المؤلفين ٨/١٧٤.
١١. إيضاح المكنون ٢/٤٦٨.
١٢. شذرات الذهب ٥/٢٢ – ٢٣.
١٣. منهل الأولياء ١/٢٠٠ – ٢٠١.
١٤. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٤٥٣.
١٥. سير أعلام النبلاء ١٢/٥٨٤ – ٥٨٥.
١٦. بغية الوعاة ٢/٢٧٤ – ٢٧٥.
١٧. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ١/١٣٠.
١٨. إنباه الرواة ٣/٢٥٧ – ٢٦٠.
١٩. الأعلام ٦/١٥٢.
٢٠. معجم أعلام الكورد ٥٧٤ – ٥٧٥.
٢١. الشافي في شرح مسند الإمام الشافعي / پێشەکی ١/٧ – ٢٤.
٢٢. شەرەفنامە / پەراوێز ١٩٤.

## مبارەك یەحیا شارەزوری (١٢٠٥)

ناوی موبارەکە کوڕی یەحیای کوڕی عبداللە ی کوڕی قاسمی شارەزوورییە، ناسراوە بە قازی (ظهیرالدین)، ساڵی ٥٢٥ك – ١١٣١ز لە جزیرەی بۆتان هاتەدنیا، پاشان چووە (موصل) لەوێ نیشتەجێ بوو، ساڵی ٥٨٧ك – ١١٩١ز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعية الكبرى ٤/١٨٧.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٥٠.

## مجالد یەزیدی حەڕانی (١٢٠٦)

ناوی موجالیدە کوڕی یەزیدە، خەڵکی (حەڕان)ە، فەرموودەناسەکی گەڕیدە بووە، فەرموودەی لە یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاری گێڕایەوە، ساڵی ١٩١ك – ٨٠٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: شذرات الذهب ١/٣٣٣.

## محرم محەممەد سیواسی (١٢٠٧)

ناوی موحەڕرەمە کوڕی محەممەدی کوڕی حەسەنە، نازناوی ئەبولبەرەکاتە، مەزهەبی حەنەفی بووە، تەریقەتی (خەلوەتی) بووە، ئامۆژگاری خەڵکانی کردووە، شەرحی کتێبی (جامی) کردووە، ناسراوە بە (محرم ئەفەندی) ساڵی ١٠٠٠ك – ١٥٩١ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. كشف الظنون ١/٤٠٠.
٢. هدية العارفين ٢/٥.
٣. إيضاح المكنون ٢/٣٨٩.
٤. معجم المؤلفين ٨/١٨٠.
٥. معجم أعلام الكورد ٥٧٧.

## محسن جەعفەر سەلماسی (١٢٠٨)

ناوی موحسینە، کوڕی جەعفەری کوڕی محەممەدی کوڕی جەعفەری کوڕی داودی کوڕی حەسەنە، نازناوی (ئەبو طاهیر)ە، خەڵکی (سەلماس)ە، لە (بەغدا) دانیشتووە، زانایەکی بڕواپێکراو بووە، لەلای ئەبو حامیدی ئەسفەرایینی خوێندووە، شەریعەتی لێ فێربووە، زاتەکی زیرەك و زەین تیژ بووە، دە ساڵان لە مامۆستا حەسەنی

برای گچکەترە، لە مانگی شەووالی ساڵی ٤٣٦ك – ١٠٤٥ز کۆچی دوایی کرد، ئەبو عبداللە ی برای نوێژی لەسەر کرد.

سەرچاوەکان:

١. اللباب ٣/٢٩٩.

٢. الأنساب ٢/١٢٧.

## محەممەد ئادەم بالەکی (١٢٠٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی مەلا ئادەمی کوڕی عبداللە ی کوڕی محەممەدی کوڕی یوسفی کوڕی عوسمانی کوڕی ئیلیاسی، کوڕی حوسێنە، عەشیرەتی (بالەك)ە، تیرەی (ئارونی)یە، ناسراوە بە: (ابن ئادەم)، ساڵی ١٧٥٠ز لە گوندی (ڕوستە) هاتووتە دنیا.

خوێندنی: لە خزمە ت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە لای مەلا محەممەد عبداللە بایەزیدی ماوەکی زۆر لە خزمەت ئەو مامۆستایە ماوە، هەروەها لەلایەن ئەو زانایانەی خوێندووە: مەلا ڕەسولی کورانی، مەلا عبداللە ی شێخانی، مەلا عبداللە ی گراوی، ساڵی ١٧٧٨ز چووە (مەهاباد) زمانی فارسی بە چاکی فێربوو، گەڕاوە کوردستانی عێراق، لە تەمەنی سی ساڵیدا زانستەکانی تەواوکرد، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، چەند حاشیەی لەسەر کتێبانی خوێندن دانا، ساڵی ١٧٨٠ز حاشیەی (لاری) نووسییەوە لەگەڵ چەند حاشییانی خۆی لەسەر ئەو کتێبە، ماوەك مەلا بوو لە (مەمیخەلان)، ساڵی ١٢١٢ك – ١٧٩٧ز حاشیەی عبدالکریم لە سەر (مطول)ی نووسییەوە، ساڵی ١٢١٦ك – ١٨٠٠ز باری کرد چووە گوندی (ناوبەرگە).

پلەی مەلایەتی: مامۆستا (ابن ادم) زانایەکی پایە بەرز بوو، لە هەموو زانستەکان دانراوی تایبەتی هەیە، مەلایە بژاردەکانی وەك مەلا ئەسعەد حەیدەری و مەلا یەحیای مزوری و مەلا عبدالرحمانی ڕۆژبیانی هەموو بۆیان سەلماندبوو کە دەستێکی باڵای هەیە لە زانیاری، لەبەر ئەو شۆرەتە مصطەفا بەگی کوڕی ئۆغر بەگی میری سۆران داوای

کرد، لە مزگەوتی گەورەی (ڕواندز) دایمەزراند بە پێش نوێژ و ووتارخوێن و مـودەرریس و موفتی، لەویٚ دەستی کرد بە دەرسدانەوە، ناوبانگی مەلا چاکی پتر بەلاوبۆوە.

چەند زانای مەزن لـە خزمەتی پێگەیشتن، لـەوانە: مەلاونا خالـیدی شارەزوری، مەلا محەممەدی خەتێ، مەلا عەلی وەسانی، مەلا عبداللەی گـەلالی، مـەلا ئەحمـەدی کـوڕی، لەگەڵ زۆرانی تر.

مامۆستا (ابن ادم) لـە (ڕواندز) ماوە، تا دوو ساڵ تێپەڕی لـە حوکمڕانی محەممەد پاشای گەورە، لەو کاتە ساڵی ١٨١٥ز دڵی لە پاشا ڕەنجا، ڕوانـدزی بـەجێ هێشـت، گەڕاوە گوندەکانی خۆیان لـە (بالەکایەتی)، لە کۆتایی ساڵی ١٨٢١ز یان سەرەتای ساڵی ١٨٢٢ز کۆچی دوایی کرد، لە گوندی (کەونەخان)ی نزیك (دێلزە) بە خـاك سـپێردرا، ئێستا گۆڕەکەی دیارە، زیارەت دەکریٚ.

دانراوەکانی: مامۆستا ابن ادم لـەوانەیـە صـەد دانـراوی خـۆی هـەبی، بـەلاّم بەشێکی کەمیان چاپ کراون، دەستنووسەکانیشی زۆربەیان نەماون، ئەوانـەی زانـدراون، تۆمارکراون، ئەمانەن:

١. شرح أثبات الواجب
٢. ميقات المعقول في المنطق.
٣. شرح زيج ئولوغ بيگ.
٤. تعليقات على چغميني.
٥. شرح خلاصة الحساب.
٦. التقويم
٧. تذكرة الأحباب في العمل بالاسطرلاب.
٨. مفتاح التنجيم في شرح التقويم.
٩. أسكال التاسيس.
١٠. حاشيه على شرح الروزنامه.

١١. تشريح السيارات.
١٢. مفتاح المغيب في العمل بالربع المجيب.
١٣. مرآت المعقول.
١٤. شرح الهداية.
١٥. تعليقات على السيوطى.
١٦. تعليقات على ديباجة شرح الأنموذج.
١٧. تعيلقات على عصام الدين.
١٨. تعليقات على شرح الـچاره پەردى
١٩. تعليقات على عبدالغفور.
٢٠. حاشية على ديباجة حدائق الدقائق.
٢١. مصباح الخافية شرح نظم الكافية، ساڵی ١٨١٦ز تەواوی کردووە.
٢٢. مرآة المأمول في المنطق.
٢٣. حاشية على السيلكوتى والسيد شريف.
٢٤. تعليقات على المطول.
٢٥. كتاب في الوضع والبيان والآداب.
٢٦. تهذيب الأصول الى مدارك العقول، ساڵی ١٢٠٦ك تەواوی کردووە لە ١٢١١ك شەرحی کردووە.
٢٧. تحرير البلاغة.
٢٨. سلسلة الذهب، لە ١٨١٨ز تەواوی کردووە.
٢٩. مشكاة المنقول في النحو والصرف والعروض والمنطق، ساڵی ١٧٩٠ز تەواوی کردووە.
٣٠. مجالس النواميس، في الموعظة، ساڵی ١٢٣١ك تەواوی کردووە.
٣١. زبدة الأسرار.

٣٢. شرح ذات الشفا، بە زمانی فارسی
٣٣. زایجەی صالحی، پێشکەشی کردووە، بە ئەمیر صالّح بەگ.
٣٤. أجوبة عن أسئلة فقهية.
٣٥. قصيدة الواسطية.
٣٦. شرح القصيدة الواسطية.
٣٧. رسالة الناسخ والمنسوخ.
٣٨. دیوانی شیعر، نازناوی (ناجم)ی بۆ خۆی داناوە.
٣٩. هۆنراوەی (قصص الأنبياء والصالحين وسير الرسول).
٤٠. شەرحی ئەو هۆنراوە، ساڵی ١٢٢٩ك تەواوی کردووە

جگە لەو کورتە حاشیيانەی لەسەر ئەو کتێبانەی خوارەوەی هەیە: عبداللە یەزدی، محمدامين جهة وحدة، جامی شرح الکافية، مصری علی شرح العزي، ابن قاسم علی المصری، عصام في الوضع، کمال شرح الشافية: مەلا ئەحمەدی کوڕی ساڵی ١٨١٣ز نووسیتیەوە.

کوڕەکانی: مامۆستا (ابن ئادم) جگە لە مەلا ئەحمەد دە کوڕی هەبوو، سەرەتای ناوی هەموویان بە وشەی (عبد) دەست پێدەکا: عبدالسلام، عبدالحکیم، عبدالغفور، عبدالقادر، عبدالواحد، عبدالکریم، عبدالخالق، عبدالعزیز، عبدالمناف، عبداللە.

سەرچاوەکان:

١. نظم الحجج لإخراج مهج المنهج/ پێشەکی.
٢. عنوان المجد.
٣. أربيل في مختلف العصور ١٠٧ – ١٣٠.
٤. علماء ومدارس في أربيل ١٠٢.
٥. بنەماڵەی بەناوبانگی ڕواندز ٤٧ – ٦٦.
٦. الشيخ معروف النودهي ١٠٣ – ١٠٥.

٧. بوژاندنەوە ١٢١/٢ – ١٢٦/٢١٨/٣ –٢٢٣ – ٢٤٦–٢٥٠ /٢٢٤/٦.
٨. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٠٧ – ٥٠٩.
٩. محمد بن عبدالله الجلي ٨٦.
١٠. دەنگی زانا، ژمارە ١٩٩٢، ٣٧ – ٤١.

## محەممەد ئیبراهیم ئامێدی (١٢١٠)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئەحمەدی کوڕی شەرەفەدینی ئامێدییە، زانایەکی ناسراوی سەردەمی خۆی بووە، کتێبی (عمدة العاملين لمرضاة رب العالمين)ی داناوە بە زمانی عەرەبی پێشکەشی بە عەلی پاشا کردووە، هەروەها (كواكب أنوار الأحمدية في أسرار المعجزات المحمدية)ی داناوە بە زمانی تورکی، پێشکەشی بە سولتان ئەحمەد خانی سێیەم کردووە.

سەرچاوەکان:

١. إيضاح المكنون ٣٩٠/٤.
٢. مشاهير الكورد ١٣٠/٢ – ١٣١.

## محەممەد ئیبراهیم ئامێدی (١٢١١)

ناوی محەممەدە کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عبدالرحمانی ئامێدییە، مەزهەبی حەنەفی بووە، ساڵی ١٠٧٥ك – ١٦٦٤ز لە (دیمشق) هاتە دنیا، چوار ساڵان بوو، باوکی کۆچی دوایی کرد، لە خزمەت مەلا عەلی موفتی برای پەروەردە بوو، پاشان چووە لای مەلا چاکەکانی ئەو سەردەمی خوێندنەکەی بردەسەر، ساڵی ١١٢١ك کرا موفتی (دیمشق)، دوایی کرا مودەرریس لە قوتابخانەی سولەیمانییە.

دانراوەکانی: (شرح دلائل الخيرات) و (شرح حزب البحر) و (شرح طيبة النشر) و (شرح الجزري) و (ديوان الخطبة) و (سلسلة الطريقة الشازلية).

خووڕەوشتی: زاتەکی بەڕێز بوو، سەرکردە و وەزیرەکان خاتریان دەگرت، خەڵکان خۆشیان دەویست، لەبەرژەوەندی گەل ئیشی دەکرد، باخەڵ فراوان بوو، چاو

بڵند بوو، لە مەتحی ئەو گۆتراوە: {يد العمـادي سمـاء ممطـر ويـد الــ(عباد) أرض تطلـب مطرا}

منیش دەڵێم بە کوردی:

دەستی ئامێدی هەوری پڕ باران دەستی تر ئەرزە پێویست بە باران

کۆچـی دوایـی: لـە ٨ی مـانگی ذی الحجـەی سـاڵی ١١٣١ك – ١٧١٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. سلك الدرر ٤/١٧ – ٢٣.
٢. الأعلام ٦/١٩٥.
٣. معجم المؤلفين ٨/٢٠٦.
٤. معجم أعلام الكورد ٥٩١.
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٠٩ – ٥١١.
٦. مشاهير الكورد ٣٥٣.

## محەممەد ئیبراهیم جزیری (١٢١٢)

ناوی محەممەدە کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئەبوبـەکری کـوڕی ئیبراهیمـی کـوڕی عبدالعزیزە، ناسراوە بـە (ابـن الجـزري)، سـاڵی ٦٥٨ك – ١٢٦٠ز هاتووتـە دنیـا، لـە (دیمشق) دانیشتووە، کتێبـی (تأريخ دمشق)ی داناوە، سـاڵی ٧٣٩ك – ١٣٣٨ز کۆچـی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية١٤/١٩٣.
٢. الدرر الكامنة ٣/٣٠١.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٧٥ – ٤٧٦.
٤. معجم المؤلفين ٨/١٩٤.

٥. شذرات الذهب ٦/١٢٤.
٦. مشاهير الكورد ٢/١٣٦.
٧. هدية العارفين ٦/١٥٠.
٨. إيضاح المكنون ١/٢١٢.
٩. الأعلام ٢/١١٢ /٦/٩٧ – ١٨٩.
١٠. معجم أعلام الكورد ٥٩٢ – ٥٩٣.

## محەممەد ئیبراهیم جزیری (١٢١٣)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی جزیریە، نازناوی (شەمسەدینە)، زانایەکی ڕوو لە خوا بووە، دەرسی لەلای مامۆستا (ابن الخباز) خوێندووە، لە ١٩ی مانگی شەووالی ساڵی ٨٠٣ك – ١٤٠١ز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:
١. شذرات الذهب ٧/٣٤.
٢. معجم أعلام الكورد ٥٩٣.

## محەممەد ئیبراهیم زڤنگی (١٢١٤)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئیبراهیمە خەڵکی گوندی (زڤنگە) ناوچەی (بۆتان)، ناحیەی (فندك) چیای (باڵۆ) نزیك (دیاربەکر)، لە (سعێرت) دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە گوندی (نورشین) نێوان (بەدلیس) و (مووش) لای سەیدا وەرقانسی و مەلا عبدالقهاری نەوەی مەلا خەلیلی سعێرتی، ماوەکیش چووە لای مەلا عبدالقادری ذولقەید، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

لە قوتابخانەی (ڕەحیمیە) و (سعێرت) کرا مودەرریس، دوایی کرا مەلای مزگەوتی (مەلیح)، پاشان چاوەکانی لە دیتن کەوتن، چووە گوندی (بنێرڤی) لەوێ ماوەی بیست و سێ ساڵان بە نابینایی دەرسی دەداوە، دوایی چووە گوندی (زڤنگی) ساڵی

١٣٣٢ك – ١٩١٣ز کۆچی دوای کرد، مەلا ئەحمەدی کوڕی موفتی قامیشـلی شـەرحی دیوانی شێخ ئەحمەدی جزیری کردووە بە عەرەبی.

سەرچاوە: العقد الجوهري شرح ديوان الشيخ الجزري/ پێشەکی – أ –.

## محەممەد ئیبراهیم ژەنگاری (١٢١٥)

نـاوی محەمـەدە، کـوڕی ئیبراهیمـی کـوڕی ئەبوبـەکری کـوڕی ئیبراهمـی ژەنگارییە، ناسراوە بە (شـازەلی)، لـە (ئەسـکەندەرییە) نیشـتەجێ بـووە، دەرسـی لـەلای حەسەنی کوردی و زەینەب خانی کچی شوکر و چەندانی تر خوێندووە پاشان دەرسی بـە مامۆستای فەرموودەناس حافیزی عێراقی داوە، لـە سـەرەتای سـاڵی ٧٥٩ك – ١٣٥٧ز کۆچی دوایی کردووە لە (ئەسکەندەرییە).

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٣/٣٠١.

## محەممەد ئیبراهیم ژەنگاری (١٢١٦)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ساعیدە، لە (ژەنگار) هاتوتە دنیا، لە (قاهیرە) نیشـتەجێ بـووە، زاتـەکی زۆرزان و زیـرەك و بـە توانـا بـووە لـە ژمێریـاری و حیکمەت و مێژوو و ئەدەب شارەزا بووە، لە تەفسیری قورئانی پیرۆز دانراوی هەیـە، لـە دکتۆری یەکەمی چەرخی خۆی بووە، ئەو دەرمانی بە نەخۆشانی دەدا سوود بەخش بوون، ئەگەر حکومەت دەرمانەکی بۆنەخۆشان کڕیبا، دەبووایە لە پێشدا مامۆستا ببیینـی و بڕیـار بدا، ئەگەر نا کڕین و فرۆتنی قەدەغە کرا بوو.

مامۆستا ژەنگاری زاتەکی پاك و خاوێن و بوو، زۆر لە ئەنـدامی خـۆی و لـە جل و بەرگی ئەسـپەکەی دەخـەفتی، سـاڵی ٧٤٩ك – ١٣٤٨ز بـە نەخۆشـی (طـاعون) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٧٣ – ٤٧٤.

٢. البدر الطالع ٢/٧٩ – ٨٠.

٣. معجم المؤلفين ٨/٢٠٠ – ٢٠١.
٤. هدية العارفين ٢/١٥٥.
٥. كشف الظنون ١/٦٦.
٦. الأعلام ٣/٢٠٧.
٧. الدرر الكامنة ٣/٢٧٩ – ٢٨٠.
٨. إيضاح المكنون ٢/٦٩٢.

## محەممەد ئیبراهیم سەربالا (١٢١٧)

ناوی محەممەدە کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەسەنە، ناسراوە بە (سەربالا) نزیك (حبتون)، یاقووت دەڵێ: {حبتون: چیایەکە لە دەوروبەری موصل} منیش دەڵێم: سەربالا: دوورنیە، سەرپاڵە بی، پاڵە: کەسێکە درونە دەکا، کشتوکاڵ بە داس دەدروی، وە سەرۆکەکەیان (سەرپالەیە).

ئیبن مستەفی دەڵێ: زانایەکی کوردی شەرع زان بووە، کتێبی (مختصر أصول الدين على مذهب أهل السنة)ی ساڵی ٤٧١ك – ١٠٧٨ز لەلای حەسەن محەممەدی ئورمەوی خوێندووە، خۆی نووسیویەتی ئەم کتێبەم پیت بە پیت لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەر هەمووم لەلای دانەرەکەی خوێند، مامۆستا عیسای کوڕی لەل ساڵی ٥١٠ك پشتگیری ئەو زانیارییەی سەرەوەی کردووە، وە لە دوای نووسراوەکە ئەو پشتگیرییەی نووسیوە.

سەرچاوەکان:

١. تأريخ أربيل ١/٢٧٥.
٢. معجم البلدان ٢/٢١١.
٣. معجم أعلام الكورد ٥٩٢.
٤. الإكليل في محاسن أربيل ٧٧.

## محەممەد ئیبراهیم سروجی (١٢١٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عبدالغنی، خەڵکی (سروجە) لە کوردستانی تورکیا، ساڵی ٦٣٧ك – ١٢٣٩ز هاتە دنیا، زانایەکی شافیعی مەزهەب بوو، ماوەك کرا قازی، چەند دانراوی خۆی هەنە، ساڵی ٧١٠ك – ١٣١٠ز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٢٣.

٢. معجم المؤلفين ٨/٢٠٧.

## محەممەد ئیبراهیم سعێرتی (١٢١٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عومەری سعێرتی یە، چوویتە (دیمشق) لەوێ کرایتە ووتارخوێن، دوایی چوویتە (میصر)، لەوێش ماوەك ووتارخوێن بووە، دوایی کرایتە جێگری قازی بەدرەدینی ژەنگاری، مامۆستا زاتەکی زیرەك و زمان ڕەوان و بیرتیژ و مێشك فراوان بووە، دیوانی ووتارخوێندن و دیوانی شیعری هەیە، ساڵی ٦٦٨ك – ١٢٦٩ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم المؤلفين ٨/٢١١.

## محەممەد ئیبراهیم شنۆیی (١٢٢٠)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حوسێنی کوڕی عەلی کوڕی حەسەنی شافیعی یە، خەڵکی (شنۆ)یە، زانایەکی شەرع زان بووە، هاتووتە هەولێر لە گوندێك لەوکاتە ناسرابوو بە (کویر) ووتاری داوە، لەوانەیە ناحیەی (گوێڕ) بی.

سەرچاوە: تأريخ أربيل ١/٧٠.

## محەممەد ئیبراهیم عەبدالانی (١٢٢١)

ناوی محەممەدە کوڕی مەلا ئیبراهیمی کوڕی قادری کوڕی عبدالله یە، نەتەوەی ڕەسولی زەکییە، ساڵی ١٩٠٩ز لە (کۆیە) هاتە دنیا، قورئانی پیرۆزی لە خزمەت باوکی خەتم کرد، پاشان باریان کرد بۆ (جلبەسەر)، ماوەك لەوێ خوێند، دوایی گەڕانەوە

(کۆیە)، چووە لای مەلا تەوفیقی ئیمام، دوایی چووە مزگەوتی منارە، لای مەلا عەلی باداوە، دوایی چووە مزگەوتی مەلا جامی، لای مەلا صادق مەلا ئەحمەد، دوایی چووە مزگەوتی بایز ئاغا لای مەلا ئەحمەد بەهائەدین، دوایی چووە مزگەوتی گەورە لای جەنابی مەلا محەممەدی جەلی، پاشان چووە (کەرکوك) لای مەلا عومەری ئۆمەرگومبەت، ماوە لە خزمەتی تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: گەڕاوە (کۆیە) بووە مەلا لە مزگەوتی (حەتك)، مامۆستا، جگە لە مەلایەتی شاعیریش بووە، بۆ نمونە بەبۆنەی (نەورۆز) دەڵێ:

ئەم چەژنە موبارەك بێ بۆ کوردی تەدارەك بێ
دڵیان لە تەکی یەك بێ بڕوا خەم و ئاڵۆزە

☆ ☆ ☆ ☆

گشتیان بە (دلاوەر) بن دڵخۆشی (سەماوەر) بن
نەك پێوە جەماوەر بن سەرقۆزی بن ئاڵۆزە

☆ ☆ ☆ ☆

(دلاوەر) نازناوی مامۆستایە، وە ساڵی ١٩٧٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## محەممەد ئیبراهیم گۆرانی (١٢٢٢)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەسەنی کوڕی شەهابەدینی شارەزوورییە، نازناوی (ئەبو طاهیرە)، ساڵی ١٠٨١ك – ١٦٧٠ز لە (مەدینە)ی پیرۆز هاتە دنیا، خوێندنی لە خزمەت باوکی مەلا عبدالرەسولی بەرزنجی بردەسەر، بەردەوام دەرسی دەداوە، سودی قوتابیانی زۆر بوو، لە (مەدینە)ی پیرۆز کرا موفتی شافیعییەکان، ساڵی ١١٤٥ك – ١٧٣٢ز کۆچی دوای کرد.

دانراوەکانی: چەند دانراوی خۆی هەنە، لەوانە: (منتخب کنز العمال) و (الرقائق) و (شرح شواهد الرضی).

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٠٣.
٢. معجم المؤلفين ٨/١٩٦.
٣. هدية العارفين ٢/٣٢١.
٤. معجم المؤلفين ٥/٣١ – ٣٢.
٥. الأعلام ٦/١٩٥.
٦. سلك الدرر ٤/٢٧.
٧. معجم أعلام الكورد ٥٩١.

### محەممەد ئیبراهیم کوردی (١٢٢٣)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عبدالله یە، ساڵی ٧٤٧ك – ١٣٤٦ز لە قودس هاتە دنیا، پاشان چووە (قاهیرە)، دوایی چووە (مەککە)ی پیرۆز، زاتەکی مەزهەب شافیعی بوو، بەردەوام خەریکی خواپەرستی بوو، شەوان نەدەنوست، جار وابوو چوار ڕۆژان بە یەك دەستنوێژ نوێژی دەکرد، سەفەری کرد بۆ (شام) و (یەمەن) و (عیراق)، ساڵی ٨١١ك – ١٤٠٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٦/٢٣١ – ٢٣٢.
٢. جامع كرامات الأولياء ١/٢٥٤ – ٢٥٥.
٣. شذرات الذهب ٧/٩٣.
٤. مشاهير الكورد ٣٦١.

### محەممەد ئیبراهیم وانی (١٢٢٤)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی محەممەدی کوڕی ئەحمەدە، خەڵکی (وان)ە لە کوردستانی تورکیا، لە ٢١ی جیمادی یەکەم، ساڵی ٦٨٤ك – ١٢٨٥ز لە (دیمشق) هاتە دنیا، زانایەکی فەرموودەناس بووە، سەفەری کردووە، بۆ (مەککە) و

(مەدینە) و (حەلەب)، سێ جاران چوویتە (میصر)، گەڕایتەوە بۆ (دیمشق)، ساڵی ٧٣٥ك لە مانگی مەولود ١٣٣٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدر الكامنة ٣/٢٩٣.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٧٤ – ٤٧٥.

٣. معجم المؤلفين ٨/٢١٤ – ٢١٥.

## محەممەد ئیبراهیم هەکاری (١٢٢٥)

ناوی محەممەدە کوڕی ئیبراهیمی کوڕی نەصری (هەکاری)یە، ساڵی ٦٨٥ك – ١٢٨٦ز هاتە دنیا، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (دیمشق) دابەزیوە، خەریکی خوێندنی فەرموودە بووە، کتێبی (التنبیە)ی هەموو لەبەر کردووە، شەرع زان و موفتی بوە، دەرسی داوە و ئیجازەی داوە، لە زانیاری ژمێریاری ئازا بووە، لە ٩ی مانگی ذی القعدەی ساڵی ٧٥٩ك – ١٣٥٨ز کۆچی دوای کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٣/٢٧٩.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٧٣.

## محەممەد ئیبراهیم هەولێری (١٢٢٦)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موسلیمی کوڕی سەلمانی هەولێرییە، ساڵی ٥٦٠ك – ١١٦٤ز لە (بەغدا) هاتە دنیا، لە (هەولێر) دەرسی داوە ساڵی ٦٢٩ك – ١٢٣١ز چووە (دیمشق)، گەڕاوە (هەولێر)، هەر لەوێ لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٦٣٣ك – ١٢٣٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/١٦١.

٢. سير أعلام النبلاء ١٣/٢١١.

٣. تأريخ أربيل ١/٢١٤ /٢/٣٦٦.

٤. أربيل في مختلف العصور ٧٥.

٥. معجم أعلام الكورد ٥٩٢.

## محەممەد ئەبوبەکر خاپوری (١٢٢٧)

ناوی محەممەدە کوڕی ئەبوبەکری کوڕی عەباسی کوڕی عەسکەری خاپوریـیـە، ساڵی ٦٩٣ك – ١٢٩٣ز هاتووتە دنیا، لە (میصـر)ی خوێنـدووە، زانایـەکی شـەرع زان بووە، لە (طەرابلس) دەرسی داوە، هەر لەوێ کرایتە قـازی ئیجـازەی فـەتوای بـە چـەند کەسان داوە، لە ١٧ی مانگی (محرم)ی ساڵی ٧٦٩ك – ١٣٦٧ لە (طەرابلس) کۆچـی دوایی کرد، کتێبـی (فوائد)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٢١٦.

٢. معجم المؤلفين ٩/١١٠.

٣. علماؤنا في خدمة العم والدين ٤٧٨.

## محەممەد ئەبوبەکر ژەنگاری (١٢٢٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئەبوبەکرە، نازناوی (محیەدین)ە، خەڵکی (ژەنگار)ە، لـە مزگەوتی خۆشەویست (درودی خـوای لـێ بـی) لـە (مەدینـە)ی پـیرۆز بانگـدەر بـووە، هەروەها دەرسی شەریعەتی مەزهەبی حەنەفی داوە، زاتەکی دەنگخۆش و بە دیـن و خوڵـق خۆش بووە، سەرکردەکان ڕێزیان گرتووە، لە ئیشی خەڵکان زۆر خۆی ماندوو کردووە، ساڵی ٧٥١ك – ١٣٥٠ز کۆچی دوای کردووە.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٧٩.

## محەممەد ئەبوبەکر سۆرانی (١٢٢٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئەبوبەکری کـوڕی مـەلا محەممـەدی کـوڕی سـولەیمانی حەنەفییە، ساڵی ١٠٨٤ك – ١٦٣٩ز کۆچی دوایی کردووە.

چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. (شرح الطريقة المحمدية)ی محەممەد پیر عەلی: سەرەتایەکەی بە (الحمدلله الذي جعلنا أمة خير أمم) دەست پێ دەکات، ساڵی ١٠٦٣ك تەواوی کردووە.

٢. شرح الكواكب الدرية: شەرحی قەسیدەی بوردییەیە، سەرەتایەکەی بە (الحمدلله الذي أوجد الموجودات...) دەست پێ دەکا، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٠٤٨ك – ١٦٣٩ز تەواوی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. لە (هدية العارفين) و (علماؤنا....) ناوی بە ئەبوبەکر محەممەد تۆمارکراوە.

٢. معجم المؤلفين ٩/١١٠

٣. كشف الظنون ٢/١٣٣٥

## محەممەد ئەبوبەکر شەقڵاوەیی (١٢٣٠)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئەبوبەکری شافیعی یە، خەڵکی شاری (شەقڵاوە)یە، زاتەکی بەرز و بە توانا بووە، لە زانینەکانی (ئەقلی) دەستی باڵا بووە، چوویتە دیمشق، لای شێخ عەلی داغستانی فەرموودەناس خوێندویەتی، کرایتە پێش نوێژ لە مزگەوتی (ئەمەوی)، لە قوتابخانەی سولەیمان پاشا دەرسی داوە، زاتەکی لە خواترس و خواپەرست بووە، دنیاداری نەکردووە، بە پێیان چوویتە حەج، لە ڕۆژی دووشەممەی مانگی مەولود، ساڵی ١١٨٩ك – ١٧٧٥ز کۆچی دوای کرد، لە گۆڕستانی (الصالحية) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٠٩.

٢. علماء ومدارس في أربيل ١١٠.

٣. سلك الدرر ٤/١٦.

٤. مشاهير الكورد ٢/١٢٩.

٥. الإكليل في محاسن أربيل ٢٦٤.

٦. معجم أعلام الكورد ٥٨٠ – ٥٩٤.

## محەممەد ئەبوبەکر ماردینی (١٢٣١)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئەبوبەکری کوڕی محەممەدی کوڕی عوسمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عومەری کوڕی سەلامەی (ماردینی)یە، ساڵی ٧٥٧ك – ١٣٥٦ز هاتە دنیا، دەستی کرد بە خوێندن، زانیاری لە چەند زانایان وەرگرت، کتێبەکی زۆری لەبەر کرد، دەستی کرد بە دەرسدانەوە، پاشان دڵی لە ئەبو طاهیری سەمەرقەندی ئێشا، باری کر بۆ (حەلەب)، ماوەك لەوێ ماوە، دوایی گەڕاوە (ماردین) دووبارە دەستی بە دەرسدانەوە کرد، مامۆستا زانایەکی زیرەك و بە توانا و شاعیر بوو، لە ڕێزمانی عەرەبی و مەعانی دەستی باڵا بوو، لە ٨٧٣ك – ١٤٦٨ز کۆچی دوای کرد.

سەرچاوە: الضوء اللامع ٧/١٧٢.

## محەممەد ئەبوبەکر مەرعەشی (١٢٣٢)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئەبوبەکرە، ناسراوە بە (سجاقلی)، حەنەفی بووە، لە زانستەکان شارەزا بووە، تەریقەتی لە شێخ عبدالغنی نابلسی وەرگرتووە، ساڵی ١١٥٠ك – ١٧٣٧ز کۆچی دوایی کردووە، ئەو کتێبانەی داناون: (غاية البرهان في بيان أعظم آية القرآن (في تفسير آية الكرسي))، (حاشية على شرح العقائد لسعدالدين التفتازاني)، (ترتيب العلوم، تسهيل الفرائض)، (تهذيب القراءة).

سەرچاوەکان:

١. هدية العارفين ٢/٣٢٢.

٢. معجم المؤلفين ٩/١١٨ – ١١٩.

## محەممەد ئەبولقاسم حەڕانی (١٢٣٣)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئەبولقاسمی حەڕانی یە، لە (میصر) هاتە دنیا، مێژوونووس و شاعیر بوە، کتێبی (التأريخ)ی داناوە، ساڵی ٤٢٠ك – ١٠٢٩ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم المؤلفين ١/١٣٨.

**محەممەد ئەحمەد (ابن الظهير) (١٢٣٤)**

ناوی محەممەدە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عومەری کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئەبو شاکرە، نازناوی (مەجدەدینە)، ساڵی ٦٠٢ک – ١٢٠٥ز لە (هەولێر) هاتووتەدنیا، بۆ خوێندن چوویتە (بەغدا)، دوایی چوویتە (دیمشق)، لای مامۆستا (سەخاوی) و لای حەنەفیەکانی خوێندووە، لە قوتابخانەی (قیمازیة) دەرسی داوە، لە ئەدەبیات دەستی باڵا بووە، دیوانی شیعری هەیە، بە دوو بەرگ، ساڵی ٦٧٧ک – ١٢٧٨و لە دیمشق کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. فوات الوفيات ٣/٣٠١.
٢. الأعلام ٦/٢١٨.
٣. معجم أعلام الكورد ٥٩٦.
٤. أربيل في مختلف العصور ٩٣.
٥. أربيل في العهد الاتابكي ٢٥.
٦. هدية العارفين ٦/١٣٣.
٧. مشاهير الكورد ٢/١٢٤ – ١٢٥.
٨. معجم المؤلفين ٨/٣٠٢.
٩. البداية والنهاية ١٣/٢٨٧.
١٠. شذرات الذهب ٥/٣٥٩.
١١. كشف الظنون ١/٧٦٧.

**محەممەد ئەحمەد ئەخلاطی (١٢٣٥)**

ناوی محەممەدە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عوسمانی کوڕی سیاوشە، خەڵکی (ئەخلاط)ە، ساڵی ٦٤٤ک – ١٢٤٦ز هاتە دنیا، زانایەکی بە دین و دیمەن ڕێك و چاك

بووە، ماوەی چل ساڵان لە (کولاسە) پێش نوێـژ بـوو، دوایـی کـرا ووتـارخوێن لـە ٨ی مانگی شەووالی ساڵی ٧٠٦ك – ١٣٠٧ز کۆچی دوای کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٤/٤٧.

٢. شذرات الذهب ٦/١٤.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٧٧ – ٤٧٨.

## محەممەد ئەحمەد بەرزنجی (١٢٣٦)

ناوی محەممەدە، کـوڕی ئەحمـەدی بەرزنجییـە، زانایـەکی بـەناوبانگ بـووە، لـە تەفسیر و فەرموودە و فەتوا دەستی باڵا بووە، لە (مەککە)ی پیرۆز ووتـارخوێن بـووە، لـە (مەدینە)ی پیرۆز موفتی شافیعی یەکان بووە، لە جەنگی جیهـانی یەکـەم چـووە (دیمشـق)، ماوە لەوێ تا سـاڵی ١٣٣٥ك – ١٩١٦ز کۆچـی دوایـی کـرد، لـە گۆڕسـتانی چـیای قاسیون بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: نثر الجوهر والدرر ٢/١٠٢٧.

## محەممەد ئەحمەد حەڕانی (١٢٣٧)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عبداللە ی کوڕی ئەبو فـەرەجی کـوڕی عەلی کوڕی سەرایای کوڕی وەلیدی حەڕانی یە، مەزهەبی حەنەفی بووە، ساڵی ٦٩٠ك – ١٢٩١ز هاتە دنیا، شەرحی (مختصر الخرقي) کردووە، کتێبـی (الفنون)ی دانـاوە، سـاڵی ٧٤٩ك – ١٣٤٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات ٦/١٥٧.

٢. هدية العارفين ٦/١٥٦.

٣. معجم أعلام الكورد ٥٩٦.

٤. معجم المؤلفين ٨/٢٨٢.

٥. الذيل على طبقات الحنابلة ٢ ٤٤٢/٤.

## محەممەد ئەحمەد حەڕانی (١٢٣٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەلی کوڕی بیشرە، خەڵکی (حەڕان)ە، لە (حەلەب) دانیشتووە، لەلای چەند زانایانی خوێندووە، دەرسی فەرموودەی داوە، لە ٧٠٦ك – ١٣٠٦ز هاتە دنیا، لە (٧٧١ك یا ٧٧٢ك) – (١٣٦٩ز یا ١٣٧٠ز) کۆچی دوای کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٣/٣٣٩.

## محەممەد ئەحمەد حصکەفی (١٢٣٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدە، نازناوی شەمسەدینی ئیبن مەلایە خەڵکی (حصن كيفا)یە، لە (حەلەب) دانیشتووە، مێژووناس و شاعیر بووە کتێبانی (نهاية الأرب في ذكر ولاية حلب) و (رسالة في إسلام أبوى رسول الله صلى الله عليه وسلم)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٩/١٥.

٢. هدية العارفين ٢/٢٦٥.

## محەممەد ئەحمەد خاکی (١٢٤٠)

ناوی محەممەدە کوڕی ئەحمەدە، ناسناوی (خاکی)یە، سالی ١٢٥٥ك – ١٨٣٩ز لە گوندی (ئەحمەد برِندە)ی سەر بە (هەڵەبجە) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (سلێمانی) لای مەلا محەممەدی (مەحوی)، پاشان چووە (سنە) لەوێ کۆتایی بە قۆناغەکانی خوێندن هینا، گەڕاوە (سلێمانی) لەبەر ئەرکی ژیانی و هەڵنەسوڕانی گوزەرانی ماوەك بووە فەرمانبەری کشتوکال لە (سەرچنار)، (خاکی) خۆشنووس بوو، ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی بۆ برادەرانی دەنووسیەوە ئەوانیش دەجامیان دەگرت و بە ماڵیان وەدەکرد، بۆ پاراستنی (چاوزار).

خاکی مزگەوتی تایبەتی خۆی هەبوو، کاروباری مەلایەتی لێ ئەنجام دەدا، چەند فەقێیان هاتووچۆی ماڵیان دەکرد، بۆ خوێندنی عەرەبی و فارسی، لەوانە: مـەلا مـەحمودی (بێخود)، شێخ سەلام، مەلا محیەدین، خواجە ئەفەندی مەلا حەمە سەعیدی دیلـژەیی، مـەلا خالیدی (مەحوی)، مەلا عارف مستۆ.

(خـاکی) زاتـەکی خـاوەن هەسـت و بـیر بـوو، شـاعیرەکی چـاك بـوو، سوارسوارانێی لەگەڵ شاعیرە چـاکەکانی وەك (مـەحوی) کـردووە، شـیعری کـوردی و فارسی هەیە، قەسیدەکی کوردی بە خۆشەویست (درودی خوای لێ بـی) دا هەڵگوتییـە، لە پلەی بەرزی ڕەوانبێژی دایە، کێشی خۆش و سوار، و مانا و ناوەرۆکی بـەتام و بۆیـە، چاوی لە قەسیدەی (بەحری نوری) مەحوی کردووە، سەرەتایەکەی دەڵێ:

بارێنی خـودا بـارانی هـەرچی فـەیز و ئـیحسانە

لەسەر ئەو باعسی خەلق و گوزیدەی جەمعی ئەکوانە

دەمی صوبحی ئەزەل داکا، هەتا شامی ئەبەد بڕژێ

بە یەك تاوێ نەکو تاوتاو وەکو تاوی بەهارانە

بەسۆزەی نەونەسیمی گوڵ، شەمیعی لوتفەوە داکا

نەسیمی نیسبەتی حەق، دانەیکی کا بە صەد دانە

لە لالەی ڕووی خۆی و سەبزەی سەحابەی ژالە سابڕژێ

هەزاری وەك من و تۆ، بێن هوزاری ئەو گوڵستانە

مانای ووشەکان: (گوزیدە): هەڵبژرادە، (ئـەکوان): بونـەوەر، (ئـەزەل): بـێ سەرەتا، (ئەبەد): بێ کۆتا، (سۆزە): کزە با، (نەسیم): بای نەرم، (نـەو نەسـیم): نەسـیمی نوێ، (گول شەمیم): بۆنی گول، (لالـە): گوڵەسۆرە، (ژالـە): شـەونم، (سـا): وەك دانـەی شەونم. ئەم قەصیدەیە ساڵی ١٩٧٨ز لە چاپخانەی کـۆڕی زانیـاری کـورد، بـە شـەرحی شێخ محەممەدی (خاڵ) لە (بەغدا) چاپ کرا.

شێخ محەممەدی خاڵ دەڵێ: {مەلای حەمە سووری خانەقا، بەبۆنـەی نەخۆشـی چووە سەردانی خاکی، خاکی مژدەی پێدا کە دوێنێ شەو لـە خەودا بە خزمەت حـەزرەتی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) گەیشتم، فەرمووی: خاکی قەسیدەکەتم پێ گەیشت، پاش ئەو خەونە (خاکی) یەك ڕۆژ ژیا کۆچی دوای کرد، ساڵی ١٣٢٦ك – ١٩٠٨ز

ڕووداوێك: جارەك (خاکی) لەگەڵ فەقێیان، گەمەی (یەکبازی) دەکا، بـەجێ دەمێنێ، لەناو ئەوانیش واباوە: ئەوەی بەجێما، دەب پشت دابنێ، تا هەموو لەسـەر پشـتی بازبدەن، بەو گەمە دەڵێن (سینگەباز)، لەوبارەیە سەید ئەحمەدی نەقیبـی کـەرکوك (خ) بـە شیعر سەرکۆنەی دەکا، دەڵێ:

لـە مەیدانی عیبادەتدا بە جێما هەر کەسێ بێ شەك

بە دایم چاو بەرەژێرە، دەبی مەهتوك و ڕیسوابێ

(خاکی) نامەکەی بە دەست دەگا و بەم شیعرە وەڵامی دەداتەوە:

ئەگەر دەروێش، ئەگەر سۆفی لـە تەکیە و خانەقادا بێ

گەدا بێ یاخۆ پاشابێ، خەلـیفە، یاخۆ، وەستابێ

لـە عەرصەی کەوشەکا جێما، وەکو دابە دەبی، دابێ

دەبێ سەر حیز و مل کز بێ، دەبێ داماو و ڕیسوابێ

قوبول نابێ، بە هیچ بابێ، کە کوڕ دابێ، لـە جێ، بابێ

ئەگەر سوختە، مەلای جێ هێشت، مەلا مل کەچ، نەبێ نابێ

{لـە مەیدانی عیبادەتدا بە جێما هەر کەسێ بێ شەك

بە دایم چاو بەرەژێرە، دەبی مەهتوك و ڕیسوابێ}

سەرچاوەکان:

١. مێژووی ئەدەبی کوردی ٤/٥٩٩ – ٦٠١.

٢. مەلا محەممەدی خاکی ٩ – ١٥.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٢٨ – ٥٢٩.
٤. تأريخ السليمانية ٢٨١ – ٢٨٢.

## محەممەد ئەحمەد خەتی (١٢٤١)

ناوو نژادی: تا ئێستا نەمدیتووە نووسەران زنجیرەی باب و باپیرانی مامۆستای خەتی یان بە پوختەیی نووسیبی، بەڵام من لە ڕێگای کەس و کارەکانی کە لە گەڕەکی مەلایان لە (هەولێر) دادەنیشتن بەم شێوەیە بۆم ساغ بۆوە: ناوی مەلا محەممەدە کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی شێخ سولەیمانە، ساڵی ١٧٨٥ز لە گوندی (خەتە) هاتە دنیا، ئەو بەرەبابە ناودەبردرێن بە: (شێخ سولەیمانی) لەبەر شێخ سولەیمانی باپیرە گەورەیان، کە لە (خەتە) بووە، لەوێ کۆچی دوای کردووە، ئێستا گۆڕستانەکە بەناوی ئەو دەناسرێ.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن، لە چەند مەدرەسانی خوێند، لە قۆناغی موستەعیدی چووە لای چەند زانای پایەبەرزی ئەو سەردەمی، لەوانە: مامۆستا محەممەد (ابن ئادم) بالەکی، مامۆستا ئەبوبەکری میرڕۆستەمەی، مامۆستا عبدالرحیمی زیارەتی، لە قۆناغی کۆتایی چووە لای مەلا عبدالرحمانی ڕۆژبیانی ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

پلەی مەلایەتی: زانایەکی بەرز و بە توانا بووە، پسپۆڕی هەموو جۆرە زانستەکان بووە، ساڵی ١٨١٥ز محەممەد پاشای ڕواندز کردییە موفتی گشتی هەموو ناوچەی سۆران، زانایان بۆیان سەلماندووە کە مامۆستای هەموویانە، شێخ مصطەفای نەقشبەندی (خ) لە زنجیرەی ئیجازەنامەی مەلایان بە ئەوپەڕی ڕێزەوە ناوی دینی، شێخ ئیبراهیم فەصیح لە کتێبی (عنوان المجد) دەڵێ: {مەلای خەتێ مامۆستای زانایان بووە، دەستی باڵا بووە لە وردەکاری زانستی}، وە مامۆستا مەسعود محەممەد لە (تثنية الحج الى أعتاب العلامة الختي) دەڵێ: {زانیاری مەلای خەتێ هێندە قورسە و بە سەنگە، بە هیچ تەرازووەك نایێتە کێشان}.

بە شێك لـە فەقێیەکانی: مەلا ئەحمەدی گەلالی بالـەکی، مەلا حوسـێنی پشـدەری، مەلا ئەحمەدی رمکی بلباس، مەلا محەممەدی هەرشەمی، مەلا ئەحمەدی نۆدشەی، مەلا عبداللە ی جەلی، مەلا عومەر ئەفەندی خەیلانی، مەلا ئەسعەدی جەلی، حاجی قادری کۆیی.

سەفەرەکانی: لـەسەر فەرمانی محەممەد پاشای ڕواندز، چووە (بەغـدا) بـۆ لای داود پاشا، ئەویش زۆر ڕێزی پیـاوانی ئـاینی دەگـرت، بەتایبـەت زانایـەکانی کـورد، بۆیـە زۆر حورمەتی مامۆستای گرت، دوورنییە هۆی ئەو سەفەرە پێکهاتنەکی نهێنی بێ، بۆ مەبەسـتی جیابوونەوەی (سۆران) لـە حکومەتی عوسمانی لەوانەیە حکومەتی عوسمانیش ئـەو هەسـتەی کردبێ، بۆیە داود پاشای وەلانا و دووری خستەوە بۆ حیجاز، عەلی ڕەزای لـە جـێ دانـا، کە دژی محەممەد پاشا بوو، هەر ئەوەش بوو پاشان پیلانی گێڕا، عوسمانییـەکانی تیختیخـە دا بۆ لـەناوبردنی پاشای (ڕواندز).

مامۆسـتای خـەتێ هاوینـان دەچـووە (شـەقلاوە) لــە قوتابخانەکـەی تایبـەتی هاوینەهەواری دەرسی دەدا، مامۆستای خەتێ دوای کۆچی دوایی پاشـای ڕوانـدز مـاوەك گەڕاوە (خەتە) پاشان خەلکی ڕواندز چوونە دووی گەڕاندییانەوە (ڕواندز).

محابن حوسێن حوزنی موکریانی هەلەیەکی مێژوویی زۆر گەورەی کرد کە بوختانی بەو زاتە کرد، گوایە: مەلای خەتێ فتوای داوە: هەرکەس جەنگی عوسمانیان بکـا، تـەلاقی دەکەوێ و خوێنی حەلالـە، وە لـەوەی پێشـەوە رامانبـارد دیـارە کـە: لـەناو چـوونی ئـەو ئەمارەتە کوردیە پیلانێکی دارێژراو بوو لـە لایەن گەورەترین دەسەلاتی ئەو سـەردەمی، وە پەیوەنـدی نێـوان پاشـای روانـدز و داود پاشـا بتـوون بـوو، وە مامۆسـتا بـەو پەیوەندیـە هەلدەستا، بۆیە عوسمانیەکان داود پاشایان لابرد لـە والیاتی (بەغدا)، بە پێچەوانەی ئـەوەی ناحەزان دەیلێن کە: داود پاشا ئەو پیلانەی چنی بێ، وە هاتنەوەی مـەلای خـەتێ دووبـارە بۆ رواندز پاش رمانی ئەو ئەمارەتە وە لـە سەر داوای خەلکی ئـەوێ، و شـەڕکردنی پاشـا زیاتر لـە دە سالێ لـە گەلێ هۆزەکانی دەوروبەری و هەرێمەکانی ژێر دەستەلاتی عەسمانیەکان و داگیرکردنیان بە ئاگاداری مامۆستای خەتێ، ئەمانە و دەیان بەلگەی دی کە لـە کتێبـی

(محمد پاشا الرواندزی) باسم کردیە، بەڵگەی ئاشکران لەسەر ناراستی ئەو هەڵبەسراوەیە، وە مەبەستیش تەنها ناشرین کردنی ئەو پێشەوایە بەرزەیە لە پێش چاوی نەوەی نویێ.

کۆچی دوایی: مامۆستای خەتێ بەردەوام بوو لەسەر دەرسدانەوەی فەقێیان و جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی و وەڵامدانەوەی پرسیارانی مەلایان و هاوڵاتیان، لابردنی ئاژاوەی ناویان، ئاشتکردنەوەی موسوڵمانان، تا ڕۆژی شەمەی پاش نیوەڕۆی مانگی ذی الحجە، ساڵی ١٢٧٦ك – ١٨٦٠ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (گەردەگەرد) بە خاك سپێردرا.

دانراوەکانی: حاشیە لەسەر تەفسیری بەیزاوی، حاشیە لەسەر (جمع الجوامع)، حاشیە لەسەر (تحفە المحتاج)، رسالة العلم: ساڵی ١٨٠٩ز تەواوی کردوە، پێشکەشی بە داود پاشای والی (بەغدا) کردووە، ساڵی ٢٠٠٦ز بە لێکۆڵینەوەی نووسەری ئەو مێژووە لە (هەولێر) چاپ کرا. وە زۆر کتێبانی تر کە دیار نینە، لەوانەیە سووتابن لەگەڵ کتێبەکانی مامۆستا عبدالکریمی خەیلانی، ساڵی ١٩٥٧ز لە ڕواندز.

کوڕەکانی:

١. مەلا عبدالله: زانایەکی بەرز بوو، لە خزمەت باوکی خوێند.

٢. عبدالحکیم: ئەویش سێ کوڕی هەبوون:

أ. ئەحمەد.

ب. خورشید بەگ: لە دادگای (کەرکوك) فەرمانبەر بوو.

ت. مەلا طاهیر: لە (ڕواندز) دادەنیشت، ئەویش کوڕێکی هەبوو ناو (حەکیم) زابتی عەسکەر بوو.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١١٨ – ١٤٣ – ١٤٤.

٢. تثنیة الحج الی أعتاب العلامة الختی ١٤٧.

٣. محمد پاشا الرواندزی ١١١.

٤. رسالە العلم / پێشەکی ٢/ح.
٥. أربيل في مختلف العصور ١٣٤.
٦. علماء ومدارس في أربيل ١١٣ – ١١٦.
٧. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/١٨٠ – ١٨١ /٣/٣٢١ – ٣٢٥.
٨. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥١٢ – ٥١٣.
٩. بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز ١٦ – ٣٠.

## محەممەد ئەحمەد سعێرتی (١٢٤٢)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عبدالمؤمني (سـعێرتی)یە، سـاڵی ٦٨٥ك – ١٢٨٦ز لە (دیمشق) لە دایك بووە چوویتە (قاهیرە)، لـە تەفسیر و فەرموودە و شەریعەت و نەحو شارەزا بووە، سۆفی و دڵپاك و دەرون ڕۆناك بووە، شاعیر بووە.

دانراوەکانی: چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. إزالة الشبهات عن الآيات والأحاديث المتشابهات.
٢. شرح ألفية ابن مالك.
٣. كتاب في علوم الحديث.
٤. مختصر الروضة.

کۆچی دوایی: لە مانگی شەووالی ساڵی ٧٤٩ك – ١٣٤٨ز رکۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٧٦ – ٤٧٧.
٢. طبقات المفسرين ٢/٧٦ – ٧٧.
٣. هدية العارفين ٢/١٥٥.
٤. معجم المؤلفين ٨/٢٨٦ – ٢٨٧.
٥. شذرات الذهب ٦/١٦٧ /١٦٤.
٦. الدرر الكامنة ٣/٣٣٠ – ٣٣١.

٧. کشف الظنون ١/٧٢ /٢/١٣٩٧.

## محەممەد ئەحمەد قەزاز (١٢٤٣)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی محەممەدە، ساڵی ٦١٨ك – ١٢٢١ز لە (حەڕان) هاتەدنیا، بۆ خوێندن چووە (میصر) و (حەلەب)، بووە زانایەکی مەزن، دەرسی دەدا، بەڵام خەڵکان لە چیرۆکەکانی ڕازی نەبوون، ساڵی ٧٠٦ك – ١٣٠٦ز لە (مەککە)ی پیرۆز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. درة الحجال في أسماء الرجال ٢/٢٦٢.

٢. الدرر الكامنة ٣/٣٥٤.

## محەممەد ئەحمەد (ناری) (١٢٤٤)

ناوی محەممەدە، کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا عبدالرحمانە، ناسراوە بە (کاکە حەمە)، ساڵی ١٢٩١ك – ١٨٧٤ز لە گوندی (کێکن) قەزای (مەریوان) هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، قۆناغی سوختەیی لە (سنە) بردەسەر، لە قۆناغی موستەعیدی چووە لای مەلا عبدالرحمانی پێنجوێنی، دوای چووە مزگەوتی باباعەلی لە (سلێمانی)، گەڕاوە (سنە) ماوەك لە مزگەوتی (شەریعەتمەدار)بوو، دوای چووە (دار الإحسان)، پاشان چووە (بانە)لای مەلا عبدالرحمان قازی، دوایی چووە (مەهاباد) قوتابخانەی مەلا محەممەدی قوڵجی، ئەمجا چووە (باشقالان) لە تورکیا، هاتە (هەولێر) چووە (ڕواندز) لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی، ماوە تا ساڵی ١٣١٥ك – ١٨٩٧ز ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (ئێران) لە گوندەکەی خۆیان بووە مەلا، ساڵی ١٣٢٢ك – ١٩٠٤ز باری کرد چووە (بێلۆ)، هەر لەوێ ساڵی ١٣٦٦ك – ١٩٤٦ز کۆچی کرد.

ناوبراو شاعیرەکی چاك بووە، نازناوی شیعری (ناری)یە، شیعری کوردی و فارسی هەیە، هۆنراوەکی کوردی مەتەڵی هەیە، جوانکارییەکی سەیری تێدایە پیتی دوا

وشەی یەکەم، دەبێتە سەرەتای وشەی دووەم، هەروەها تا دوایی، ئەم وردەکاریە ناوی سوغرە و بێگارە، واتە: زۆری لە پیتەکە دەکەی جارەك بۆ ئەو، جارەك بۆ ئەم، ئەوە شتێکی سەیرە، لە (مطول) و (مختصر)ی بەلاغەش وێنەمان نەدیتووە.

نووسینی مەتەڵی: بە دەستنووسی کەون:

پادشا هردیار هبرا هدا اشر فخر سالتا جیش هرها

لجهء قبا لامعالیا علا نشا ناظر وشنها دوالیا نجمکان

صفدر زمعار فار سروروش کاشف نتایجا معنوان

وارثو بلا غتا جدا راستان

نووسینە حەلکراوەیەکەی، بەم جۆرەیە:

(پاشداه هردیار رهبر راه هدا اشرف فخر رسالت تاج جیش شهرها

لجهء اقبال لامع عالیا أعلا نشان ناظرورشن نها دو والیا أنجم مکان

صفدر رزم معارف فارس سرور روشن کاشف فن نتایج جامع عنوان

وارث ثوب بلاغت تاجدار راستان

سەرچاوەکان:


١. دیوانی ناری ٢٥ – ٢٦ – ١٦٩.

٢. گوڵزاری کوردستان ١٨٩.

٣. معجم أعلام الکورد ٥٥٨.

٤. مێژووی ئەدەبی کوردی ٥/٢٠١ – ٢٢٥.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٤٤٥ – ٤٤٦.


## محەممەد ئەحمەد نەصیبی (١٢٤٥)

ناوی محەممەدە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالقاهیرە، خەڵکی (نوسەیبینە)، لە قوتابخانەی (عصرونیە) دەرسی داوە، ماوەك نووسەری حکومەت بووە، ساڵی ٧١٥ك – ١٣١٥ز لە تەمەنی حەفتا و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٦/٣٨.

### محەممەد ئەحمەد نەقشبەندی (١٢٤٦)

ناوی محەممەدە کوڕی ئەحمەدە، دەوری ساڵی ١٨٨٠ز لە گوندی (شێرکاوە) هاتە دنیا، خەلیفەی شێخ عەلائەدینی (بیارە) بووە، ناسراوە بە (شێخ حاجی نەقشبەندی)، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوای چووە (گەلالە) لای مەلا عبدالقادری گەورە، مەنتیق و ئادابی خوێند، دوایی چووە (بێتواتە) لای مەلا نەبی حەیدەری، دوایی چووە (کۆیە) لای جەنابی مەلا عبداللە ی جەلی، لەو کاتە چواردە مەدرەسەی فەقێیان لەوێ هەبوو، پاشان چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادر، ماوە تا ئیجازەی وەرگرت.

گەڕاوەو لای باوکی لە (ڕێزانۆك)، پاشان بووە مەلای (دەرگەلە)، دوایی چووە (کێلەکان)، دوایی چووە (شێرکاوە)، ساڵی ١٩٤٠ز گوندی (دێگێ)ی دروست کرد، ساڵی ١٩٦٨ز کۆچی دوایی کرد، لەسەر گردەکی بلند، ڕۆژئاوای (دێگە) لەسەر وەسیەتی خۆی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

### محەممەد ئەحمەد هەولێری (١٢٤٧)

ناوی محەممەدە کوڕی ئەحمەدی کوڕی عومەری کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئەبو شاکری کوڕی ظاهیرە، لە دووی مانگی سەفەری ساڵی ٦٠٢ك – ١٢٠٥ز لە (هەولێر) هاتەدنیا، یەك بووە لە زانایەکانی مەزهەبی حەنەفی، بۆ خوێندن چوویتە (بەغدا) لەوێوە چوویتە (دیمشق) لە قوتابخانەی (قەیمازیە) کرایتە (مدرس)، دیوانی شیعری هەیە، ساڵی ٦٧٧ك – ١٢٧٨ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الأعلام ١/٢٧٥.

٢. معجم المؤلفين ٨/٣٠٢.

٣. هدية العارفين ٦/١٣٣.

٤. مشاهیر الکورد ٢/١٦٥.
٥. شذرات الذهب ٥/٣٥٩.
٦. البداية والنهاية ١٣/٢٨٧.
٧. فوات الوفيات ٣/٣٠١ – ٣١٠.
٨. كشف الظنون ١/٧٦٧.

## محەممەد ئیدریس بەدلیسی (١٢٤٨)

ناوی محەممەدە نازناوی (ئەبولفەضل)ە، کوڕی مەولانا ئیدریسی بەدلیسی یە، لە (مەغنیسا) دەرسی داوە، پاشان کرایتە قازی (طەرابلس)، دوایی لە (ئەستانە) کرایتە (دەفتەردار)، زانکۆ و قوتابخانەی بە ناوی خۆی دروست کردووە، دیوانی شیعری عەرەبی و فارسی و تورکی هەیە، نازناوی (فەضلی) بۆ خۆی داناوە، تەرجوومەی تەفسیری حوسێن واعیز و زەخیرەی خوارەم شای کردووە (قصص الانبیاء) و (تأریخ عثماني) و (ذیل تأریخ إدریس بدلیسي) هەیە، ساڵی ٩٨٢ك – ١٥٧٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. إيضاح المكنون ٢/٢٢٨.
٢. معجم أعلام الكورد ٣٨.
٣. مشاهير الكورد ٨٧.
٤. معجم المؤلفين ٩/٣٢.

## محەممەد ئەسعەد خەیلانی (١٢٤٩)

ناوی محەممەد ئەسعەدە، کوڕی مەلا عومەر ئەفەندی خەیلانی یە، ساڵی ١٨٦٢ز پاش خوێندنی قورئانی پیرۆز و چەند کتێبی سەرەتایی، چووە ناو فەقێیان لەگەڵ عبدالقادر شێخ عبدالله شەمزینی، (تەصریفی) لەلای مەلا عبدالرحمانی (بەرەکە)ی خوێند، فارسی لەلای شێخ ئەمینی شێخ سەعدی خوێند، ماوەك چووە (ئاكۆیان)، ماوەکیش لە (وەسان) لای مەلا عەباسی خوێند، پاشان چووە (هەولێر) لای مەلا عومەر ئەفەندی لە

مزگەوتی (قەڵات)، پاشان گەڕاوە (ڕواندز) خوێندنەکەی مایبوو تەواوی کرد، ساڵی ١٨٨٥ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

هەروەها ئیجازەی لەو زاتانەش وەرگرت: مەلا عومەر ئەفەندی (هەولێر)، غیاسەدین شێخ ئەبوبەکری (هەرشەمی)، جەنابی کاك ئەحمەدی شێخ لە (سلێمانی).

مەلایەتی: ساڵی ١٨٨٦ز لە مزگەوتی گەورەی (رواندز) لە جێگای باوکی کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن و دەرس بێژ، ساڵی ١٩١٢ز کە (ڕوسیا) ڕواندزی داگیر کرد و ئاگری تێبەردا مامۆستا ئاوارە بوو، چووە دەشتی (هەریر)، ماوەك چووە (خرواتان)، ساڵی ١٩٢٠ز چووە ناوچەی (باڵەکان).

مەدرەسەی لەو شوێنانە دانا: (وەردە)، (ناوەندە)، (دار السلام)، (ئاکۆیان)، (دەرگەلە)، وە ساڵی ١٩٢٦ز لەناو عەشیرەتی (شیوەزووری) دەرسی دەدا، تا ئەو بەرواره سی ئیجازەی مەلایانی دا.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا محەممەد ڕەشید بەگی مەریوانی، مەلا ئیبراهیمی خەتێ، مەلا محەممەد یەکدەست، مەلا کاکە حەمەی (ناری)، مەلا عبدالکریمی کوڕی، مەلا صاڵحی جۆلەمێرگی، مەلا عەلی مامەجەلکەی، مەلا محەممەدی شێخ وەتمانی. مامۆستا مریدی شێخ حوسامەدینی (تەوێڵە)یی بوو.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٤٩ك – ١٩٣٠ز لە (ڕواندز) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (گەردەگەرد) لە خزمەت گۆڕی باوکی بە خاك سپێردرا، ژمارەی ئەبجەدی (غم شده)یان بۆ داناوە.

بەرهەمەکانی:

١. چەند حاشیەی جیا جیا لەسەر کتێبی (توحفە).
٢. مێژووی زانایانی کورد، ساڵی ١٩٢٦ز لە (وەردە) تەواوی کردووە.
٣. مێژووی حوکمدارانی ڕواندز، بە زمانی فارسی.

پاش کۆچی دوایی مامۆستا، مەلا عبدالکریم ئەفەندی کوڕی بووە جێگری.

سەرچاوەكان:
١. أربيل في مختلف العصور.
٢. علماء ومدارس في أربيل ٩٨.
٣. بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز ١٢٣ – ١٣٢.
٤. گۆڤاری (مەتین)، ژمارە ٦٨/ ٢٠ – ٢٥، ١٩٩٧ز.
٥. دەنگی زانا، ژمارە (٥٧)، ٢٠٠٢ز.
٦. كاروان، ژمارە (١٠٩) ٥١ – ٥٣، ١٩٩٧ز.
٧. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٨٩ – ٩٠.

## محەممەد ئەسفەندیار (١٢٥٠)

ناوی محەممەدە، كوڕی ئەسفەندیاری كوڕی بەدرانی، كوڕی ئەبانـە، شـێخەكی فەرموودەناس و مەزن بووە، ناسراوە بە (دەشتی هەولێری) سـاڵی ٦٦٥ك – ١٢٦٦ز لـە (قاهیرە) كۆچی دوایی كرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٦٠٠.

## محەممەد ئەفەندی ئاكرێ (١٢٥١)

مامۆستا مەلا محەممەد ئەفەندی ئـاكرێ، زانایـەكی بـەرز بـوو، ووردبـین بـوو، شارەزای زانستەكان بوو، ئیجازەی لە جەنابی مەلا محەممەدی جەلی كۆیە وەگرتبوو، پـێش نوێژ و ووتارخوێن بوو، لە مزگەوتی گەورەی (دهۆك) دەرسـی فـەقێیانی دەدا، ناوبـانگی مەلا چاكی ڕۆیشت بوو، بۆیە لە دووڕا دەهاتنە خزمەتی، چـەند كەسـی پێگەیانـد، بوونـە مەلای دێهات و شاران، بەردەوام بوون لە جێبـەجێ كردنـی كاروبـاری ئـاینی تـا سـاڵی ١٩٦٥ز كۆچی دوایی كرد و، مامۆستا مەلا ئەحمەدی برا گەورەی، لـە ١٩٥٨ز كۆچـی دوایی كرد.

سەرچاوە: أسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٣٠.

## محەممەد ئەفەندی کوردی (١٢٥٢)

مامۆستا مەلا محەممەد ئەفەندی کوردی مودەرریس بوو، لە قوتابخانەی (ئەندرۆن هەمایۆن) لە (ئەستەمبوڵ)، پاشان کرا (مدرس) لە مزگەوتی گەورەی (بروسا) ساڵی ١٠٨٤ك – ١٦٧٣ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (حاشیة علی شرح الآداب) و (شرح القصیدة البردیة) و (شرح الطریقة المحمدیه: للبرکوي).

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٢/١٢٠.

٢. معجم أعلام الکورد ٥٦٣.

## محەممەد ئیسماعیل پیرداودی (١٢٥٣)

ناوی محەممەدە، کوڕی سەید ئیسماعیلی کوڕی سەید عومەری کوڕی سەید ئەمینی کوڕی سەید ئەحمەدی کوڕی سەید کەریمی، کوڕی سەید ئەحمەدە، ساڵی ١٩١٦ز لە گوندی (قولتەپە) هاتووتەدنیا.

لای مەلا شەریفی مەلای گوندەکە دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (باشتەپە) عەوامیلی جورجانی و سەعدینی و ئوغوزەج و ئیظهاری لای مەلا ئەبوبەکری شەرکان تەواوکردن، چووە (خورخورە) لای مەلا عومەری تەڵەرخێمی، چووە لای مەلا شێخ مەعروف، چووە (بەردەسپی) لای مەلا سەعیدی ئاوماری، دوایی چووە (باشتەپە) لای مەلا سەعید، چووە (دۆلەزە) لای مەلا عوسمان، چووە (قەشقە) لای مەلا ئیسماعیلی ناقیص، چووە (ئۆمەراوە) لای مەلا شێخ عبدالکریم، چووە (کۆیە) لای مەلا عبدالله ی عەودالانی، چووە (گردەسۆر) لای مەلا شەریفی دوو شیوانی، چوە (بێتواتە) لای مەلا طاهیر، چووە (بێلینگە) لای مەلا مەجید، گەڕاوە (قەشقە) لای مەلا عومەری سنجاوی (ڕەش)، چووە (چۆمەزەردەرە) لای مەلا عبدالقادری (واحد العین)، چووە (دێمەکار) لای مەلا طەیبی دووشیوانی، چووە (کەسنەزان) لای مەلا محەممەدئەمینی سوێری، چووە

خورمەلە) لای مەلا عومەر، چووە (جلبەسەر) لای مەلا شێخ مەعروف، چووە (چغەمیرە) لای مەلا ئەحمەدی (ڕەش)، (مطول) و (عبدالحکیم) و (جمع الجوامع)ی تەواوکرد، چووە (کتکە) لای مەلا عومەری تەلەرخێمی، چووە (دیبەگە) لای مەلا ئیسماعیلی جدیدەی، پاشان چووە (هەولێر) مزگەوتی شێخ نورەدین لای مەلا صالحی کۆزەپانکەی شەرحی (چغمینی) و (ربع المقنطر) و (حاشیەی بەرجەندی) خوێند، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٤٥ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (پیرداود)، بیست ساڵان لەوێ دەرسیدا، ساڵی ١٩٦٥ز هاتە مزگەوتی حاجی طاها قەساب لە (هەولێر)، دوایی چووە مزگەوتی شێخ نورالدین، دوایی چووە مزگەوتی گەڕەکی (عەدل)، لە بەرواری ٢٧/٤/٢٠٠٤ز منداڵەکانی مەلا ئیسماعیل نانەکەلی مزگەوتێکیان بۆ دروست کرد بە ناوی (مزگەوتی سەید محەممەد پیرداودی)، هاتە ئەو مزگەوتە، لە ٢٧/١٢/٢٠٠٦ز کۆچی دوایی کرد.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالرحمانی گردجۆتیاری، مەلا عبدالله ی نەبیاوەی، مەلا عومەری چۆمەرزەردەرەی، مەلا محەممەدی ئێنەی، مەلا ئەحمەدی شێخ شەروانی، مەلا ئەحمەدی خۆشکان، مەلا عبدالله ی پەرپیتانی، مەلا عەلی خدر مامك، مەلا عبدالغنی طاها (بەزاز).

خووڕەوشتی: زانایەکی بەرز بوو، سەخی بوو، ڕێزی خەڵکانی دەگرت، بەردەوام بوو لەسەر خواپەرستی، بۆ وەڵامی پرسیاران خۆی ماندوو دەکرد، کە چووبایە خزمەتی هەر چوار دەورەی کتێب بوو، هەردەمەك زانیاری لە یەك وەردەگرت بە زۆری دەینووسییەوە، بۆ سوودی دواڕۆژ، کاتی خۆی بەفیڕۆ نەدەدا.

دانراوەکانی بە زمانی عەرەبی:

١. خدمة الدين وإعانة الطالبين: في إعادة الظهر بعد الجمعة.
٢. نخبة الأفكار، في تنجية والدي المختار.
٣. زوجات المفقودين.

٤. ظاهر السنه والكتاب في حل ذبيحة أهل الكتاب.
٥. تحقيق المقام في نزاهة سيد الأنام.
٦. جدول أوقات الصلوات.
٧. مشروعية التلقين.

دانراوە کوردییەکان:

١. ڕۆنکردنەوەی سەفەری (حەج): شەرحی ئیضاحی ئیمامی نەوەوی یە.
٢. کورتەباسێك دەربارەی قنوت.
٣. سەلاوات لێدان دوای بانگ.
٤. خشتەی کاتەکانی نوێژ.
٥. نامیلکەی دژی (وەهابییەکان).
٦. مۆسیقا لە ئیسلام: بە داخەوە تەواوی نەکرد.

سەرچاوەکان:

١. إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢١٨ – ٢١٩.
٢. خۆری ئیسلام، ژمارە ٢١ – ٣٤ – ٣٧/ ٢٠٠٣ز.
٣. خۆری ئیسلام، ژمارە ٣٤/ ٢٠٠٧ز.

**محەممەد ئیسماعیل سەرکردە (١٢٥٤)**

ناوی محەممەدە، کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئەبو ئەسعەدی کوڕی عەلی کوڕی مەنصوری کوڕی محەممەدی کوڕی حوسێنی شیبانی (دیاربەکر)یە، لە ٣ مانگی (محرم)ی ساڵی ٦٣٣ك – ١٢٣٥ز لە (میصر) هاتە دنیا، مەزهەبی حەنبەلی بووە، بۆ خوێندن چووە (ماردین)، ماوەك لە (دیمشق) بوو، گەڕاوە (میصر) لەسەرپشتی ئەسپەکەی کەوتەخوارەوە لاقی شکا، چەند ڕۆژ نەخۆش کەوت، لە ٧٠٤ك – ١٣٠٤ز کۆچی دوای کرد.

خووڕەوشتی: زانا بوو، کاربە دەست بوو، زانیاری لە قورئانی پیرۆز و ئوصول ودکتۆری هەبوو، لە مێژوو و نەحو و ڕێزمانی عەرەبی دەستی باڵا بوو، زۆر ئاقڵ

و هێمن بوو، خۆشنووس بوو، شاعیر بوو، شارەزای ڕووداوەکانی پێشوو بووە، ڕووخۆش و قسەخۆش بووە، خەڵکان لە مەجلیسی تێر نەدەبوون، دەرسی لەلای تەقیەدین ئیبن تەیمیە و زەهەبی خوێندووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/١١.

٢. معجم أعلام الكورد ٦٠١.

## محەممەد ئیسماعیل هەولێری (١٢٥٥)

ناوی محەممەدە، نازناوی (ئەبولحەسەنە)، کوڕی ئیسماعیلی کوڕی موسلیمی کوڕی سەلمانی هەولێری یە، ساڵی ٥٥٩ك - ١١٦٣ لە (بەغدا) هاتووتە دنیا، لە منداڵییەوە بە چاکە ناسرابوو، دەرسی فەرموودەی لەلایەن چەند زانایان خوێند، لە (هەولێر) دەرسی دەدا، بووە شێخەکی مەزن، بە سواری (گوێ درێژ) لە (میصر) هاتە (هەولێر) یەکەم کەس بوو سەرپەرشتی خانەقای سۆفییەکانی دەکرد، ساڵی ٦١٨ك - ١٢٢١ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (مشهد الكف) - لەوانەیە (پەنجە عەلی) ئێستا بی، دەکەویتە ڕۆژهەڵاتی قەڵات، نزیك مزگەوتی شێخ مصطفای نەقشبەندی (خ) - بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: تأريخ أربيل ١/٢١٣ /٢/٣٦٥.

## محەممەد ئیسماعیل هەولێری (١٢٥٦)

ناوی محەممەدە کوڕی ئیسماعیلی کوڕی کەحالی هەولێرییە، زانایەکی زیرەك و زەین تیژ بووە، منداڵی زۆر بووینە و دەستی کورت بووە، لەسەر ئەو حاڵە دڵفراوان و بە ئارام بووە (ئیبن حەجەر) دەڵێ: شەریعەت و ئوصولی چاك زانیوە، ساڵی ٧٩٠ك - ١٣٨٨ز لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٣١٤.

٢. معجم أعلام الكورد ٦٠٠.

## محەممەدئەمین ئەبوبەکر هەرشەمی (١٢٥٧)

نــاوی محەممەدئەمینــە، کــوڕی شــێخ ئەبوبــەکری کــوڕی مــەلا محەممــەدی (هەرشەمی)یە، نازناوی (بەهائەدینــە)، زانایــەکی بــەدین و خوانــاس و خواپەرســت بــووە، کەراماتی لێ دەگێڕنەوە، دوای کۆچی دوایی باوکی ماوەی سێ ساڵان لە جێگای بــاوکی شێخی تەریقــەتی نەقشــبەندی بــوو، لــە مــانگی مــەولودی ســاڵی ١٣٣٣ك – ١٩١٥ز خەریکی دەست نوێژ بوو، پێیەکەی ڕاستەی شووشت و، پێی چەپەی پــێ نەشــورا کۆچــی دوایی کرد.

دوو کوڕی هەبوو:

١. شێخ ڕەئوف: بە گەنجی جوانەرگ بوو.

٢. شێخ محەممــەد: لــە خانــەقای خۆیــان دەســتی کــرد بــە خوێنــدن، مــاوەك چــووە (بنەسراوەی گەورە) لای مەلا ئەحمەدی ئاشۆکانی، ماوەك چــووە (تــەرجان) لای مەلا عبدالله، دوا عەمری قورئانی پیرۆزی هەموو لەبــەر کــرد، بەشــێکی زۆر لــە مزگەوتی شێخ عبدالقادری گەیلانی لە (بەغدا)، لە بەرواری ٢٤/٢/١٩٧٤ز لە ماڵی خۆی لە (هەولێر) کتوپڕ کۆچی دوای کرد، تەنیا کوڕێکی هەیــە، ناســراوە بە (کاکەڕەش)، ماوەك ئەندامی پەرلــەمانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو.

سەرچاوە: دەنگی زانا ٥٢ و ٥٣ /٢٠٠١ز.

## محەممەدئەمین ئەحمەد زەند (١٢٥٨)

ناوی محەممەدئەمینــە، کــوڕی ئەحمــەدە، عەشــیرەتی (زەنــد)ە، لــە دەوروبــەری (کفری) دادەنیشن، ماوەك بریکاری والی (بەغدا) بووە، بۆیە ناســراوە بــە (کەهیــە) واتــە: یاریدەدەر، ساڵی ١٨٥٣ز پاش کۆچی دوایی شێخ مەحمودی ئالوسی کرا موفتی (بەغــدا)، ساڵی ١٨٧٦ز چووە (ئەستانە) لــەوی کــرا ئەنــدامی پەرلــەمانی ئــەو ســەردەمی، ســاڵی

١٨٩٣ز کۆچی دوای کرد، کامیل بەگی کوڕی خانووەکەی کردە (وەقفی) مزگەوت، مزگەوتی (کەهیە)ی ئێستا لە (بەغدا) لە شوێنی ئەو خانووەیە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٣٦٣ – ٣٦٤.

٢. معجم أعلام الکورد ٥٨١ – ٥٨٣.

## محەممەدئەمین ئەحمەد بێژوەیی (١٢٥٩)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی مەلا ئەحمەدی (سەراو)یە، دەوری ساڵی ١٢٧٧ك – ١٨٦٠ز هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە لای مەلا عبدالقادری کانی کبودی لە (بیارە)، ماوە لەوێ تا هێزی مەلایەتی و فەتوادانی پەیدا کرد، ئەمجا لە خزمەت شێخ عومەری (بیارە) تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت، لە لایەن شێخەوە کرا (خەلیفە)، گەڕاوە (بێژوە) دەستی کرد بە دەرسدانەوە و جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی، زۆربەی کاتی خۆی خەرج دەکرد لە قورئان خوێندن و تەماشاکردن و پێداچوونی توحفەی ئیبن حەجەر، زۆر ڕێزی خەڵکی دەگرت، خزمەتی مێوانانی دەکرد، لە دەوری ساڵی ١٣٨٠ك – ١٩٦٠ لە تەمەنێکی درێژ و پڕ تاعەت، کۆچی دوایی کرد، مەلا ڕەئوف نەوەی جێگری بوو.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدین ٥٤٧ – ٥٤٩.

## محەممەدئەمین ئەحمەد سوێری (١٢٦٠)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عبداللە یە، عەشیرەتی شێخ بزێنی یە، دەوری ساڵی ١٩٠٧ز لە گوندی (سوێری) هاتەدنیا.

دەستی کرد بە خوێندن، هەر لە زووەوە باب و دایکی کۆچی دواییان کرد، هەرچەندە بێکەس ماوە بەڵام وازی لە خوێندن نەهینا، پاش تەواوکردنی قۆناغی سوختەیی، چووە (دێمەکار) لای مەلا ئەحمەدی ڕەش، دوای چووە (هەولێر)، دوایی چووە

(ماوەران)، دوایی چووە (بێتواتە)، دوایی چووە (هەڵەبجە)، دوایی چووە (بیارە) لای مامۆستا عبدالکریم (مدرس)، دوایی چووە (نێرگسەجاڕ) لەوێ ساڵی ١٩٢٥ز (فەریدە)ی نووسییەوە، پاشان چووە (دیبەگە) لای مەلا ئیسماعیلی جدیدەی، ماوەکیش لەلای مەلا عومەری کەوری خوێند ماوەکیش چووە لای مەلا شەریفی دووشیوانی، ئەمجا چووە (بنەسراوە)ی گەورە، لای مەلا ئەحمەدی ئاشۆکانی، پاشان هاتە (هەولێر) لە مزگەوتی قەڵات لای مەلا ئەفەندی (هەولێر) ماوە تا ساڵی ١٩٣٩ز ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: کۆتایی بە خوێندن هینا، لەو شوێنانە مەلا بوو مەدرەسەی هەبوو: (عەلیاوە)، (کەسنەزان)، (ئەسپیندارە)، (خرابەدراو)، (دارەبەن)، (یارمجە)، (دووبز).

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالقادر گۆمەسپانی، مەلا خەلیلی دووسەرە (مخلص)، مەلا خدری دارەبەنی (دەشتی)، مەلا خدری شاممەری، مەلا صالح جەعفەر، مەلا عبدالله ی سێبەردانی، مەلا عبدالکریم قادر زێدبەگی، مەلا سەید محەممەد پیرداودی، مەلا حوسێنی قۆڕیتانی، مەلا ئیسماعیلی نانەکەلی، مەلا عەلی بیرەعارەبانی، مەلا صەدیقی نۆغەرانی، مەلا عەلی گردەچاری، مەلا محەممەدی شێخ شەروانی، مەلا ئەنوەری شەوەکی، مەلا عبدالعزیزی دووکەرەیی. مامۆستا تاك تاکە شیعری هەنە، نازناوی (حەزین)ە.

خووڕەوشتی: زانایەکی زیرەك و زمان ڕەوان و نەفس بەرز بوو، بەدین و دوورە دنیا بوو، بۆ کەسانی دنیا سەری نزم نەدەکرد، چاودێری فەرز و سوننەتەکانی دەکرد، بە ئەمەك بوو، شەو نوێژی دەکرد، کاتی خۆی بە فیڕۆ نەدەدا.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٦٣ لە (دووبز) کۆچی دوایی کرد، کورتە حاشیەی لەسەر (تهذیب) و (جمع الجوامع) و (مختصر) و (مدارك) و (سیوطی) و (تصریف) و (گەلەنبەوی ئاداب و بورهان) هەیە، مەلا عومەر و مەلا محەممەد کوڕانی ئەو زاتەنە، پێش نوێژ و ووتارخوێنن لە مزگەوتی (صواف) لە هەولێر.

سەرچاوە: علماء ومدارس في أربيل ١٢٠.

## محەممەدئەمین ئەییوبی کوردی (١٢٦١)

ناوی محەممەدئەمینە، ناسراوە بە (شێخ ئەییوبی کوردی نەقشبەندی) ساڵی ١٢٧٨ک – ١٨٦١ز لە گوندی (رملکا)ی (غوطە)ی (دیمشق) هاتەدنیا، لەلای مریدەکانی مەولانا خالید دەستی کرد بە خوێندن، ئەمجا بووە جێگری شێخ عیسای کوردی بۆ ئامۆژگاری خەڵکان، مامۆستا شارەزا بوو لە فەرموودە و شەریعەت و فەرائیز و سیرەت، ساڵی ١٣٥٦ک – ١٩٣٧ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی مەولانا خالید بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: معجم أعلام الکورد ٥٨١ – ٥٨٢.

## مەلا محەممەدئەمین بالیکدەری (١٢٦٢)

مامۆستا مەلا محەممەدئەمین خەڵکی (بالیکدەر)ی نزیك پێنجوێنە، ساڵی ١٢٧٠ک – ١٨٥٣ز لەو گوندە هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە چەند شوێنان گەڕا، دوایی چووە (پێنجوێن) لای مەلا عبدالرحمان، لەوێ ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (سلێمانی) لە مزگەوتی سەرشەقام کرا مەلا، دەستی کرد بە دەرسدانەوە ناوبانگی مەلاچاکی ڕۆیشت بوو، چاوی لە دەستی کەس نەبوو، چی پێیان بدابایە بە هەژارانی دەبەخشی، بەردەوام بوو لەسەر نووسین، خەتی خۆش و جوان بوو، شەرحی مەواقیفی تەواو نووسیتەوە، ساڵی ١٣٣٠ک – ١٩١٢ لە (سلێمانی) کۆچی دوای کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدین ٥٤٤.

## محەممەدئەمین چیچوڕانی (١٢٦٣)

مامۆستا مەلا محەممەدئەمین ساڵی ١٢٨٠ک – ١٨٦٣ز لە گوندی (چیچوڕان) سەر بە (بانە) هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، پاش قۆناغی سوختەیی چووە (پێنجوێن) لای مەلا عبدالرحمان، ماوە تا کۆتایی بە خوێندن هینا، ئیجازەی وەرگرت، بووە مەلا لە (چرچەقەلا)، دوایی گەڕاوە ناوچەی (بانە)، پاشان باری کرد بۆ (ڕەشەدێی) مەریوان،

ماوەی دە ساڵان لـەوێ مـەلا بـوو، دەرسـی دەدا، سـاڵی ١٣٥٥ك – ١٩٣٦ز کۆچـی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٤٥.

## محەممەدئەمین خەیلانی (١٢٦٤)

مامۆستا مەلا محەممەدئەمین عەشیرەتی خەیلانی یە، زانایەکی مەزن و مودەرریس بووە، لـە سـەرەتای سـەدەی چـواردەمی کۆچـی لـە (ڕوانـدز) دەرسـی داوە، مامۆسـتا محەممەدئەمینی کونەفلوسەی کتێبانی (تشريح الأفلاك) و (بورهانی گەلەنبەوی) لە خزمـەت خوێندووە، ناوی بردووە بە مامۆستای گەورە.

سەرچاوە: علماء ومدارس في أربيل ٩٩.

## محەممەدئەمین زەکی بەگ (١٢٦٥)

ناوی محەممەدئەمینە کوڕی حاجی عبدالرحمانی کوڕی مەحمودی کـوڕی بـاپیرە، ساڵی ١٢٩٧ك – ١٨٨٠ز لە (سلێمانی) هاتە دنیا، سـەرەتای خوێنـدنی لـە حـوجرەی فەقێیان بوو، لای مەلا عەزیزی زەلزەلەی، دوای چووە (بەغـدا)، سـاڵی ١٨٩٩ز چـووە قوتابخانەی جەنگی لە (ئەستانە)، خەریکی کاری لەشکر و ئەنـدازە و جوغرافیـا بـوو، لـە حکومـەتی عوسمـانی بەشـداری چـەندەها جـەنگی کـرد، سـاڵی ١٩٢٥ز کـرا وەزیـری گواستنەوە، لە ١٩٢٧ز کرا وەزیری مەعاریف، ساڵی ١٩٢٨ز کرا وەزیـری بـەرگری، لە ١٩٣١ز کرا وەزیری ئابوری، هەروەها لە پارێزگای (سلێمانی) کـرا نائیـب، نـاوبراو مێژووناس و شاعیریش بوو چەند شیعری هەیە.

سەفەرەکانی: (قەفقاس) (فەڕەنسا) (بایەزید) (تەفلیس) (مۆسـکۆ) (فیرلـەنـدا) (ئەستەمبۆڵ) (حەلەب) (فەلەستین).

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٦٨ك – ١٩٤٨ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. مشاهیر الكورد و كوردستان: بەرگی یەکەم ساڵی ١٩٤٥ز لە بەغدا چاپ کرا، بەرگی دووەم ساڵی ١٩٨١ز لە (میصر) چاپ کرا.

٢. تأريخ الدول والأمارات الكوردية: ساڵی ١٩٤٨ز لە میصر چاپ کرا.

٣. خلاصة تأريخ الكورد وكوردستان: ساڵی ١٩٦١ز لە بەغدا چاپ کرا.

٤. محاسەبەی نییابەت: ساڵی ١٩٢٨ز لە (بەغدا) چاپ کرا.

٥. دوو تەقەلای بێ سوود: ساڵی ١٩٣٥ز لە بەغدا چاپ کرا.

٦. تأريخ السليمانية وأنحائها: بە کوردی دایناوە، مەلا جەمیلی ڕۆژبیانی تەرجومەی کردووە وەلای عەرەبی، ساڵی ١٩٥١ز لە بەغدا چاپ کرا.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٩/٧٢ – ٧٣.

٢. مێژووی ئەدەبی کورد ٥/٣٨١ – ٣٨٨.

٣. الأعلام ٦/٢٧٠.

٤. تاريخ السليمانية – ١ –.

٥. معجم أعلام الكورد ٥٨٣ – ٥٨٦.

٦. مشاهير الكورد وكوردستان / پێشەکی ١٤.

٧. الكفاية في المواريث / الملحق ١٩٨.

٨. نثر الجواهر والدرر ٢/١٠٦ – ١٠٦٣.

٩. أعلام كورد العراق ٦٦٦ – ٦٧٢.

## محەممەدئەمین سەعید باغە نجیری (١٢٦٦)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی سەعیدی کوڕی ئیبراهیمە، ساڵی ١٩٤١ز لە گوندی (باغەنجیر) سەر بە (تەق تەق) هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (کۆیە) لای مەلا محەممەدئەمینی چۆمحەیدەری و مامۆستا مەعصومی هەورامی،

گەڕاوە (کەرکوك) خوێندنەکەی لە خزمەت ئەو بەڕێزانە تەواوکرد، مەلا عبدالمجیدی قوطب، مەلا عبدالعزیزی شیلەخانی، مەلا عومەری ئۆمەرگومبەتی.

ساڵی ١٩٦٦ز کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن لە مزگەوتی مەلا سەعید، لە گەڕەکی قۆریە لە (کەرکوك)، دوایی چووە مزگەوتی ئیمام قاسم، پاشان چووە مزگەوتی (ئۆزبەك) لە بەغدا، لە (کلیة)ی ئیمامی ئەعزەمیش دەیخوێند، پاش تەواوکردنی خوێندنەکەی گەڕاوە (کەرکوك) کرا مەلای مزگەوتی ئەحمەد ئاغا، ساڵی ١٩٨٦ز لە جێگای مامۆستا عبدالمجیدی قوطب کرا سەرۆکی زانایان، ساڵی ١٩٩٠ز کرا بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئاینی ئەوقاف، مامۆستا زۆرجاران لە تەلەفزیۆنەکانی کەرکوك و بەغدا، هەروەها لە (ڕادیۆ) ئامۆژگاری گەلەکەی دەکرد، لە ٢٥/٤/١٩٩٧ز ڕۆژی هەینی کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخ محیەدین لە کەرکوك بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: نامەی مەلا مەحمود عەزیز شێخ بزێنی / کەرکوك.

## محەممەدئەمین سولەیمان ئاشۆکانی (١٢٦٧)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی مەلا سولەیمانی کوڕی فەقێ محەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەزیزی کوڕی ڕەسولی (گەردی)یە، مامی نووسەری ئەم مێژووەیە، ساڵی ١٩١٠ز لە خانووی خانەقای شێخ ئەبوبەکر لە (هەولێر) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، ماوەك لە مزگەوتی شێخ مصطەفا لای موستەعیدەکانی ماوە، دوایی چووە (جدیدە)ی بەڕانیان لای مەلا حوسێنی مامی، دوایی چووە (بنەسراوە)ی گەورە لای مەلا ئەحمەدی مامی، پاشان چووە ناوچەی خۆشناوەتی: لە گوندی (خەتە) لای مەلا ئیبراهیم، لە (هەرتەل) لای مەلا فتح الله، لە (شەقلاوە) لای مەلا طاها، ئەمجا چووە (مام خاران)ی زراریان، لای مەلا عبداللە ی برا گەورەی، هەر لە خزمەت ئەو هاتە گوندی (شەوزار).

مەلایەتی: ساڵی ١٩٣٨ز بووە مەلا لە (گردارەق) ماوەك لەوێ ماوە، باری کرد بۆ (کەندار) لەوێ مەلا مەسعودی ئامۆزای و مەلا عومەری مەلا قەرەی لەلایان دەخوێند، دوایی باری کرد، هاتە (چاروك)ی گەورە.

خوێندنی دووبارە: نیازی تەواوکردنی خویندنەکەی هاتە دڵی، دووبارە چۆوە ناو فەقێیان، لە مزگەوتی گەورەی قەڵات لە (هەولێر) دەستی بە خوێندن کردەوە، لەوکاتە مەلا عبدالقادری برا گچکەی لەلای دەخوێند، ماوە لەوێ تا کۆتایی بە خوێندن هینا، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

دووبارە مەلایەتی: گەڕاوە (چاروك) دەستی کرد بە دەرسدانەوە و جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی، چەند ساڵان لەوی ماوە، پاشان باری کرد بۆ (قەریەتاغ) هەرچەندە لەوێ فەقێی نەبوون بەڵام زۆر ماوە لەوێ، بۆیە ناسرابوو بە (مەلا محەممەدئەمینی قەریەتاغی)، دوایی باری کرد، بۆ (دیبەگە)، چەند ساڵان لەوێ مەلا بوو، باری کرد هاتە (هەولێر).

سەفەرەکانی:

١. ساڵی ١٩٥٣ز لەگەڵ مامی مەلا ئەحمەد چووە سەفەری (حەج) لە ڕێگای (شام) و (بێروت).
٢. جاری دووەم چۆوە (حەج) لەو کاتە ماڵی لە (قەریەتاغ) بوو.
٣. جاری سێیەم چۆوە (حەج) لەوکاتە ماڵی لە (قەریەتاغ) بوو.
٤. جاری چوارەم چۆوە (حەج) لەو کاتە ماڵی لە (دیبەگە) بوو.

خووڕەوشتی: زاتەکی دیمەن جوان و قیافەت ڕێك بوو، دەم و چاوی سۆر و سپی بوو، حەزی لە مێوانداری بوو، چاوبڵند و سەخی بوو، بە ئیش و کاری برادەران زۆر ماندوو بوو، دەنگی خۆش بوو، جەنگنامەی (بەهنەسا)ی بە نزمەکی خۆش و دڵتەزێن دەخوێندنەوە، بەردەوام بوو لەسەر خوێندنی قورئانی پیرۆز، حەزی لە تەماشاکردنی تەفسیری (قورطبی) بوو.

کۆچی دوایی: لە ٩/٢/١٩٨٩ز لە ماڵی خۆی لە (هەولێر) کت و پڕ کۆچی دوای کرد، لە گۆڕستانی شێخ وەیس، لە (بەحرکە) نزیك گۆڕی مەلا عبداللە ی برای بە خاك سپێردرا.

کوڕەکانی:

١. مەلا عوسمان: پێش نوێژ و ووتارخوێنە لە گەڕەکی مەلایان، لە هەولێر.

٢. نەجمەدین: فەرمانبەرە لە وەزارەتی ئەوقاف.

٣. خالید: کۆچی دوایی کردووە.

٤. د. عزالدین: مامۆستایە لە زانکۆ.

٥. عەلی: مامۆستایە لە وەزارەتی پەروەردە.

٦. هاشم: مامۆستایە لە زانکۆ.

٧. قاسم: ئەندازیارە.

٨. بورهان: لە دەرەوەی کوردستانە.

سەرچاوەکان:

١. الإكليل في محاسن أربيل ٣٠٩.

٢. گۆڤاری هەولێر ١٥٣ – ١٥٤.

## محەممەدئەمین سولەیمان ئەییوبی (١٢٦٨)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی سولەیمانی کوڕی ئەمینی کوڕی عبدالرحمانی ئەییوبییە، زانایەکی شارەزا بووە لە مێژوو و نەتەوەناسین، کتێبی (عقد التهانی) داناوە، ژیاننامەی شێخ محەممەد سەعیدی بورهانی یە: مامۆستای خۆیتی وە لە ساڵی ١١٦١ك – ١٧٤٨ز هاتەدنیا.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٩/٧٣.

٢. معجم أعلام الكورد ٥٨٦.

## محەمەدئەمین شێخ محەممەد کونەفلوسەیی (١٢٦٩)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی مەلا شێخ محەممەدی کوڕی مەلا داودی کوڕی مەلا عبدالله ی کوڕی مەلا حوسێنە، ساڵی ١٢٨٣ك – ١٨٦٦ز هاتووتەدنیا، باپیری لە (بێتواتە) دانیشتووە باوکی هاتە (زێوە)، پاشان لەسەر داوای شێخ نەبی ماویلی چووە (کونەفلوسە).

خوێندنی: لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (شەقلاوە)، لای مەلا عوسمان ئەفەندی موفتی ئاداب و خەیالی خوێند، دوایی چووە (ڕواندز) تشریح و گەلەنبەوی بورهانی لای مەلا محەممەدئەمینی خەیلانی خوێند، چووە (شێخ مەمونەدییان) بەشی بەیانی (مطول) و عەقائیدی دەوانی لای مەلا عبدالله ی شێخ مەمونەدی خوێند، هەروەها ماوەکیش لای مەلا سەعیدی هیرانی بوو، گەڕاوە (کونەفلوسە) چەند مانگ لەوێ بوو، چووە (کۆیە) لای جەنابی مەلا عبدالله ی جەلی، کۆتایی بە خوێندن هێنا، ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: گەڕاوە خزمەت باوکی دەستی کرد بە دەرسدانەوە و فەتوا دان و جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی، پاش یەك ساڵ باوکی کۆچی دوایی کرد پاشان بنەماڵەی حاجی عبدالقادر دەباغ لە (هەولێر) داوایان لە شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی کرد، مەلایەکی چاکیان بۆ دابنێ، ئەویش بە دوو مامۆستا مەلا محەممەدئەمینی نارد، هاتە (هەولێر) کرا پێش نوێژ و (مدرس) لەو مزگەوتە، فەقێیان ڕوویان تێ کرد، لە دووڕا دەهاتنە لای، تاقمەکی دەکردە مەلا، چینەکی دی دەهات، ئەوەی دیارە و نووسراوە لە ژیانی خۆیدا پەنجاوحەفت ئیجازەی مەلایەتی داوە.

کرچی دوایی: لە ڕۆژی هەینی ٣ی مانگی شەووال ساڵی ١٣٥٩ك – ١٩٤٠ز کۆچی دوایی کرد، هێشتا لە ژیاندا بوو، دەرسی فەقێیانی جگە لە دەرسی شەریعەت تەسلیم بە مەلا عبدالله ی کوڕی کرد.

سەرچاوەکان:

١. نادي الإسلام في علم الكلام ٢ – ٤.

٢. أربيل في مختلف العصور ١٣٤.

٣. علماء ومدارس في أربيل ٩٦.

٤. محمد بن عبدالله الجلي ١٠٤.

## محەممەد ئەمین صالح گردمامکی (١٢٧٠)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی مەلا صالحی گردمامکە، ساڵی ١٩٠٢ز لەو گوندە هاتەدنیا، لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتایەکانی تەواوکردن، لە چەند شوێنان گەڕا بۆ بردنە سەری خوێندنەکەی، چووە (هەولێر) مزگەوتی حاجی قادر لای مەلا عبداللە ی بێتواتەیی، ماوەك لەلای مەلا عبداللە ی بەحرکە (باوکم) بوو، دوایی چووە ناوچەی خۆشناوەتی، پاشان ئاودیوی (ئێران) بوو، پێنج ساڵان لەوێ ماوە بە چاکی فێری زمانی فارسی بوو، گەڕاوە (هەولێر) مزگەوتی حاجی قادر لای مەلا عبداللە، هەر لەوێ ساڵی ١٩٢٦ز کتێبی (المنحة الوهبية)ی دانراوی مامۆستای، بۆ مەلا صادقی شەقلاوەی نووسییەوە، پاشان چووە مزگەوتی (قەڵات) لای جەنابی مەلا ئەفەندی ماوە لەوێ، تا ساڵی ١٩٣٤ز ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: گەڕاوە (گردمامك) لە شوێنی باوکی بووە مەلا، مەدرەسەی فەقێیانی دانا، پاشان باری کرد بۆ (خاروك)، دوایی چووە (چەمە)، پاشان چووە (دارەتوو)ی گۆڕانان، ساڵی ١٩٥٢ز چووە (حەج).

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا خدری شەمامەری، مەلا عبداللە ی سێبەردانی، مەلا محەممەدی قیرژەی، مەلا عبداللە ی کەونەباکی، مەلا جەمیلی کاوانی، مەلا عبداللە ی عەوێنەی، مەلا صەدیقی نۆغەرانی، مەلا ئەحمەدی برای.

خووڕەوشتی: زاتـەکی هـێمن و لەسـەرەخۆ بـوو، حـەزی لـە تێکەڵایـەتی و هاتووچوو بوو خەتی خۆش بوو، چەند پـەراوێزی لەسـەر پەرتووکـەکانی خوێنـدن هەیـە، جێگەی متمانەی ناوچەکە بوو بۆ فەتوای شەریعەت.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٥٦ز لە گوندی (دارەتوو) کۆچی دوای کرد، مـەلا محەممەدی کوڕی ئێستا لە (هەولێر) دوکانی (تحفیات - دیاری) هەیە.

سەرچاوە: نامەی مەلا محەممەدی کوڕی مامۆستا.

## محەممەدئەمین صبغەالله حەیدەری (١٢٧١)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی صبغةالله ی کوڕی ئیبراهیم حەیدەری ماوەرانی یـە، شێخ ئیبراهیم فەسیح دەڵێ: {برای باپیرەم محەمـەد ئـەمین هەرچـەندە بـەردەوام خـەریکی ویردی تەصەووف بوو، بەڵام دەستی لە زانست بەرنەدابوو، کتێبـی وایدانابوو مرۆڤی لـێ سەرسـام دەبـوو، هـەروەها حاشـیەی لـە سـەر حاشـیەی محەمـەد حوسـێن لەسـەر (مـیر ئەبولفەتح)ی ئاداب داناوە، لەگەڵ چەند حاشییان لەسەر کتێبانی خوێندنی سەرەوەی مەلا و فەقێیان} . مامۆستا زاتەکی زۆر بە دین بووە، چەند کەراماتی لێ دەگێڕنەوە.

سەرچاوەکان:

١. علماء ومدارس في أربيل ٥٤.
٢. عنوان المجد ١٢٨ - ١٣٠ - ١٤٦.
٣. بنەماڵەی زانیاران ٢٣٧.
٤. کاروان ٨٧ / ١٩٩٠ز.

## محەممەدئەمین عبدالله کانی مازێ (١٢٧٢)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی عبدالله ی کوڕی محەممەدئەمینە، ساڵی ١٩٠٧ز لـە گوندی (کانی مازێ) نزیك (خەلەکان) هاتـەدنیا، لای مـەلا حەسـەنی مـەلای گوندەکـە دەستی کرد بە خوێندن، چەند کتێبـی سەرەتایی تەواوکرد، چووە لای مەلا حەسەنی هێرۆ بەشێك نەحو و صەرف خوێند، چووە (کۆیە) لای مەلا تەوفیقی مەلا ئیمام ئـادابی خوێنـد،

هەروەها لە مزگەوتی مەلا حاجی، لای مەلا صادیقی مەلا ئەحمەد بەیانی خوێند، چووە (بێتواتە) لای مەلا نەبی کەلامی خوێند، گەڕاوە (کۆیە) لە مزگەوتی بایز ئاغا، لای مەلا بەهائەدین ئوصولی خوێند، چووە (سکتان) لای مەلا ئیسماعیلی ماویلی تەفسیر و حەدیسی خوێند، وە لەلای مەلا صالح (المدرس) مەنتیقی خوێند، لای مەلا عەباسی چناران ڕیازیاتی خوێند، گەڕاوە (کۆیە) لای جەنابی مەلا محەممەد جەلی، ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (کانی مازێ) دەستی کرد بە مەلایەتی و دەرسدانەوە، سێ ساڵ پتر لەوێ ماوە، تا گوندەکە بە دەست (بەعس) تێکدرا، مامۆستا بە زۆرەملێ لە کۆمەڵگای (حاجیاوا) نیشتەجێ کرا، ڕۆژی هەینی ٥/٥/١٩٩٥ز کۆچی دوایی کرد، لە (کانی مازێ) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## محەممەدئەمین عبدالله وەلزی (١٢٧٣)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی مەلا عبدالله ی کوڕی مەلا عبدالقادری کوڕی مەلا عەلی (فەوزی)یە، خەڵکی گوندی (وەلزێ)یە، نازناوی (ئەشعەری)یە، ساڵی ١٢٨٣ك – ١٨٦٦ز لە گوندی (پەسوە) هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، هەر لە خزمەت ئەو تەواوی کرد، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، مەلایەتی و دەرسدانەوەی لەم شوێنانە بوو: (ئوچتەپە)، (قەرەگوێز)، (ئەنبار). مامۆستا بەناوبانگ بوو، لە (ڕیازیات) دەستی باڵا بوو، ساڵی ١٣٩١ك – ١٩٧١ز لە تەمەنێکی درێژ لە خزمەت زانست، لە گوندی (ئەنبار)ی ناوچەی (بۆکان) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأریخ فرهنگ وادب مکریان ٢٩٧ – ٢٩٩.

## محەممەدئەمین عثمان جدیدی (١٢٧٤)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی عوسمانی کوڕی قادرە، ساڵی ١٩١٧ز لە گوندی (ئاودەلۆك) هاتەدنیا، عەشیرەتی (لەك)ە، قوڕئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتایەکانی لە گوندی خۆیان خوێند، دوایی چووە (سوریژە) لای مەلا شەریفی دووشیوانی، دوایی چووە

(مەخمور) لای مەلا محەممەد، پاشان هاتە (هەولێر) مزگەوتی مەلا ئەفەندی لە (قەلات)، دوایی چووە (دیبەگە) لای مەلا ئیسماعیل، ماوە تا ئیجازەی وەرگرت، بووە مەلا لە (کەپەنك ڕەش)، دوایی چووە (ئاودەلۆك)، لەوێ باری کرد بۆ جدیدە، ماوەی سالآن پتر لەوێ مەلا بوو دەرسی دەدا، پاشان هاتە (هەولێر)، سالّی ١٩٨٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## محەممەدئەمین عەزیز کانی میرانی (١٢٧٥)

ناوی محەممەدئەمینە کوڕی عەزیزە، خەلّکی گوندی (کانی میران)ی سەر بە (مەریوان)ە، سالّی ١٩٤٥ز لەو گوندە هاتەدنیا، لە گوندی (بناوەسوتە) دەستی کرد بەخوێندن، پاشان چووە (پێنجوێن) دوایی چووە (سلێمانی)، پاشان چووە گوندی (ساوا)ی سەر بە (مەریوان) لای مەلا سەعیدی ساوا، دوایی چووە لای مەلا باقری (بالك)، ماوە لە خزمەتی تا سالّی ١٩٧٣ز ئیجازەی وەرگرت لە گوندی (دووڕوو) سەر بە (مەریوان).

مەلایەتی: بووە مەلا لە (پێنجوین)، پاشان دەوری سالّی ١٩٨٠ز چووە (سلێمانی) لەسەر فەرموودەی شێخ عوسمانی بیارە بووە سەر خەتمی خانەقای مەولانا خالید، زاتەکی لە خواترس بوو، بەرگری لە شەریعەت و تەریقەت دەکرد، زۆر ئازا و بوێر بوو، بەرانبەر ئەوانەی دژی ئەهلی سوننەت و جەماعەتن.

کۆچی دوایی: لە ٨/٦/٢٠٠٢ز ٢٧ی مانگی مەولود، سالّی ١٤٢٣ك ڕۆژی شەمە بە کارەساتی ئۆتۆمبێل کۆچی دوایی کرد، دوای خۆی مەلا عبدالحمیدی کوڕی جێگریتی لە مزگەوتی شێخ مارفی قەرەداغی لە سلێمانی.

بەم بۆنەیە مەلا موختار ئەم دێڕە شیعرانەی نووسیون:

لە هەشتی شەشی دوو هەزار و دوو — بیست و حەوتی مەولود ڕۆژی کۆچی بوو
چوون لە ڕێگای جەژنی وەلادەت — مەعلوم هەیەتی پلەی شەهادەت
بۆیە ئەگێڕین کۆڕی ماتەمین — بۆ کۆچی مەرحوم مەلا حەمەمین

چوون ئەم مردنە زیانە بۆ دین ‌ ‌ ‌ مافی گشت کەسە کە بگێڕی شین
هەرچەند مردنی قەزا و قەدەر بوو ‌ ‌ ‌ بەڵام بۆ ئیسلام گەلێ زەرەر بوو

سەرچاوە: چاوپێکەوتنێك لەگەڵ مەلا عبدالحمیدی کوڕی مامۆستا لە بەحرکە ٣٠/٦/٢٠٠٨ز.

## محەممەدئەمین عەلی چۆمحەیدەری (١٢٧٦)

ناوی محەممەدەمینە، کوڕی عەلییە، ساڵی ١٩٣٥ز لە گوندی (چۆمحەیدەر) هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکردن، لە قۆناغەکانی سوختەیی و موستەعیدی تێپەڕی، لە چەند شوێنان لە حوجرەکانی فەقێیان گەڕا، لە قۆناغی کۆتایی چووە لای مەلا عبدالقادری (کانی دەربەندی) ئیجازەی وەرگرت.

بووە مەلا لە گوندی (داربەڕوولە)ی نزیك (کۆیە)، ساڵی ١٩٥٨ز چووە سەربازی پلەی جێگری ئەفسەری وەرگرت، ساڵی ١٩٦١ز گەڕاوە مەلایەتی، چووە گوندی (دار اختیاری) سەر بە قەزای شوانی (کەرکوك)، دوایی ساڵی ١٩٧٠ز بووە پێش نوێژ و ووتارخوێن لە مزگەوتی (محمدیە)ی کەرکوك، ساڵی ١٩٧٢ز گەڕاوە (کۆیە)، بووە مەلا لە مزگەوتەکانی (مەلا جامی) و (تەکیەی طاڵەبانی) و مزگەوتی گەورە، لە ٩/٢/١٩٩٠ز بە کارەساتی (سەیارە) لە کۆیە دەهات بۆ هەولێر کۆچی دوای کرد.

سەرچاوە: نامەی دکتۆر جەواد کوڕی مامۆستا.

## محەممەدئەمین فتح الله هەولێری (١٢٧٧)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی فتح الله یە، ساڵی ١٢٧٠ك – ١٨٥٣ز لە (هەولێر) هاتەدنیا، شێخ مصطەفای نەقشبەندی (خ) دەیفەرموو: {مەلا ئەمین خەڵکی گوندی سەعداوەی شەمامکە}، لە خزمەت بابی دەستی کرد بە خوێندن، لە چەند شوێنان خوێندنەکەی بردەسەر، تەریقەتی (قادری) لە بابی وەرگرت، پاشان چووە (بیارە) تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عومەر وەرگرت، گەڕاوە (هەولێر) ماوەك دەرسی دەدا، دوایی لەسەر

داوای شێخ چووە (مەککە)ی پیرۆز، ماوەی دە ساڵان لەوێ ماوە، پاشان دڵی بۆ خوێندن بزفتەوە، چووە (قاهیرە) (مسند)ی ئیمامی شافیعی و (موطأ)ی ئیمامی مالك لەگەڵ بەشێك لە تەفسیری بەیزاوی خوێند، شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی (خ) کە چووە سەفەری (حەج) لەلای ئەو دابەزی، چەند باسی فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بی) و زانیاری تریان کرد.

مەلایەتی: دەستی کرد بە درەسدانەوە، ناوبانگی مەلایەتی و شێخاتی ڕۆیشت، ساڵی ١٣٢٣ك – ١٩٠٥ز دووبارە چۆوە (حەج)، چەند ڕۆژ لە (مەدینە)ی پیرۆز ماوە، گەڕاوە (میصر) خەریکی دەرس و ویرد و زیکر و خواپەرستی بوو قەڵەمەکەی وەکو خۆی لەکار بوو، کتێبی (تنویر القلوب)ی دانا، بۆ ئەو کەسانەی نەیان دەتوانی بێنە لای، تاکو لە دوور و لە نزیك بتوانی زانیاری بەلاو بکاتەوە، ئەو کتێبە زۆرجار چاپ کراوە.

مامۆستا دوا عەمری لە (قاهیرە) خانەقای بۆ مریدان و مێوانان دروست کرد، بۆ نوێژ و جەماعەت و ویرد و زیکر، ساڵی ١٣٣٢ك لە (قاهیرە) باری کرد، بۆ گوندی (طنان)، دوای چووە گوندی (سند) لەوێ شەوی ١٢ی مانگی مەولودی پیرۆز کۆچی دوایی کرد، شێخ نەجمەدینی کوڕی بووە جێگری، شاعیرانی (میصر) زۆر هۆنراوەیان پێدا هەرگۆتیە، لەوانە بە عەرەبی:

محمد النقشبندي الأمين ومن — شاد المكارم بالإخلاص والحسب
بحر المعارف نور الله مرشدنا — شمس الحقائق شيخ العجم والعرب
إمام أهل التقي سر الولاية من — حيا الطريقة بالإرشاد والأدب
كنز المعارف قطب الواصلين ومن — تغنيك أفعاله الغرا عن الكتب
تبارك الله كم أحيت مكارمه — موات قلب فأضحي مظهر العجب
فليحي ساداتنا الأكراد إنهم — أهدوا لنا سيد الأبطال والنجب
والتهن مصر وأهلوها به شرفا — باليمن في روضة الأفراح والطرب
فيا مريد العلا في ظل رايته — أقبل ولا تصغ للواشي فذاك غبي

وكن بآداب أهل الحب ملتحقا وقبل النعل ترقى منتهى الرتب

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٤٥ – ٥٤٧.
٢. یادی مەردان ٢/٥٦٥ – ٥٦٨.
٣. معجم المؤلفين ٩/٧٧ – ٧٨.
٤. الأعلام ٦/٧٥ – ٢٦٩.
٥. معجم أعلام الكورد ٥٨٦.
٦. نثر الجواهر والدرر ٢/١٠٦٥.
٧. مشاهير الكورد ٣٦٥ – ٣٦٧.
٨. إيضاح المكنون ٢/١٣١.

**محەممەدئەمین قەراسنجی (١٢٧٨)**

ناوی محەممەدئەمینە، خەڵکی گوندی (قەراسنج)ە، لە بناری چیای سەفین، سەر بە قەزای (شەقلاوە)، زانایەکی بەرزی سەردەمی خۆی بووە، محەممەد صالح سەهرەوەردی لە کتێبی (لب الألباب) دەڵێ: {شێخ محەممەد طاهای شێروانی کە زانایەکی ناسراو بووە، لە ١٩٣١ز کۆچی دوایی کردووە، یەکە لە فەقێیانی ئەو زاتە}.

سەرچاوەکان:

١. لب الألباب ٢/٢٣٩.
٢. علماء ومدارس في أربيل ١١٠.

**محەممەدئەمین کوردی مەعنەوی (١٢٧٩)**

مامۆستا مەلا محەممەدئەمین لە شاری بەغدا لای بەرێزان مەلا محەممەد فەیزی زەهاوی و مەلا عبدالسلامی مودەڕریسی مزگەوتی شێخ عبدالقادری گەیلانی و مەلا عبدالوەهابی نائیب، خوێندنی بردەسەر، لەبەر ئەوەی بە قوڵی لە بابەتەکانی زانستەکان دەدوا، ناودەبردرا بە (مەعنەوی)، مامۆستا لە گەڕەکی (مربعە) شوێنی تایبەتی هەبوو،

خەڵکان بۆ پرسیاران دەچوونە لای بە تایبەت لە زانستی (کیمیا)، لە مانگی تشرینی یەکەم، ساڵی ١٩١٤ز لە (بەغدا) کۆچی دوای کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الکورد ٥٨٨.

## محەممەدئەمین محەممەد قەرەداغی (١٢٨٠)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی محەممەدە، خەڵکی (قەرەداغە)، مامۆستایەکی شارەزا و ناوداری سەردەمی خۆی بوو، لە ساڵانی ١٣٥٠ك - ١٩٣١ز ژیاوە، لە شاری (موصل) لە قوتابخانەی شێخ عەدی موسافیر هەکاری دەرسی داوە، شەرحی تەشریحی بەهائەدین عامیلی کردووە، چەند زانا پەسندیان کردووە، لەوانە مودەڕیسەکی سولەیمانییە، سەرەتایەکەی، بە (أحمدك اللهم علی نعمك الغِزار...) دەست پێ دەکا.

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/١٢٣ - ١٢٥.

## محەممەدئەمین مەعروف قەرەداغی (١٢٨١)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی مەعروفی کوڕی عومەری کوڕی شێخ عبداللطیفی گەورەیە، لە دەوری ساڵی ١٢٥٠ك - ١٨٣٤ز هاتووتەدنیا، لە بنەماڵەکی زانیاریخواز پەروەردە بووە، لە قوتابخانەی خۆیان دەستی کرد بە خوێندن، لە چەند حوجرەی فەقێیان قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، ساڵی ١٢٧١ك - ١٨٥٤ز چووە لای شێخ عبدالقادری موهاجیر لە شاری (سلێمانی) (تقریب المرام)ی لە خزمەت خوێند، کۆتایی بە خوێندن هینا، دەستی کرد بە دەرسدانەوە و جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣١٥ك - ١٨٩٧ز کۆچی دوای کرد، دوو کوڕی زانای هەبوو: شێخ عومەر و شێخ مەعروف.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٤٣ - ٥٤٤.

٢. بنەماڵەی زانیاران / شێخانی مەردۆخی ٣٦ - ٣٧.

## محەممەدئەمین موسا کفتارۆ (١٢٨٢)

ناوی محەممەدئەمینە، کوڕی مەلا موسایە، ناسراوە بە (کفتارۆ) ساڵی ١٢٩٤ك – ١٨٧٧ز هاتەدنیا، باوکی لە (دیمشق) لە مزگەوتی (ئەبونور) لەبەر خوێندنی دانا، لەبەر زیرەکی بەماوەی چوار مانگ قورئانی پیرۆزی هەموو لەبەر کرد، پاشان زمانی عەرەبی و تەجوید و فەرمودە و شەریعەتی مەزهەبی شافیعی خوێند، دوایی لە لای شێخ عیسای کوردی نەقشبەندی بەشێکی تری شەریعەت خوێند، ساڵی ١٣٣٠ك شێخ ئیجازەی تەریقەتی پێدا، دەستی کرد بە ئامۆژگاری خەڵکان، دەرسدانەوەی قوتابییان لە هەر چوار مەزهەبەکان، بەتایبەت (بدایة المجتهد)ی ئیبن ڕوشد، خۆشی نامیلکەکی دەربارەی نوێژی هەینی داناوە، ساڵی ١٣٤٣ك لە (دیمشق) چاپ کرا.

خووڕەوشتی: زاتەکی خواناس و دوور لە دنیا بوو، لەسەر ڕێبازی زانایانی پێشوو دەڕۆیشت، تەنیا پشتی بە خوا دەبەستا، خوای گەورە زۆر شتی زەحمەتی بۆ ئاسان دەکرد، لە مانگی ڕەمەزانی، ساڵی ١٣٥٨ك – ١٩٣٩ز کۆچی دوایی کرد، گوێیان لێ بوو بە نەرمی دەیگوت: {اللهم الرفيق الاعلى}، مامۆستا ئەحمەد کفتارۆی کوڕی، سەرۆکی زانایان بوو لە (دیمشق)، لە پێشدا باسمان کرد.

سەرچاوەکان:

١. نشر الجواهر والدرر ١٠٦٦ – ١٠٦٧.

٢. معجم أعلام الكورد ٥٨٠ – ٥٨١.

## محەممەد باساوی (١٢٨٣)

ناوو نژادی: مامۆستا مەلا محەممەد، ساڵی ١٩٢٩ز لە گوندی (کونەمشك) هاتەدینا.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، ساڵی ١٩٤٠ز چووە ناو فەقێیان لە گوندانی (باساوە) و (ئەحمەدبرێ) و (واوان) و (بیشاسب) خەریکی خوێندن بوو، لەلایەن ئەو بەڕێزانە: مەلا ئەحمەدی حیکمەتی جەریکی، مەلا عبداللە

ی ئەحمەدبرێو، مەلا عەلی بێشاسبی، ئەمجا هاتە (گەناو)، دوازدە ساڵان لەوێ ماوە، ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (باساو)ی سەردەشت، دەستی کرد بە مەلایەتی و دەرسدانەوە، پاشان گەڕاوە (کونەمشك) ساڵێك لەوێ ماوە، چووە (سەردەشت)، دوای شەش مانگ کۆچی دوایی کرد، مامۆستا زاتەکی بەدین و خۆڕاگر و ڕەزا سوك و قسەخۆش بوو.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٣١٢.

## محەممەد باقر بانەیی (١٢٨٤)

ناوی محەممەدە، کوڕی باقری کوڕی مەحمودە، یەکە لە زانایەکانی صەدەی سێزدەی کۆچی، ئەوە مەلا محەممەدی دووەمە، مەلا محەممەدی یەکەم: ناسراوە بە (تەوەککەلی) لە صەدەی دوازدەی کۆچی ژیاوە، مامۆستای دووەم: دەرسی لەلای مەلا عبدالرحمانی ڕۆژبیانی و مەلا غەزایی خوێندووە، خەتێکی خۆشی هەبووە، کتێبانی خوێندنی هەموو بە دەستی خۆی نووسینەوە، بەتایبەت تەفسیری بەیزاوی بە یەك مانگ نووسیتەوە، نووسینی بە پەلە بە زۆری هەڵەی تێدا دەکرێ، ئەو تەفسیرە سەرتاپای ڕۆندراوە هەڵەی تێدا نیە، نە لە پیت و وشەکانی، نە لە سەر و ژێرەکانی.

مامۆستا ساڵی ١٢٤٦ك لە مزگەوتی سۆری (مەهاباد) دەرسی دەدا، پاشان هاتە (سلێمانی) پاشایەکانی بابان زۆر ڕێزیان لێنا، پێشوازیەکی گەرمیان کرد، دوایی میری (موکریان) گێڕایەوە قوتابخانەی (سۆر).

لە مەلا عەلی قزلجی دەگێڕنەوە، دەڵێ: {مامۆستا مەلا محەممەدی بانەیی مامۆستای خۆمە، هەروەکو لە زانستی زاهیری شارەزا بوو، لە زانستی دەروونی چازان و پایەدار بوو}، لە دەوری ساڵی ١٢٦٠ك - ١٨٤٤ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی:

١. معراج الادراك، في شرح تشريح الأفلاك، ساڵی ١٢٢٨ك پێشکەشی بە محەممەد خالید پاشای بابان کردووە.

٢. حاشیە لەسەر توحفەی ئیبن حەجەر.

٣. رسالة في العوامل اللغوية.

٤. رسالة الفرق بين المصدر واسم المصدر: دوو لاپەڕەیە.

٥. چەند حاشیە لەسەر کەمالی شەرحی شافییە، لە زانستی صەرف.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/٥٦ /٧٢/٥.

٢. مشاهير الكورد ٣٦٣.

٣. ژیناوەری زانایانی کورد ٢١٥.

٤. معجم أعلام الكورد ٦٨٠.

٥. خۆری ئیسلام ٣٥/ ٢٠٠٧ز

## محەممەد باقرتەیی (١٢٨٥)

مامۆستا مەلا محەممەد، یەك بووە لە مەلایە مودەڕریسەکانی سەردەمی خۆی، مەلایەتی لە (باقرتە) و (کەسنەزان) کردووە، دەرسی بە زۆر فەقێیان داوە، یەك لەوانە: مەلا عومەری تەرجانی یە، مامۆستا ئیجازەی لە شێخ مصطەفای نەقشبەندی (خ) وەرگرتبوو، ماوەکی زۆر خەریکی کاروباری مەلایەتی بوو، پاشان وازی هینا، لە هۆدەکی تایبەت، تەنیا خواپەرستی دەکرد، دوایی هاتووچووی خەلکانی قەدەغەکرد، تەنیا خێزانەکەی نان و ئاوی بۆ دەبرد، لە دەوری سالی ١٩٥٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. النجم الزاهر ٦٦.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ٣٣٧.

## محەممەد بەسطام خۆشابی (١٢٨٦)

ناوی محەممەدە، کوڕی بەسطامی حوسەینی حەنەفییە، خەلکی (خۆشاب)ی سەر بە (وانە)یە، سالی ١٠٩٦ك – ١٦٨٥ز لە (کەستەل) کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی: (خلاصة التفسير) و (عرائس المجالس) و (قصص الأنبياء).

سەرچاوەکان:

١. كشف الظنون ٢/١١٣١.
٢. إيضاح المكنون ١/٤٣٤
٣. هدية العارفين ٢/٢٩٩.
٤. معجم المؤلفين ٩/١٠٢.
٥. مشاهير الكورد ٢/١٢٩.

## محەممەد بەگ کورد عەلی (١٢٨٧)

زانای ڕۆشنبیر، خاوەن هەست و بیر، محەممەد بەگ عەلی کوردی، لە کتێبی (خطط الشام) خۆی دەڵێ: {باپیرم خەڵکی شاری سلێمانیە، لە نەتەوەی سوڵتانە ئەییوبییەکانە پاشان ئێمە کەوتینە شام}، لە مانگی صەفەری ساڵی ١٢٩٣ك – ١٨٧٦ز لە (شام) هاتە دنیا، یەکەم جار چووە قوتابخانەی (کافل سیبای)، دوایی لە قوتابخانەی (روشدییە)ی عەسکەری، فێری تورکی و فارسی و فەڕەنسی بوو، ماوەك کرا فەرمانبەر، لەو کاتە تەفسیر و شەریعەت و فەلسەفە و مێژوو و کۆمەڵایەتی و ڕێزمانی عەرەبی خوێند، ساڵی ١٣١٥ك – ١٨٩٧ز کرا نووسەری ڕۆژنامەی (شام)، لە ١٩٠١ز کرا نووسەری ڕۆژنامەی (میصر)، لەو ماوە هاتووچووی مامۆستا محەممەد عەبدەی دەکرد، زۆر شتی لێ فێربوو، گەڕاوە (شام)، چووە (میصر) ڕۆژنامەی (المقتبس)ی دەرکرد، گەڕاوە (شام)، ئەمجارە لەلایەن حکومەت دڵتەنگ کرا، باری کرد بۆ (فەڕەنسا) لەوێ کتێبی (غرائب الغرب)ی دانا، هاتە (ئەستەمبوڵ) دووبارە پۆغامیان پێ هەڵبەستا نارەحەت بوو، گەڕاوە (میصر) لەوێ چووە (شام)، ساڵی ١٩١٣ز سەفەرەکی درێژی کرد بۆ (ئیطالیا) و (سویسرا) و (مەجەر) و (تورکیا)، گەڕاوە (شام)، لەوێ کۆڕی زانستی عەرەبی دامەزراند، کرا سەرۆکی دیوانی زانستی، لە بەرواری ٧/٩/١٩٢٠ز کرا وەزیری مەعاریف لە (سوریا)، دووبارە گەڕاوە (ئەورووپا)، بەرگی دووەمی (غرائب الغرب)ی

دانا، گەڕاوە، ئەمجارە دەستی خۆی لە وەزیراتی کێشاوە، تەنیا سەرۆکی کۆڕی زانستی بوو، دەستی کرد بە دانانی کتێبی (خطط الشام)، دووبارە کراوە وەزیری مەعاریف هەر لەو ساڵە حکومەتی (سوریا) بە نوێنەر ناردییە (ئەکسفورد).

کۆچی دوایی: لەبەرواری ٢/٤/١٩٥٣ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (باب الصغیر) بە خاك سپێردرا، چەند دانراوی خۆی هەیە، بەشێکیان چاپ کراون، بەشێکیان چاپ نەکراون.

دانراوە چاپ کراوەکان:

١. يتيمة الزمان، ساڵی ١٣١٤ك چاپ کرا.
٢. مجلة المقبس: دوو بەرگە.
٣. رسائل البلغاء.
٤. غرائب الغرب: دوو بەشە.
٥. غابر الأندلس وحاضرها.
٦. تأريخ الحضارة.
٧. القديم والحديث.
٨. رواية المجرم البريء.
٩. قصة الفضيلة والرذيلة.
١٠. خطط الشام: شەش بەرگە.

دانراوە چاپ نەکراوەکان: (حرية الوجدان) و (كنوز الاجدار) و (الحرية الدينية) و (مكتشفات الاحفاد) و (الحرية السياسية) و (أمراء الانشاء) و (أخلاق المعاصرين).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٠/١٦٢.
٢. مشاهير الكورد وكوردستان ٣٧٨ – ٣٨٠.

### محەممەد بەهرام گۆرانی (١٢٨٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی بەهرامە، نازناوی (شەمسەدین ئەبو عبدالله)یە، باپیری زانایە گۆرانییەکانی دیمشقە، ساڵی ٦٢٨ك – ١٢٣٠ز هاتە دنیا، لە (میصر) خوێندنی بردەسەر، لە (مەدینە)ی پیرۆز کرا قازی، پاشان چووە (شام) لە (حەلەب) نیشتەجێ بوو، کتێبی (تحفة النبهاء في اختلاف الفقهاء)ی دانا، خەریکی دەرسدانەوە و ئامۆژگاری و ووتاردان بوو، تا ساڵی ٧٠٥ك – ١٣٠٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٩/١٢٢.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٤.

٣. هدية العارفين ٦/١٤١.

٤. مشاهير الكورد ٢/١٣٩ – ١٤٠.

### محەممەد بەیان تەفلیسی (١٢٨٩)

ناوی محەممەدە کوڕی بەیانی کوڕی حیمڕانە، خەڵکی (تەفلیس)ە، لە (بەغدا) دانیشتووە، دەرسی لە خزمەت باوکی و لەلایەن مەروانی کوڕی شوجاعی جزیری (١٨٤ك کۆچی دوایی کردووە) و عبدالله ی کوڕی حەمادی خوێندووە، چوویتە لای چەندان زانایان.

سەرچاوە: الأنساب ١/٤٩٤.

### محەممەد تەقی مەرعەشی (١٢٩٠)

ناوی محەممەد تەقییە، نازناوی (شەهرستانی)یە، کوڕی محەممەد حوسێنی کوڕی محەممەد ئیسماعیلە، لە سەیدەکانی حوسێنی یە، خەڵکی (مەرعش)ە، زانایەکی ئوصول زان و شەرع زان بووە، ساڵی ١٢١٣ك – ١٧٩٨ز هاتووتەدنیا، لە ٢٨ ذی الحجە، ساڵی ١٣٠٧ك – ١٨٩٠ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (ذخيرة المعاد)ی داناوە.

سەرچاوە: معجم المؤلفين ٩/١٣٦.

## محەممەد تەمیم حەڕانی (١٢٩١)

ناوی محەممەدە، نازناوی (ئەبو عبداللە)یە، کوڕی تەمیمە، خەڵکی (حەران)ە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، زانایەکی شەرع زان بووە، دەرسی لەلای مەجدەدین ئیبن تەیمییە خوێندووە، کتێبی (المختصر)ی لە شەریعەت داناوە، تا باسی (زەکات)، وادەگێڕنەوە: چوویتە لای ناصیرەدینی بەیزاوی بۆ خوێندن، لەوێ جوانەمەرگ بوو.

سەرچاوە: الذیل علی طبقات الحنابلة ٤/٢٩٠.

## محەممەد جابیر بەتانی (١٢٩٢)

ناوی محەممەدە، کوڕی جابیری کوڕی سەنانە، خەڵکی (بەتانە) نزیك حەڕان، ساڵی ٢٣٥ك – ٨٤٩ز هاتە دنیا، زانایەکی ئەستێرەناس بووە، لە ڕەصەد و زیج شارەزا بووە، لە چەرخی خۆی بێ وێنە بووە، ساڵی ٣١٧ك – ٩٢٩ز لە (بەغدا) دەگەڕاوە بۆ (موصل) لە (حەضەر) کۆچی دوایی کرد.

چەند دانراوی خۆی هەیە، لەوانە: (معرفة مطالع البروج) و (رسالة في تحقیق أقدار الاتصالات) و (الزیج) و (تشریح المقالات).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ٩/١٤٤ – ١٤٥.
٢. کشف الظنون ١/٩٧٠.
٣. شذرات الذهب ٢/٢٧٦.
٤. إیضاح المکنون ١/٦٢١.

## محەممەد جەسیم مەردۆخی (١٢٩٣)

ناوی محەممەد جەسیمە، کوڕی شێخ محەممەد سەعیدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی مەحمودی مەردۆخی یە، برای شێخ عبدالقادری موهاجیری خاوەنی (تقریب المرام)ە، ناوبراو پاش کۆچی دوایی شێخ وەسیمی برای ماوەك لە قوتابخانەی (دار الإحسان) دەرسی داوە، زانایەکی بەتوانا بووە، (کشف الغطا)ی، لە کەلام داناوە، ساڵی ١٢٣٤ك

– ١٨١٨ز فێرستی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی نووسییەوە، لەسەر داوای (ئـەمیر حەسـەن بەگ)، لە ٢١ی مانگی ذی الحجە، ساڵی ١٣٠٥ك – ١٨٨٨ز لە (سنە) کۆچـی دوای کرد، مەلا مصطفەای کوڕی خەتێکی خۆشی هەبووە، کتێبـی (بهجة المرضـية)ي سـيوطی، لەگـەڵ هـەموو پـەراوێزەکانی دەورەی، سـاڵی ١٢٥٩ك – ١٨٤٣ز لـە (کـەرکوك) نووسیتەوە، ئێستا ئەو دەستخەتە لەلای ئێمەیە.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٣٣٦.
٢. تأريخ مشاهير كورد ٢/٢٦ – ٢٧.
٣. بنەماڵەی زانیاران ١٤٥ – ١٤٦.

## محەممەد جومعە حصکەفی (١٢٩٤)

ناوی محەممەدە، کوڕی جومعەیـە، خـەڵکی (حصـن كيفا)يـە، کتێبـی (ترياق الأفاعي في الرد على البقاعي) داناوە، ساڵی ٨٧٤ك – ١٤٦٩ز تەواوی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٩/١٥٩.
٢. إيضاح المكنون ١/٢٨٤.
٣. هدية العارفين ٢/٢٠٦.
٤. معجم أعلام الكورد ٦٠٢.

## محەممەد جەمیل ڕۆژبیانی (١٢٩٥)

ناوی محەممەد جەمیلە، کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی بەکری کوڕی سەلمانە، لـە (٢٧)ی مـانگی ڕەجـەبی سـاڵی ١٣٣١ك – ١٩١٣ز لـە گونـدی (فورقـان) ناوچـەی قەرەحەسەن، پارێزگای (کەرکوك) هاتەدنیا، لە پێشدا ناوی خۆی بـە (بەنـدی) هەڵـداوە، واتە زیندان کراو، دوایی ئەو نازناوەی وەلانا.

خوێندنی: لەلای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کـرد، چەند کتێبـی سەرەتایی خوێند، لەگەڵ بەشێك لە تەفسیر و شەریعەت و ڕێزمـانی عـەرەبی لە گوندی (باداوە)ی دەشتی کۆیە، هەر لە خزمەت باوکی ساڵی ١٩٢٢ز لـە مزگـەوتی گەورەی سلێمانی فارسی و تورکی خوێند، ساڵی ١٩٢٨ز چووە (کەرکوك) و (پردێ - ئاڵتون کۆپری) ماوەك لەلای مەلا سەید یوسفی سەید عەزیزی خزمی خۆیان بـوو، دوایـی هاتە (هەولێر) مزگەوتی حاجی قادر دەباغ، لای مەلا عبـدالله ی بێتواتـەی، پاشـان چـووە (عەوێنە) لای مەلا عوسمانی خورمەلەی، ئەمجارە لەبـەر کارەسـاتی کـوژرانی بـاوکی دوو ساڵان وازی لە خوێندن هینا، ساڵی ١٩٣٦ز چووە (کفری)، لەوێ هاتە (کەرکوك) لای مەلا ڕەزای واعیز ماوە تا ساڵی ١٩٤٢ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: کۆتایی بە خوێندن هینا، زۆری بێ نەچوو دەستگیرکرا، مـاوەك لـە بەندیخانەی (عیمارە) بوو، لەو کاتە (تأریخ السـلیمانیة)ی محەممەدئـەمین زەکـی بـەگی، لـە کوردی تەرجومە کرد وەلای عەرەبی، هەر لەو کاتە لە بەرواری ١١/٥/١٩٤٣ز دەستی کرد بە تەرجومـەی (شـەرەفنامە)ی شـەرەفخانی بەدلیسـی لـە فارسـی بـۆ عـەرەبی، لـە ١/١/١٩٤٤ز تەواوی کرد، ساڵی ١٩٥٠ز کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن لە (قزلرباط - سەعدییە)، پاشان ناردرا (داقوق)، لەوێ ناردرا بۆ (کوت)، لەوێ نـاردرا بـۆ (بەصـرە)، لەوێ ناردرا بۆ (مەندەلی)، پاشان گەڕاوە (کەرکوك)، سـاڵی ١٩٦١ز لـە پـێش نوێـژی لادرا، ماوەك ئەندامی کۆڕی زانیاری کورد بوو، خەریکی نووسین و دانان بوو، فارسـی و عەرەبی و تورکی بە چاکی دەزانـی، دەوری هـەژدە کتێبـی تەرجومـە کـردووە، شـەوی ٢٧/٣/٢٠٠١ز لە ماڵی خۆی لە (بەغدا) بە تەنیا بوو، خێزانەکەی زیز ببـو، بـە دەسـتی چەند تاوانباران کوژرا و پارچە پارچە کرا، لە (هەولێر) تازییەی بۆ دانرا.

سەرچاوەکان:


١. معجم أعلام الکورد ٦٠٢.

٢. أعلام کورد العراق ٢٢٢ - ٢٢٤.

## محەممەد جەنگلی (١٢٩٦)

ناوی محەممەدە، کوڕی جەنگلی کوڕی محەممەد بابای کوڕی خەلیلی کوڕی جەنگلی کوری عبداللە یە، ساڵی ٦٩٧ك – ١٢٩٧ز لە (دیاربەکر) هاتەدنیا، لە تەمەنی دە ساڵان لەگەڵ باوکی چووە (قاهیرە) لە سەرەتاوە خەریکی خوێندنی شەریعەت بوو، لەسەر مەزهەبی حەنەفی بوو، پاشان مەزهەبی خۆی گۆڕی بووە حەنبەلی، ماوەك چووە (حیجاز)، دوایی چووە (وانە) بۆ فێربوونی فەرموودە، مامۆستا شارەزابوو لە فەرموودە و شەریعەت و عەرەبی و مۆسیقا و دکتۆری و شەطرنج، هەروەها شاعیر بوو، مەجلیس ئاوەدان و بە زەوق بوو، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٧٤١ك – ١٣٤٠ز کۆچی دوای کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدر الکامنة ٣/٤١٦.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٤٧٩ – ٤٨٠.

## محەممەد حەسەن دێرەبڕوشەیی (١٢٩٧)

ناوی محەممەدە، کوڕی مەلا حەسەنە، خەلکی گوندی (دێرەبڕووشە)یە، ڕۆژهەلاتی چیای (بێرەك) سەر بە ناحیەی (هەریر).

ساڵی ١٨٤٦ز هاتە (هەولێر) لەو کاتە ژنی نەهینابوو، بنەماڵەکی خێرخواز لە قەلات ژنیان دایێ، پیرەژنێکی دەوڵەمەند ناو (ئامینەخان) مزگەوتێکی لە گەڕەکی (عارەبان) دروست کرد، مامۆستا لەوێ بووە مەلا، ساڵی ١٨٨٧ز ئیجازەی لە مەلا عومەر ئەفەندی وەرگرت، وە لەپێشدا ساڵی ١٨٧٠ز ئیجازەی تەریقەتی لە شێخ عبدالحمیدی ئەتروشی وەرگرتبوو، ئیجازەنامەکە مەلا عبدالهادی ئەحمەد نەوەی مەلا یەحیای مزوری نووسیتیەوە، ناوبراو ساڵی ١٩٠٤ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (ئیمام محەممەد) بە خاك سپێردرا.

کوڕەکانی: سێ کوڕی مەلای هەبوون:

١. مەلا عبداللە: لە پێشدا باسمان کرد.

٢. مەلا طاهیر: مەلا بوو لە (خەزنە)ی حاجی صادق ئەویش کوڕێکی هەبوو، ناو مەلا مەحمود: مزگەوتێکی لە گەڕەکی (بیرێژییان) دروست کرد، لە (هەولێر).

٣. مەلا حەسەن: مەلا بوو لە (دووستەپە) کوڕێکی مەلای هەبوو ناو یوسف.

سەرچاوەکان:

١. أربیل في مختلف العصور١٠٩.

٢. علماء ومدارس في أربیل ٨٣.

٣. نامەی مەلا سولەیمان مەلا عبدالله دێرەبڕوشەیی.

## محەممەد حەسەن سەلماسی (١٢٩٨)

ناوی محەممەدە، نازناوی (ئەبونەصرە) کوڕی حەسەنی کوڕی محەممەدی کوڕی جەعفەری کوڕی داودی (سەلماسی)یە، ئامۆزای مامۆستا ئەبو عبداللەی سەلماسی یە، دەرسی فەرموودەی لای چەند زانایان خوێندووە، کۆمەڵێك فەرموودەی پێغەمبەری (درودی خوای لێ بی) لەبەربووینە و بەلاوی کردوونەوە، لە مانگی ڕەبیعی دووەم، ساڵی ٤٤٤ك – ١٠٥٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الأنساب ٣/٢٩٩.

## محەممەد حەسەن شارەزوری (١٢٩٩)

ناوی محەممەدە کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی قاسمی کوڕی مظفری شارەزورییە، ساڵی ٥٢٠ك – ١١٢٦ز لە (موصل) قازی بووە، ساڵی ٥٧٥ك – ١١٧٩ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعیة الکبری ٣/٣٥٧.

٢. الإکلیل في محاسن أربیل ٨٨.

## محەممەد حەسەن عەلائی (١٣٠٠)

ناوی محەممەد حەسەنە، کوڕی مەلا ئوەیسی کوڕی مەلا مەحمودی کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەدی کوڕی مەلا مصطەفایە، زانایەکی بەرزی کوردە، مریدی شێخ عەلی حوسامەدینە، مامۆستا شاعیریش بووە، نازناوی (عەلائی) یا (ذوالعلا)ی بۆ خۆ داناوە، هۆنراوەی فەرائیزی هەیە، لە سەرەتاوە، دەڵێ:

| | |
|---|---|
| قال الفقير ابن الأويس السامي | وهو محمد حسن الحسامي |
| الحمد لله وصلي وسلما | على محمد ومن به انتمي |

لە کۆتاییدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| يـاربنـا فـارحم بنا وعافنا | عن البلا وانفع بها وجازنا |
| بشرني الهاتف في تأريخ ذي | بقـول: (جاء جزاؤه خذي) |
| | ١٣٢٢ك |

لێرەدا سێ تێبینی هەیە:

١. (وصلي وسلما) لەنگە، بۆ ڕاست کردنی کێشەکە، دەبوو (و) واوەکە لابچێت بەم شێوەیە بیت (وصلي سلما)...

٢. (ي) یائەکەی ئیشباعی (خذي) ناژمێردرێ، دەنا دەبێتە ١٣٣٢ك.

٣. هەمزەکەی (جاء) دەژمێردرێ، بەڵام ناخوێندرێتەوە، دەنا کێشەکە لەنگ دەبێت.

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٥/٣٥٨ – ٣٦٥.

## محەممەد حەسن قازی (١٣٠١)

ناوی محەممەدە، کوڕی حەسەنە، نازناوی (ئەبو سەعاداتە) قازی بووە، فەرموودەناس بووە، زاتەکی خێرخواز و ڕوو لە چاکە بووە، لەشەوی شەمەی سەرەتای مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، ساڵی ٥١٨ك – ١٢٤ز لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا کۆچی کرد.

سەرچاوە: المنتظم ١٠/٢٠٥.

## محەممەد حەسەن قودسی (١٣٠٢)

محەممەد قودسی ئەفەندی، کوڕی حەسەن ئەفەندی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی حەلیمی موفتی (حەلەبە)، لە شاری (ئورفە) هاتەدنیا، زانایەکی بەناوبانگ بوە، لە (ئەستانە) کرا قازی (روها)، پاشان لەگەڵ کاربەدەستەکانی ئەوێ رێك نەکەت، دوریان خستەوە بۆ (قەلعەرۆم)، دوایی سەلیم سیرری پاشا لەگەڵ خۆی هیناوە (ئەستەمبۆڵ)، کردیە موفتی (ئەزمیر)، ساڵی ١٢١٥ك کرا قازی (ئەرضرۆم)، لە ١٢٢١ك – ١٨٠٦ز کرا قازی (مەککە)ی پیرۆز، لە کۆتایی ئەو ساڵەدا، گەڕاوە (ئەستانە) نەخۆش کەت، زۆر پێ نەچوو کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی سوڵتان بایەزید، بە خاك سپێردرا، مامۆستا زانایەکی زمان ڕەوان و قسەخۆش بوو، بە سێ زمان شیعر و نووسینی هەیە، فەرموودە و دوان(ئاخاوتن)ی بەهێز بوو، لە ئیش و کاری خۆی سەرکەوتوو بوو.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٣٤٤ – ٣٤٥.

٢. معجم أعلام الکورد ٥٥٣ – ٥٥.

## محەممەد حەسن کوردی (١٣٠٣)

ناوی محەممەدە، کوڕی حەسەنی کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدی کوردیە، ساڵی ٧٨١ك – ١٣٧٩ز هاتەدنیا، لە تەمەنی حەوت ساڵیدا لەگەڵ بابی لە کوردستان چووە (قودس) بیست ساڵان لەوێ ماوە، صەحیحی بوخاری و چەند کتێبی تری خوێند، بابی کۆچی دوایی کرد، لەگەڵ دایکی چووە (مەککە)ی پیرۆز، ساڵی ٨١٤ك کەمێکی خوێند، چووە (دیمشق) ماوەکی لەوێ خوێند، کۆتایی پێ هینا، گەڕاوە (مەککە) و (مەدینە) دەستی کرد بە دەرسدانەوە، مامۆستا زاتەکی شارەزای زانستەکان بوو، لە دکتۆرێ زۆرزان بوو، شێخ محیەدینی کوڕی عەرەبی زۆر خۆش دەویست، کتێبەکانی ئەوی، دەخوێندنەوە، ساڵی ٨٤٣ك – ١٤٣٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٧/١٩٣.

٢. مشاهیر الکورد ٣٧٢.

٣. معجم أعلام الکورد ٦٠٣.

**محەممەد حەسن گلەزەردەیی (١٣٠٤)**

ناوی محەممەدە، نازناوی (محیەدین قولەیە) کوڕی شێخ حەسەنی گلەزەردەیە، ساڵی ١١٣٣ك – ١٧٢٠ز هاتەدنیا، لە گوندی (قولە) دانیشتووە، پاش تەواوکردنی زانستەکان، تەریقەتی قادری لە مامی خۆی شێخ ئیسماعیلی ولیانی وەرگرت، دەستی کرد بە دەرسدانەوە و ئامۆژگاری کردن، پاشان چووە (کەرکوك) ساڵی ١١٩٥ك – ١٧٨١ز کۆچی دوایی کرد، ئەو کتێبانەی داناون: (مجمع الجواهر) و (إصلاح النفوس) و (کشف الکروب) و (جامع الفوائد) و (السیف القاطع).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ١٢/٢٠٧.

٢. الشیخ معروف النودهي ٧٦ – ٧٧.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٥٠٤ – ٥٠٥.

٤. تأریخ السلیمانیة ٢٨٨.

٥. بنەماڵەی زانیاران ٣٣٠ – ٣٣٣.

**محەممەد حەسن مەرعەشی (١٣٠٥)**

ناوی محەممەدە، نازناوی ئەبوبەکرە، کوڕی حەسەنە، مەزهەبی شافیعی یە، خەڵکی (مەرعەشە) زانایەکی شەریعەت زان بووە، ساڵی ٥٦٨ك کتێبی (ترتیب الأقسام)ی داناوە، لە ٥٧٦ك – ١١٨٠ ز لە ژیاندا بوو.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ٩/٢٢١.

٢. كشف الظنون ١/٣٩٥.
٣. هدية العارفين ٢/٩٧.

## محەممەد حەسەن نابینا (١٣٠٦)

ناوی محەممەدە، کوڕی حەسەنی (هەولێری)یە، نازناوی (ئەبو عبداللە)یە، لە قاهیرە دابەزیوە، هەرچەند لە چاوان نابینا بووە، بەڵام زیرەك و بە توانا بووە، لە (قاهیرە) دەرسی داوە، سەرۆکی قورئان خوێنەکان بووە، ساڵی ٧٠٠ك – ١٣٠٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأريخ أربيل ٢/٣٧.

## محەممەد حەسەن هەزار مەردی (ابن الحاج) (١٣٠٧)

ناوی محەممەدە، کوڕی حاجی حەسەنە، ساڵی ١١١١ك – ١٦٩٩ز لە گوندی (سنجۆی) ناحیەی ئالان هاتەدنیا، هەر لەو ساڵەدا باوکی لە حەج هاتەوە، بۆیە ناوبرا بە: (ابن الحاج).

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن، بەشێوەی فەقێیانی کوردستان، لەو شوێن بۆ ئەو شوێن، لە خزمەت ئەو مامۆستا، بۆلای ئەم مامۆستا، تا خوێندنەکەی بردەسەر، خوای گەورە بەهرەیێکی وای پێدا، لە هەموو زانستەکان شارەزا بوو، بەتایبەت لە قورئانی پیرۆز، بۆیە ناوبرابوو بە: (قاریء).

مەلایەتی: کۆتایی بە خوێندن هینا، گەڕاوە (سنجۆی) مەردەسەی دانا، ناوبانگی مەلایەتی ڕۆیشت، فەقێیان ڕوویان تێکرد، مەلا عبداللە ی بێتووشی و شێخ مەعروفی نۆدەهی لە فەقێیانی ئەو زاتەن، دوایی باری کرد، بۆ (قەلاچوالان)، لەوێ چووە (جەیشان)، لەوێ چووە (هەزارمەرد) نزیك (سلێمانی).

پلەی مەلایەتی: مامۆستا عبداللە بێتوشی هۆنراوەی (کفایة)ی دانا، پێشکەشی بە شێخ ئەحمەدی ئەحسائی کرد، ئەویش پرسیاری (ابن الحاج)ی لێکرد چۆنە ؟ بێتوشی وەڵامی داوە: {ئەگەر من لە تاریك بم ئەو لە ڕۆناکی یە، ئەگەر من نابینابم، ئەو چاو و

دڵی بینایە، ئەگەر من ئەستێرەکی بچووك بم، ئەو ڕۆژی ڕۆنایە}، دوای ئەو شایێدییە مەزنە، وەسفی منی پێناوێ.

کۆچی دوایی: مێژوونووسەکان دەربارەی کۆچی دوایی (ابن الحاج) نووسینەکانیان یەکدیگر نیە، هەروەها شوێنەکەشی دیار ناکەن، تەنیا سەیدا حەمەدی سەلەفی نەبی دەڵی: {فارسەکان هێرشەکی دڕندانەیان هینا سەر ناوچەکەی مامۆستای لێ دەژی، ئەویش نەحەواوە، ئاوارە بوو، بۆ گوندی (زنتە) نزیك (ئاکرە) لەوێ ساڵی ١١٨٩ ك – ١٧٧٥ز کۆچی دوایی کرد}، هەروەها لە کۆتایی (رفع الخفا)ی دانراوی (ابن الحاج) چاپکراوی حەمەدی سەلەفی نووسراوە: {عبدالله ی کوڕی مەلا یوسف تەواوی کرد، لەو ساڵە (ابن الحاج) کۆچی دوای کرد، کە ساڵی ١١٨٩ك یە}، منیش ئەو مێژووەم لەلا ڕاستە.

دوای خۆی مەلا ئەحمەدی کوڕی لەجیێ دانیشت، ئەویش کوڕێکی هەبوو ناوی عبدالعزیز، ساڵی ١٢٤٤ك – ١٨٢٨ز حاشیەی عبدالحکیمی (مطول)ی نووسییەوە.

دانراوەکانی:

١. رفع الخفا بشرح ذات الشفا: نووسەخەکمان لەلایە، خەتی مەلا طاهیری قوشاغلووە، تەواو نەکرابوو تا باسی ئیمامی عومەر (خ) نووسرابوو، نووسەری ئەو مێژووەش ساڵی ١٣٩١ك – ١٩٧١ز تەواوی کرد لە (بەحرکە)، کەواتە: بە دوو طاهیران تەواوکرا، تاهیری یەکەم مامۆستای قوشاغلوە، دووەمیش منم.

٢. حاشیة علی السیوطی – البهجة المرضیة – دانەکی کۆپیمان لەلایە، لەسەر خەتی عبدالعزیز غەمگین وەرگیراوە، ساڵی ١٢٧٨ك – ١٨٦١ز نووسراوە.

٣. ایقاد الضرام علی من لم یوقع طلاق العوام: دەستنووسمان هەیە.

٤. نظم المحاسن الغرر: دەستنووسمان هەیە، ئەحمەد محەمەد شەرحی کردووە، ناوینـاوە (حقائق دقائق الدرر في شرح نظم محاسن الغرر)

٥. شرح نظم المحاسن: باس دەکەن، بەڵام نەمدیتووە.

٦. منظومة المحذوفات: دکتۆر محەممەد گەزنەیی لـە (میصـر) چـاپی کـردووە هـەروەها شەرحی لەسەر نووسیوە.

٧. رسالة المقصور والممدود: چاپ کراوە

٨. مەهدی نامە: هۆنراوەیە، محەممەد عەلی قەرەداغی، ساڵی ١٩٧٥ز شـەرحی لەسـەر نووسیوە، چاپی کردووە.

٩. رسـالة الإکـراه الحسـي: نووسـخەکمان هەیـە عـەلی عەبباسـی ئاغجەلـەری لـە (هەزارمەرد) نووسیتەوە.

١٠. إزالـة الإلبـاس عـن مسـائل المکـرَه والنـاسِ: سـاڵی ١١٨٧ك – ١٧٧٣ز تـەواوی کردووە، نووسخەکی دەستنووسمان هەیە.

١١. رسالة الحلال والحرام: نووسخەکی دەستنووسمان هەیە.

١٢. رسالة فيما يجب للأزواج على الزوجات والزوجات على الأزواج، ساڵی ١١٧٩ك لە (موصل) تەواوی کردووە، نووسخەکی کۆپیمان هەیە.

١٣. رسالة في نکاح المتعة: پێشکەشی بە ئەحمەد پاشا کردووە.

١٤. رسالة في العقائد.

١٥. کتاب في اللغة.

١٦. فتاوى.

١٧. شرح القصيدة الهمزية.

١٨. تحفة الخلان لإشحاذ الأذهان في الألغاز النحوية.

١٩. حاشية على قصيدة البردة.

٢٠. حاشية على فتح المبين.

٢١. حاشية على ديباجة التحفة: نووسخەکی دەستنووسمان لەلایە.

٢٢. حاشية على حاشية عصام الدين على الجامي.

٢٣. حاشية على مبحث الخلع والطلاق في التحفة.

٢٤. چەند شیعری کوردی: نووسەری هاوچەرخ بەڕێز محەممەد عەلی قەرەداغی دوو شیعری لە کەشکۆڵی کەلەپوری ئەدەبی کوردی بەلاوکردوتەوە، یەکەم دەست پێ دەکا، بە:

یارەسول الله ئەمانەت بێ، ئەمانەت صەد ئەمان

ئەو دەمەی قابیض کە دێ، بۆ قەبضی ڕوح و نەزعی جان

دووەم دەست پێ دەکا، بە:

ئەو موقتەدای خاص و عام، بەشماندە لەو (دار السلام)

باعیس بە لوطفت دڵنیام، هاوار لەخۆم چەند رووسیام

سەرچاوەکان:


١. رفع الخفا شرح ذات الشفا / پێشەکی.

٢. هدية العارفين ٦/٣٣٥.

٣. البيتوشي ١٧.

٤. إيضاح المكنون ٣/٥٧٨ – ٥٧٩.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٩٨ – ٤٩٩.

٦. معجم المؤلفين ٩/١٨٥.

٧. دەقەکانی ئەدەبی کوردی ٧٢ – ٨٠.

٨. مێژووی ئەدەبی کوردی ٣/٣٢ – ٣٦.

٩. تأريخ السليمانية ٢٨٢.

١٠. رسالة الدكتوراه محمد الصابر الهموندي ١/٢٦،

١١. معجم أعلام الكورد ٦٠٣.

١٢. کەشکۆڵی کەلەپوری ئەدەبی کوردی ١/٣١ – ٣٥.

١٣. بوژاندنەوە ١/٣١ – ٣٢١، ٣/٦١ – ٦٧، ٥/٣٥١ – ٣٥٢، ٦/٦١.

## محەممەد حوسێن ئورمەوی (١٣٠٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی حوسێنی کوڕی عبداللە یە، نازناوی (تاجەدینە)، خەڵکی شاری (ئورمییە – ورمێ) یە، زانایەکی شەرع زان و ئوصول زان بووە، کرایتە (قازی)، کتێبی (حاصل المحصول)ی داناوە، شەرحی مەحصولی ئیمامی ڕازییە لە بابەتی (ئوصول الفقه)، لە مانگی (محرم)ی ساڵی ٦٥٦ك – ١٢٥٨ز لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٩/٢٤٤.

٢. كشف الظنون ٢/١٦١٥.

٣. هدية العارفين ٢/١٢٦.

## محەممەد حوسێن ئورمەوی (١٣٠٩)

ناوی محەممەدە، نازناوی ئەبوبەکرە، کوڕی حوسێنی کوڕی عومەرە، خەڵکی (ورمێ)یە، شەرع زان و ڕەوشت چاك بووە، لە مەدەرەسەی (نظامیە)ی بەغدا دەرسی شەریعەتی داوە، ساڵی ٥٣٦ك – ١١٤١ ز لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الأنساب ١/١١٨.

## محەممەد حوسێن حەڕانی (١٣١٠)

ناوی محەممەدە، کوڕی حوسێنی کوڕی عەلی کوڕی سولەیمانی کوڕی ئیبراهیمی حەڕانیە، نازناوی (ئەبوسولەیمانە)، لە (حەڕان) هاتەدنیا، بۆ خوێندن چوویتە (موصل) و (شام) و (میصر)، لە (بەغدا) دەرسی فەموودەی داوە، ئیمامی دارەقوطنی مەتحی کردووە، ماوەك لە (نوسەیبین) دانیشتووە، ساڵی ٣٥٧ك – ٩٦٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: المنتظم ٨/٣٥٧.

## محەممەد حوسێن حەریری (١٣١١)

ناوی محەممەدە، کوڕی حوسێنە، خەڵکی (حەریرە) یەك بووە لە مەلایە چاکەکانی سەردەمی خۆی، دایکی کچی مەلا ئەحمەدی حەیدەر ئەفەندی ماوەرانی بوو، بۆیە ناودەبردرا بە (خەواهیرزادە)، واتە: خوارزا، (شێخ ئیبراهیم فەسیح) لە (عنوان المجد) دەڵێ: {بنەماڵەی ئێمە تەنیا ئەو کچەیان داوە بە مەلا حوسێن، دەنا ژنیان قەت نەداوە بە خەڵکی بیانی، کە خزمیان نەبی، جگە لەوە}، مامۆستا دەرسی لەلای خاڵی خۆی حەیدەری کوڕی ئەحمەد خوێندووە، بوویتە مەلایەکی چاك.

دانراوەکانی: چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. حاشية على عصام الدين الوضع: نوسخەکی کۆپیمان هەیە، وەرگیراوە لەسەر دەستخەتێك، ساڵی ١٢١٦ك – ١٨٠١ز لە (زیارەت) نووسراوە.

٢. حاشية على مير أبي الفتح القرەباغي في الآداب: نوسخەکی دەستخەتی مصطەفا صوفیمان، لەلایە ساڵی ١٢٤١ك – ١٨٢٥ز نووسراوە.

٣. حاشية على جهة الوحدة الفنارية.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٢٩.

٢. بوژاندنەوەی مێژوی زانایانی کورد ٦/٢٤٥ – ٢٤٩.

## محەممەد حوسێن قزلجی (١٣١٢)

ناوی محەممەدە، کووڕی مەلا حوسێنی کوڕی مەلا عەلی قزلجی یە، لە مانگی (محرم)ی ساڵی ١٣١٣ك – ١٨٩٥ز لە شاری (مەهاباد) هاتووتەدینا، لە خزمەت باوکی خوێندنی تەواوکرد، کرا مودەرریس لە مەدرەسەی (بایەزید) لە مەهاباد، ویستی دەستووری خوێندنی ئاینی ڕێکبێخی بەلام بۆی نەسورا، ئێرانی بە جێ هێشت هاتە (عێراق)، ساڵی ١٩٣٠ز بۆ خوێندن چووە (جامع الأزهر) لە قاهیرە، لەوێ قورئانی پیرۆزی هەموو لەبەرکرد، دوایی چووە (شام)، پاشان گەڕاوە (عێراق)، بە ڕێ کەت بۆ

(ئێران)، گەیشتە (کەرکوك) پێیان گۆت حکومەتی ئێران نەرازییە لە گەڕانەوەت، ڕێگـات پێنادا، ناچار ڕووی کردە (بیارە) سێ مـانگ لـەلای شـێخ عەلائـەدینی نەقشـبەندی مـاوە زۆری ڕێزی لێنا، دوایی بووە مەلا لە گوندی (سەراو) ناوچەی (ئـالان)، سـاڵی ١٩٣١ز شێخ عەلائەدین چووە (بەغدا) لە تەکیەی خالیدییە دابەزی، مامۆستاش بە دووی داچـوو، ماوەك لە تەکیە ماوە، هەر لەو سەفەرە، کرا مودەررریس لـە مەدرەسـەی حوسـێن پاشـا، پێش نوێژ لە مزگەوتی بیشری حافی لە گەڕەکی (ئەعزەمییە)، پاشان کرا مـودەرریس لـە مەدرەسەی شێخ عبدالقادری گەیلانی.

پلەی مەلایەتی: زانایەکی بەرز بوو، ڕێـزی خـەڵکی دەگـرت، زیـرەك بـوو، ئەدیب و مێژووناس بووە، جگە لە زمانی خۆی عەرەبی و فارسـی و تـورکی و فەڕەنسـی زانیوە، زانستەکانی شەوقیدا لە ئێران و عێراق و میصر.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا ئەحمەدی تورجانی، سەید عەلائـەدینی (سـجادی)، مەلا عبدالهادی ئەفخەم، مەلا عبداللە ی فەرهادی، دکتۆر محەمەد شەریف.

دانراوەکانی: (التعریف بمساجد السلیمانیة) و (التعلیق علی تفسیر الزمخشـري) و (چل فەرموودەی پێغەمبەر) (درودی خوای لێ بێ). لە ١٤/٩/١٩٥٩ز کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی هەبوو، ناو مەلا ئەحمەد تورجانی.

سەرچاوەکان:

١. ژیناوەری زانایانی کورد ٢٥٦ – ٢٦٢.

٢. أعلام کورد العراق ٧٢٢ – ٧٢٥.

٣. تأریخ فرهنگ وادب مکریان ٢٦٥ – ٢٨٨.

٤. کاروان ١٩٨٨/٦٦ز.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٥٢٢ – ٥٢٣.

### محەممەد حوسێن مەخموری (١٣١٣)

ناوی محەممەدە، کوڕی حوسێنی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عبدالقادرە، عەشیرەتی (لەك)ە، ساڵی ١٨٩٠ز لە گوندی (گۆمەشین) هاتەدنیا، لەو گوندە دەستی کرد بە خوێندن، لە قۆناغی موستەعیدی چووە (بالیسان) لای مەلا شێخ طاها، دوایی چووە (شەقڵاوە) لای مەلا طاها، دوایی چووە (کۆیە) لای جەنابی مەلا محەممەدی جەلی، پاشان هاتە (هەولێر) لای شێخ مصطەفای نەقشبەندی، ماوە لە خزمەتی تا ئیجازەی وەرگرت.

دەستی کرد بە مەلایەتی و دەرسدانەوە، لەو شوێنانە: (ئاودەلۆك)، (جدیدەی لەك)، (دووشیوانی لەك)، (تلیان) لە ناوچەی کەرکوك. چەند کورتە حاشیەی لەسەر شەرحی عەقائیدی تەفتازانی هەیە، لە کۆتاییدا نازناوی (کەمالی) نووسیوە، لەبەر ئەوەی مریدی کەمالەدین شێخ مصطەفایە، ئیبراهیمی کوڕی دەڵێ: بابم نامیلکەکی فەرائیزی هەیە.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

### محەممەد حەمەد بەندەنیجی (١٣١٤)

ناوی محەممەدە، کوڕی حەمەدی کوڕی خەلەفی کوڕی حوسێنی کوڕی ئەبوبەکری بەندەنیجی یە، ناسراوە بە (حنفش)، زانایەکی مەزن بووە، دەرسی لەلای مامۆستا (متولی) خوێندووە، سەمعانی و ئیبن عەساکیر فەقێیانی ئەو زاتەن، ساڵی ٥٣٨ك – ١١٤٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعیة الکبری ٣/٣٦٠.

٢. الأنساب ١/٤٢٣.

### محەممەد حەمەد حەڕانی (١٣١٥)

ناوی محەممەدە، کوڕی حەمەدی کوڕی عبدالمنعمی کوڕی حەمەدی کوڕی مەنیعی کوڕی ئەبوفەتحی (حەڕانی) توجارە، ساڵی ٦٨١ك – ١٢٨٢ز هاتەدنیا، خەریکی

خوێندنی فەرمووده بووه، لە کۆڕی دەرسی چەند زانایان ئامادە بووه، ئیجازەی وەرگرتووه، ساڵی ٧٧٢ك – ١٣٧٠ز کۆچی دوایی کردووه.

سەرچاوه: الدرر الكامنة ٣/٤٣١.

**محەممەد حەمەد فورجە (١٣١٦)**

ناوی محەممەده، کوڕی حەمەدی کوڕی فورجەیه، ناسراوه بە (ابن فورجە)، لە مانگی ذی الحجەی ساڵی ٣٨٠ك – ٩٩٠ز لە (نەهاوەند) هاتەدنیا، لە (بروجرد) دانیشتووه، زانایەکی ڕێزمان زان و ڕۆشنبیر و نووسەر و شاعیر بووه.

چەند دانراوی هەیه، لەوانە: (التجني على ابن جني) و (الفتح على ابي الفتح).

نمونەی شیعری:

اما ترون الى االأصداغ كيف جرى     لها نسيم فوافت خده قدرا

كانما مد ذنجي أنامله     يريد قبضا على جمر فما قدرا

کۆچی دوایی: ساڵی ٤٤٤ك – ١٠٥٢ز لە شاری (ڕەی) کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. فوات الوفيات ٣/٣٤٤ – ٣٤٥.

٢. كشف الظنون ١/٨١٠.

٣. معجم المؤلفين ٩/٢٦٩. جیاوازی لە مێژووی لە دایك بوون و کۆچی هەیه.

٤. هدية العارفين ٢/٧٢– ٧٣.

**محەممەد حەمزە عەینتابی (١٣١٧)**

ناوی محەممەده، کوڕی حەمزەیه، خەڵکی (عەینتاب)ە، پاشان چوویته (سیواس) دوایی لە (طەرابلس) نیشتەجێ بووه، زانیاری لە تەفسیر و کەلام هەبووه، حاشیەی لەسەر (بەیزاوی) و (خەیالی) عەقائید هەیه، ساڵی ١١١١ك – ١٦٩٩ز کۆچی دوایی کردووه.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٩/٢٧٢.

٢. هدية العارفين ٢/٣٠٧.
٣. إيضاح المكنون ١/١٤١.
٤. كشف الظنون ٢/١١٤٨.

## محەممەد حەوێز هەولێری (١٣١٨)

مامۆستا محەممەد ئەفەندی، کوڕی حاجی حەوێزی کوڕی مامەیە، دەوری ساڵی ١٢٩٣ك – ١٨٧٦ز لە (هەولێر) هاتووتەدنیا، پاش تەواوکردنی خوێندنی، چووە (ئەستەمبۆڵ) لەوێ هاتە (موصل)، دوایی کرا قازی (سەردەشت)، پاشان گەڕاوە (تورکیا)، دوای گەڕاوە (هەولێر)، دووبارە گەڕاوە (تورکیا)، لەوێ ژنی هێنا، نیشتەجێ بوو، تا دەوری ساڵی ١٣٣٧ك – ١٩١٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٢٤٣.

## محەممەد حەیدەر پیرەدین (١٣١٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی حەیدەر پیرەدینی کوڕی ئیبراهیم بورهانەدینی کوڕی عەلی عەلائەدینی کوڕی صەدرەدینی کوڕی (صفی الدین)ی ئیسحاقە، لە خزمەت باوکی خوێندنی تەواوکردووە، لە تەصەووف دەستی باڵا بووە، لە (کەلام) بە توانا بووە، حاشیەی لەسەر قورسترین کتێبی ئەو بابەتە – کە (اثبات الواجب)ی دەوانی یە – هەیە، ئەو زاتە خەڵکی (حوسێن ئابادی ئێرانە).

هۆی ئاوارەبوونی بۆ عێراق: ساڵی ٩٠٧ك – ١٥٠١ز شا ئیسماعیلی صەفەوی شۆڕشی دژ بە شا (ئەلوەند) لە (ئێران) سازدا، تێدا سەرکەوت، ئێرانی داگیرکرد، حوکمی شیعەی لە وڵاتەکە چەسپاند، لەبەر ئەوەی زانایەکانی سوننە، سەریان بۆ نوی نەکرد، ئەوپەڕی بێ ویژدانی لەگەڵ بەکارهێنان، کوشتن و تاڵان و سووتان، ئێسکی مەرقەدە پیرۆزەکانی دەرهێنا و سووتاندی، هەرچەند شا ئیسماعیل خزمی پشتی مامۆستا بوو، چونکە شا کوڕی حەیدەری کوڕی جونەیدی کوڕی صەدرەدینی کوڕی (صفی الدین)ی ئیسحاقە، واتە: لە (صدر الدین) دەگەنەوە یەك، بەڵام مامۆستا نەیتوانی

لە ئێران بمێنێ ڕووی کردە کوردستانی (عێراق)، لە (حەریر) نیشتەجێ بوو، مەلازادەکانی (باشور) ژنیان پێدا، میری سۆران ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتی گرت، مەدرەسەی فەقێیانی بۆ دانا، دەستی کرد بە دەرسدانەوە، لە دوورەوە فەقێ دەهاتن، دەستەك دەردەچوون ئیجازەی پێ دەدان، چینی تر دەهاتن ئامادە دەبوون، ماوە لەوێ تا ساڵی ٩٥٠ك – ١٥٤٣ز کۆچی دوایی کرد.

شێخ ئیبراهیم فەسیح دەڵێ: {(صفی الدین)ی باپیرمان لە خەودا دیتی، لە دەستی ڕاستەی نور شەوقیدا، سەگەك لە ناو دەستی چەپەی دابوو}، پرسیاری لە زانایانی ئەو سەردەمی کرد، بەم جۆرە مانایان بۆ لێداوە: (لە نەتەوەی تو چەند زانای ئاینی پەیدا دەبن، وڵات ئاوەدان دەکەنەوە، هەروەها پیاوخراپەکیش لەو نەتەوە پەیا دەبی و وڵات پیس دەکا)، فەرموودەکەیان هاتەجێ، چەند زانا و دانای حەیدەری ماوەران لەو بنەماڵە پەیدابوون، کوردستان و عەرەبوستانیان پڕکرد لە زانست و زانیاری، سێ صەد و پەنجا ساڵ بێ پسانەوە لە خزمەت ئەو ئایینە بوون، ڕستەی ئیجازەنامەی مەلایانی کوردستان دەچیتە لای ئەوان، هەروەها شا ئیسماعیل صەفەوی لەو نەتەوە پەیدابوو، کە هەموو توانای خۆی خەرج کرد، بۆ خراپە و خراپەکاری و ناهەمواری.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٩٣ – ٤٩٧.
٢. علماء ومدارس في أربيل ٣٩.
٣. بنەماڵەی زانیاران ٢٢٣ – ٢٢٥.
٤. کاروان ١٩٩٠/٨٧ز.
٥. عنوان المجد ٨٨ – ١١٦ – ١١٧ – ١٢٦ – ١٢٧.

## محەممەد خالید حەڕانی (١٣٢٠)

ناوی محەممەدە کوڕی خالیدی کوڕی ئیبراهیمی (حەڕانی)یە، دەوری ساڵی ٦٥٠ك – ١٢٥٢ز لەو شارە هاتەدنیا، بۆ خوێندن چووە (دیمشق) لەوێ کرا موفتی و

مودەرریس، زانایەکی شەرع زان و خێرخواز بوو، حەزی لە تێکەڵایەتی بوو، زەنگین بوو، بازرگانی دەکرد، لەگەڵ تەقیەدین ئیبن تەیمییە (داکبرا – برای دایکی) بوو، لە ڕۆژی چوارشەمە ٨ی جیمادی دووەم، ساڵی ٧١٧ك – ١٣١٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٦/٤٥ – ٤٣.

## محەممەد خضر بن تەیمییە (١٣٢١)

ناوی محەممەدە، کوڕی خضری کوڕی محەممەدی کوڕی خضری کوڕی عەلی کوڕی عبداللە یە، خەڵکی (حەڕان)ە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، ناسراوە بە (بن تەیمییە) لەبەرئەوەی یەك لە باوك و باپیرانی چوویتە حەج، بە شاری (تەیما)دا چووە، لەو کاتە خێزانی زگی هەبووە، لەوێ کیژۆرەکیان دیتیە لە بن خێوەت هاتەدەر، قشت و جوان بووە، کە گەڕاینەوە (حەڕان) خێزانەکەی کچەکی بووە، باوکی گۆتیق: {چەند قشتە دەڵێی کیژۆڵەکەی (تەیما)یە، لەو ڕۆژەوە منداڵەکە ناوبردرا، بە: (تەیمیە) نەوەکانیشی بە: (ابن تیمیە)}.

مامۆستا ساڵی ٥٤٢ك – ١٤٧ز لە (حەڕان) هاتوتەدنیا، هەر لەوێ، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (بەغدا) تەفسیر و فەرموودە و شەریعەتی خوێند، گەڕاوە (حەڕان)، مەدرەسەی تایبەتی بۆ خۆی دروست کرد، ساڵی ٥٨٨ك – ١١٩٢ز دەستی کرد بە دەرسدانەوە، ساڵی ٦٠٤ك – ١٢٠٧ز چووە حەج، لە گەڕانەوە لایدا (بەغدا) لەوێ وەعزیدا، پاشان هاتە (هەولێر)، گەڕاوە (حەڕان)، ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان، ساڵی ٦٢٢ك – ١٢٢٥ز کۆچی دوای کرد.

مامۆستا زاتەکی خواناس و دڵپاك بوو، بەردەوام ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد، لە خزمەت ئایین بوو، چەند کەراماتی لێ دەگێڕنەوە.

دانراوەکانی: (التفسير الكبير)، (تلخيص المطلب في تلخيص المذهب)، (شرح الهداية)، (ترغيب القاصد في تقريب المقاصد)، (الموضح في الفرائض)، (بلغة الساغب وبغية الراغب)( ديوان الخطب).

سەرچاوەکان:

١. الأعلام ٢/٧٨ /٦/٣٤٦.
٢. معجم أعلام الكورد ٥٩٤ – ٥٩٥.
٣. هدية العارفين ٦/١١١.
٤. سير أعلام البنلاء ١٣/١٥٣ – ١٥٤.
٥. شذرات الذهب ٥/١٠٢ – ١٠٣.
٦. معجم المؤلفين ٩/٢٨٠ – ٢٨١.
٧. البداية والنهاية ١٣/١١١.
٨. طبقات المفسرين ٢/١٣٩.
٩. وفيات الأعيان ٤/٢٠.
١٠. تأريخ أربيل ١/٩٦ – ٣٥٠.
١١. إيضاح المكنون ١/١٩٣.
١٢. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/١٥١ – ١٦٢.

**محەممەد خەلیل کوردی (١٣٢٢)**

ناوی محەممەدە، کوڕی خەلیلی کوڕی فارسی کوردییە، لە (دیمشق) دانیشتووە، چوویتە (بەعلەبەك) لەلای چەند زانایان شەریعەتی خوێندووە، خۆشی دەرسی بە (ابن عساکر) و چەند زانایان داوە، لە مانگی ذي الحجەی ساڵی ٥٤٩ك – ١١٥٥ز لە (بەعلەبەك) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: سیر أعلام النبلاء ١٢/١٦١.

**محەممەد خەلیل هەولێری (١٣٢٣)**

ناوی محەممەدە، کوڕی خەلیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی شاهەنشای کوڕی حەبیبی کوڕی سەروەری کوڕی عەلی کوڕی شادی کوڕی خەلیلی کوڕی عبدالله ی صۆفی (هەولێری)یە، ساڵی ٦٦٥ك – ١٢٦٦ز هاتەدنیا، دەرسی فەرموودەی لەلای

غـازی حـەلاوی و ئەبوبـەکری مەقدیسـی خوێنـدووە، دوایـی خـۆی دەرسـی داوە، زۆر خەریکی خوێندنی قورئانی پیرۆز بووە، لـە مـانگی ڕەمـەزانی سـاڵی ٧٣٢ك – ١٣٣٢ز کۆچی دوای کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٠

٢. الإكليل في محاسن أربيل ١٦٧.

٣. الدرر الكامنة ٣/٤٣٣.

## محەممەد داود دینەوەری (١٣٢٤)

ناوی محەممەدە، نازناوی ئەبوبەکرە، کوڕی داودە، ناسراوە بە صۆفی، خـەڵکی (دینەوەر)ە، ماوەك لە (بەغدا)ی خوێند، دوایی چووە (دیمشق) لای ئەبوبـەکری موجاهیـد قورئانی پیرۆزی خوێند و لەبەری کرد، دەرسی لـەلای چـەند زانایـان خوێنـد، زانایـەکی بەڕێز و حورمەت بوو، یەك بوو لە گەورە شێخەکانی سەردەمی خۆی، لە مانگی جیمادی یەکەم، ساڵی ٣٦٠ك – ٩٧١ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ٢/٥٤٨ – ٥٤٩.

٢. اللباب ١/٥٠٥.

٣. البداية والنهاية ١١/٢٨٨.

## محەممەد داود کوردی (١٣٢٥)

ناوی محەممەدە، کوڕی داودی کوڕی محەممەدی شافیعی یـە، سـاڵی ٨٤٥ك – ١٤٤١ز لە جزیرەی بۆتان هاتووتەدنیا، لەوێ پەروەردە بووە، پاشان چوویتە (ئازربێجان) کتێبانی (حاوی) و (عەقائید)ی نەسەفی و (عەروز)ی ئەندەلسی و (شەمسییە) و (کافیـە) و (تەصریف)ی عزي لەبەرکردن، گەڕاوە خزمەت باوکی زانسـتە ئەقڵییـەکانی تـەواوکرد، ساڵی ٨٩٠ك – ١٤٨٥ز چووە (شام)، لە ٨٩٥ك چـووە (حـەج)، لـە گەڕانـەوە هاتـە

(حەما) لەوێ نیشتەجێ بوو، مامۆستا زانایەکی بە دین و دوور لە دنیا بوو، خواپەرست بوو، خەریکی بەرۆژی بوون و دەرسدانەوە بوو.

چەند دانراوی هەنە، لەوانە:

١. تحفة ذوي الارب في إشكالات حلب.

٢. التحفة المرضية في المسائل الشامية.

٣. تقدمة العاجل لذخيرة الآجل.

٤. حاشية على شرح جمع الجوامع.

٥. غاية المرام في رجال البخاري إلى سيد الأنام.

٦. رسالة في جواب مسألة (لا اله الا الله) التي أوردها التفتازاني في التلويح.

ساڵی ٩٢٥ك – ١٥١٩ز کۆچی دوایی کرد، کورێکی هەبوو بەناوی خۆی محەممەد: جێگری قازی بوو لە (دیمشق)، دوو ساڵ پێش باوکی کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. کشف الظنون ٢/١١٩٣.

٢. هدية العارفين ٦/٢٢٨.

٣. معجم المؤلفين ٩/٢٩٧.

٤. معجم أعلام الكورد ٦٠٣.

٥. شذرات الذهب ٨/١٢٦ – ١٣٨.

## محەممەد داود گەرموی (١٣٢٦)

ناوی محەممەدە، کوڕی داودی کوڕی محەممەدە، خەڵکی گوندی (گەرەوان)ە، سەر بە (ڕواندز). ئیجازەی مەلایەتی لە مەلا ئەحمەدی حەیدەر ئەفەندی ماوەرانی وەرگرتووە، هەروەها ئیجازەی لەو بەرێزانەش وەرگرتووە: شێخ ئیبراهیم حەسەن گۆرانی، شێخ ئەحمەد محەممەد نەخلی، شێخ یونسی میصری، مەلا محەممەدی حەیاتی سندی مەدەنی.

مامۆستا ساڵی ١١٢٨ ك مەلا بوو لە گوندی (تەلە) لـە ناوچـەی (حـەریر)، ساڵی ١١٤١ك – ١٧٢٨ز چووە سەفەری (حەج)، دوایی چووە (شام) لەوێ ئیجـازەی (حزب النووی) لە شێخ عبدالكریم شەرباتی وەرگرت، ساڵی ١١٤٢ك ئیجازەنامەكـەی بە دەستی خۆی نووسییەوە، لەو كاتە مێوانی عبدالقادر ئاغا بـوو لـە (حەلـەب)، سـاڵانی ١١٤٣ و ١١٤٤ و ١١٤٥ك لە حەلەب و مەككە و مەدینە چەند دوعای شێخ محیەدینی عەرەبی و ئیمامی نەوەوی نووسییەوە.

ساڵی ١١٥١ك ئیجـازەی بـە مـەلا ئیلیاسـی گـۆرانی دا، سـاڵی ١١٥٢ ك گەڕاوە ناوچەی (حەریر)، بەڕێز محەممەد عەلی قەرەداغی دەڵـێ: {ئـەو مامۆسـتا محەممـەدە باوكی مەلا ئەحمەدی گەرەوییە، كە بەسەر (سعد الله)ی گچـكە ڕۆیشـتووە، وەملـملانـەی درێژی لەگەڵ مەلا حامیدی سوسەیی كردووە}.

سەرچاوەكان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی كورد ٧/١٣ – ٢٥.

٢. خۆری ئیسلام ٢٤/٢٠٠٤ز.

## محەممەد داود یەك دەست (١٣٢٧)

ناوی محەممەدە كـوڕی داودە، عەشـیرەتی (برادۆسـت)ە، سـاڵی ١٨٩٥ز لـە گوندی (شۆشـنە) هاتووتـەدنیا، لـەلای بـاوكی قورئـانی پـیرۆز و كتێبـە سـەرەتاییەكانی تەواوكرد، لە قۆناغی موستەعیدی چووە (بەحركە) لای مەلا عوسمـانی شـەوەكی، پاشـان چووە (كەركوك) لای مەلا عەلی حیكمەت ئەفەندی و، مەلا ڕەزای واعیز، دوایـی چـووە (قازیخانە) لای مەلا عەلی ڕواندزی، چووە (شەقڵاوە) فەلەكیاتی لەلای مەلا طاها خوێنـد، چووە (ڕواندز) لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی خـەیلانی، مـاوە تـا ئیجـازەی وەرگـرت. لـەو ئیجازەیە گـەردی و خۆشـناو و بالـەك و شـێروانی و سورچـی و برادۆسـت ئامـادەبون، هەریەك داوای دەكرد مامۆستا ببێتە مەلای ئەوان، بەڵام ئەو تەنیا (شۆشنە)ی هەڵبژارد كـە

گوندەکەی خۆیان بوو، لەگەڵ خزمەکان گەڕاوە ئەوێ، بووە مەلا مەدرەسەی فەقێیانی دانا، ناوبانگی دەرکرد، لە دوورەوە دەهاتنە لای بۆ وەرگرتنی زانیاری.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالله ی خواروکی، مەلا حاجی پیرانی، مەلا عەلی مووشی.

هەوڵی بۆ خوێندن: مامۆستا زۆر خۆی ماندوو دەکرد، بەردەوام لە خوێندن و تەماشاکردنی کتێبان بوو، بابم (خ) دەیگۆ: {لەگەڵ فەقێیان دەچووە خوێندن، کە ماندوو دەبوون دەهاتنەوە بۆ نووستن، مەلا محەممەد جاجمەکەی ڕادەکێشا سەر سەر و چاوی، وایاندەزانی کەوا دەنوی، بەڵام لەوکاتەش هەر دەوری دەکردەوە، خۆشی لەخۆی ڕازی نەبوو، پرسیاریان لێ دەکرد: چیت لەبەرە؟ وەڵامی دەداوە: پیچەکی موغنیم لەبەرە، واتە: کەمەکم لە موغنی لەبیب لەبەرە، ئەو کتێبە زۆرە و قورسەی لەبەر بوو، هێشتا بە کەمی دەزانی!}.

خوڕەوشتی: مامۆستا لە شەریعەت و ئەستێرەناسی دەستی باڵا بوو، پیاوەکی ڕەشید بوو غەمی برادەرانی زۆر لەبەربوو، خەریکی پێکهێنانەوە بوو، لە گوندەکەی خۆیان کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی پیر خضر و پیر بالول نزیك گوندی (لۆلان) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

### محەممەد دەدە ئەرضرۆمی (١٣٢٨)

ناوی محەممەد دەدەیە، کوڕی مصطفای کوڕی حەبیبی ئەرزرۆمی یە، شەرع زانەکی حەنەفی بووە، ساڵی ١١٤٦ك – ١٧٣٣ز کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی: (رسالة في الفقه)، (السياسة والأحكام)، (الوسيلة العظمى في شمائل المصطفى خير الوري)، (المدحة الكبرى في الكلام القديم في حق المصطفى صلى الله عليه وسلم).

سەرچاوەکان:
١. معجم المؤلفين ٩/٢٩٨ /١٢/٢٦.
٢. هدية العارفين ٢/٣٢١.
٣. إيضاح المكنون ٢/٤٥٤ – ٧٠٧.

### محەممەد دەشم جاگیر (١٣٢٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی دەشمی کوردییە، نازناوی (جاگیر) بووە، واتە: (جێگر – بریکار)، مەزهەبی حەنبەلی بوە، ژنی نەهیناوە، لە گوندی (ڕازان) نزیك شاری (سامراء) دانیشتووە و دەرسی داوە، زاتەکی بە دین بووە، کەراماتی لێ دەگێڕنەوە، ساڵی ٥٩٠ك – ١١٩٣ز کۆچی دوایی کرد، ئەحمەدی برای جێگری بوو، دوای ئەحمەد، غەرسی کوڕی دوای غەرس، محەممەدی کوڕی.

سەرچاوەکان:
١. شذرات الذهب ٤/٣٠٥ – ٣٠٦.
٢. سير أعلام النبلاء ١٢/٢٦٠.

### محەممەد دهۆکی (١٣٣٠)

مامۆستا مەلا محەممەد، ناسراوە بە: (حاجی مەلا محەممەد ئیمام)، زانایەکی بەرز بووە، بەتایبەت لە (بیرکاری)، ئیجازەی مەلایەتی لە مەلا عبداللە ئەفەندی عومەری موصلی وەرگرتووە، لە مزگەوتی گەورەی دهۆك مەلا بووە و دەرسی داوە، یەك بووە لە مەلایە بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی، ساڵی ١٣١٢ك – ١٨٩٤ز لە ڕێگای حەج کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٣١.

### محەممەد دیاب نەقشبەندی (١٣٣١)

ناوی محەممەدە، کوڕی دیابە، ناسراوە بە: (جەزۆ)، ساڵی ١٣٠٢ك – ١٨٨٤ز لە (دیمشق) هاتووتەدنیا، باوکی لە (دیاربەکر) هاتە (دیمشق)، مامۆستا جەزۆ لە

تەمەنی حەوت ساڵان قورئانی پیرۆزی لەبەر کرد، پاشان لەلای شێخ عیسای کوردی دەستی کرد بە خوێندن تا شارەزا بوو لە عەقائید و شەریعەت و تەصەووف، ماوەك خەریك بوو بە نووسین تا بووە خۆشنووس، دوو نوسخە قورئانی پیرۆزی بە دەستی خۆی نووسییەوە، پاشان داوایان لێکرد پێش نوێژی و ووتارخوێنی مزگەوتی گەورەی ئەمەوی وەربگری، ئەویش داوایەکەی ڕەت کردەوە، حەزی کرد، لە ماڵی خۆی دابنیشی لەوێ فەتوا بدا، شێخ ئەحمەدی کفتارۆ و شێخ سەعیدی کوردی و مەلا ڕەمەزانی بوطی و چەند زانایان، دەچوونە خزمەتی بۆ وەرگرتنی زانیاری.

خووڕەوشتی: ناوبراو دوکانی عەتاری هەبوو، ئەوەی دەهاتە دەستی لەسەر ئەو دەست کورتیە هەمووی دەبەخشی بە فەقیر و هەژاران، جگە لەوە خواردنی دەدا بە سەگەك لە گەڵ پشیلە و چەند گوجیلە لە گۆڕستانەك، سەگەکە مامۆستای دەناسی، هەموو ڕۆژان وەکو پاسەوان لە دووی دەڕۆیشت تاکو پێش دەرگای ماڵ، کە مامۆستا نەخۆش کەت، هەموو ڕۆژ دەچووە پێش دەرگای ماڵ، ئەوانیش خواردنیان پێ دەدا، ئەو ڕۆژەی مامۆستا کۆچی دوایی کرد سەگەکە بۆ خواردن نەهات، کە تەرمی مامۆستایان بردە سەرقەبران، ئەویش دەگەڵ خەڵکان چوو، نەگەڕاوە تاکو بە خاك سپێردرا، ئەو ڕۆژ ٢٥/٧/١٩٥٧ز بوو.

سەرچاوە: نثر الجواهر والدرر ٢/١١٦٢ – ١١٦٣.

## محەممەد ڕسول بەرزنجی (١٣٣٢)

ناوی محەممەدە، کوڕی سەید ڕەسولی کوڕی عبدالسیدی حوسەینی (بەرزنجی)یە، ساڵی ١٠٤٠ك – ١٦٣٠ز لەو گوندە هاتووتەدنیا، لە (مەدینە)ی پیرۆز نیشتەجێ بووە، زانیاری لە باوکی وەرگرتووە، هەروەها دەرسی لەلای مەلا شەریفی شاهۆ و مەلا ئیبراهیمی گۆران خوێندووە، سەفەری بۆ (هەمەدان) و (بەغدا) و (دیمشق) و (حەلەب) و (میصر) و (قسطنطینیة) کردووە، مامۆستا کرایتە موفتی (مەدینە). چەند دانراوی هەیە، ژمارەیان دەگاتە شێست بەرگ، لەوانە: شەرحی باسی خەلیفەکانە، لە

هۆنراوەی (ذات الشفا): ساڵی ١٠٨٦ك لە (مەدینە) تەواوی کردووە، ساڵی ١١٠٣ك – ١٦٩١ز لە مەدینە کۆچی دوایی کرد.

دوو کوڕی هەبوو: سەید جەعفەر: لە مەدینە ماوە وە سەید ئیبراهیم: گەڕاوە (قەلاچۆلان) لە (قەڵاتە)ی نزیك (بەردەزەرد) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٢/٤٩٣ – ٤٩٥.
٢. إيضاح المكنون ١/٥٩ /٢/١٩٤.
٣. معجم المؤلفين ٩/٣٠٨ /١٠/١٦٥.
٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٦٩ – ٧٠.
٥. الشيخ معروف النودهي ٧٤.
٦. هدية العارفين ٢/٣٠٢.


## محەممەد ڕەسول زەکی (١٣٣٣)

ناوی محەممەدە، کوڕی ڕەسولی زەکی دووەمە، کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا ڕەسولی زەکییە، دەچێتەوە سەر زەیدی کوڕی ثابیت کە یەکە لە یارەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بی)، ئەو زاتە ساڵی ١١٨١ك – ١٧٦٧ز لە (گزنە)ی (چوارتا)ی سەر بە (سلێمانی) هاتەدنیا، ساڵی ١٢٢٦ك – ١٨١١ز لە (سابلاغ) دەرسی داوە، ساڵی ١٢٤٣ك سەفەری بەغدای کرد، لەوێ چاوی بە داود پاشای والی کەوت، ئەویش زۆر ڕێزی لێنا، ماوەك لەوێ ماوە، حاشیەی سەر سەیلەکوتی خەیالی لەو کاتە دانا (ساڵی ١٣٠٢ك لە ئەستەمبۆڵ چاپ کرا)، داود پاشا داوای لێ کرد لە (بەغداد) بمێنێتەوە، بەڵام مامۆستا گەڕانەوەی کوردستانی بۆ خۆی هەڵبژارد، مامۆستا لە زانیاری جەبر و فەلەك و کەلام و ئەندازە دەستی باڵا بووە، حاشیەی لەسەر عبدالحکیمی عبدالغفوری جامی هەیە (ساڵی ١٢٤٤ك لە ئەستانە چاپ کرا).

بەشێك لە فەقێیەکانی: محەممەد فەیزی زەهاوی، شێخ عبدالرحیم، سەید ئیراهیم کلیچی، مەلا لطف الله.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٢٤٧ك - ١٨٣١ز لە (سابلاغ) بە نەخۆشی (تاعون)، کۆچی دوایی کرد، مەلا عبدالله ی کوڕی لە مزگەوتی بازاڕ لە سابلاغ ساڵی ١٢٥٩ك کتێبی (خلاصة الحساب)ی بەهائەدین عاملی نووسیەوە.

سەرچاوەکان:


١. تاريخ السليمانية ٢٨١.
٢. معجم أعلام الكورد ٦٠٤.
٣. اسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ١٥٢.
٤. بوژاندنەوە ٢/١٠٤ - ١٠٨ /٣/٣١٨ - ٣٢١.
٥. مشاهير الكورد ٢/١٥٣.
٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥١٣ - ٥١٧.
٧. معجم المؤلفين ٩/٣٠٩.


## محەممەد ڕەسول عەزیمی (١٣٣٤)

ناوی محەممەدە، کوڕی ڕەسولی کوڕی حوسێنی کوڕی خدری کوڕی فەقێ ئالە، خەڵکی گوندی (بەنوخەلەف)ی سەر بە شاری (سەدەشت)ە، ساڵی ١٩٢٢ز هاتەدنیا، کە فامی کرد ناردیانە بەرخوێندن، پاشان فەقێیاتی لەو شوێنانە کرد: (سوسنایەتی) (گەورك) (ئالان) (شینکایەتی).

بەشێك لە مامۆستایەکانی: مەلا موحەررەم مەرگەیی لە (بیۆر)ی سەرەوە، مەلا شێخ ئەمین ئاکۆیی لە (گربداغ)ی پشدەر، مەلا موسای مەرگەیی، مەلا حەسەنی گەزنەیی، مەلا حوسێنی کەیوانی، مەلا محەممەدی مەرگەیی لە بنگرد، مەلا عبدالله ی واوی لە (نەلاس)، مەلا عبدالرحیمی عەبباسی، مەلا ئیبراهیمی سیسێرێ لە (نستان)، مەلا ئەحمەد توژەلی لە (شیوەسەل)، مەلا عەلی بێشاسپی، مەلا محەممەدی کونەمشکەیی، مەلا حوسێنی

دەشتێوی، مەلا ئەحمەدی شەریعەتی، مەلا محەممەد چکە لە (هێرۆ)، مەلا عەلی دولکان، مەلا صاڵحی نەجیبی لە (گەناو) لێرە ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: گەڕاوە گوندی (بەنوخەلەف) دەستی کرد بە مەلایەتی و دەرسدانەوە، دوایی باری کرد بۆ (قڕوچا)ی لاجان، ساڵێك لەوێ ما، باری کرد بۆ (شیوەسەل)ی ناوچەی سەردەشت، دوو ساڵان لەوێ بوو، گەڕاوە (بەنوخەلەف)، تا ساڵی ۱۹۸۰ز چووە مزگەوتی (دار السلام) لە (سەردەشت) کرا ووتارخوێن، شەوی جێژنەی ڕەمەزان، ساڵی ۱٤۰۸ك – ۱۹۸۷ز دوای گەڕانەوە لە جەماعەتی نوێژی عیشا، لە پێش دەرگەی حەوشەی ماڵی خۆی، بە دەستەکی چەپەل درا بەر گوللان، شەهید کرا، گیانی پاکی بەرەو بارەگای خوداوەند فڕی، تا ڕۆژی دوا بە جەستەی خوێناوی شکات دەکات.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ۳۱۳ – ۳۱۵.

## محەممەد ڕەسول وەرتی (۱۳۳٥)

ناوی محەممەدە، کوڕی ڕەسول ئاغایە، ساڵی ۱۸۹۷ز لە گوندی (وەرتە) هاتەدنیا، هەر لەو گوندە دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (کەرکوك) لای مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی، دوایی چووە (سەران) لای مەلا عبدالله، پاشان چووە (کۆیە) لای جەنابی مەلا محەممەدی جەلی زادە، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕاوە (وەرتە) ماوەك لەوێ مەلا بوو، دوایی باری کرد بۆ (سەرکەپکان)، خەریکی مەلایەتی و دەرسدانەوە بوو، تا ساڵی ۱۹٥۸ز کۆچی دوایی کرد، مەلا عبدالفتاحی کوڕی: لە ساڵی ۱۹۲۰ز لە دایکبووە، خوێندنی لە خزمەت باوکی تەواوکرد، ماوەك لە (وەرتە) مەلا بوو، دوایی چووە (ئەستریلان)، لەبەرواری ۳۰/۷/۱۹۸۷ز کۆچی دوایی کرد، کوڕی ویش نیعمةالله یە: مەلایە لە مزگەوتی حاجی خدر، لە گەڕەکی پۆلیسان، لە (هەولێر).

سەرچاوەکان:

۱. دەستووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

٢. چاوپێکەوتن لەگەڵ مەلا نیعمةالله، نەوەی مامۆستای ناوبراو.

## محەممەد زیارەتی (١٣٣٦)

مامۆستا مەلا محەممەد، خەڵکی گوندی زیارەتی مەلا زادانە،ساڵی ١١٣٣ك – ١٧٢٠ز هاتووتەدنیا، مێژووناس یاسین عومەر دەڵێ: {مامۆستا زانایەکی بەرز و پایەدار بووە، لە زانستەکان شارەزا بووە، لە شاری (ئاکرێ) موفتی بووە و دەرسی داوە}، ساڵی ١١٩٦ك – ١٧٨٢ز لە (ئاکرێ) کۆچی دوای کردووە.

سەرچاوەکان:

١. غاية المرام ١٠٩.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ٢١٥.

## محەممەد سعدالله حەڕانی (١٣٣٧)

ناوی محەممەدە، کوڕی سعداللەی کوڕی عبدالأحدی کوڕی سعدالله ی کوڕی عبدالقاهیری کوڕی عبدالأحدی کوڕی عومەری کوڕی نەجیحە، خەڵکی (حەڕان)ە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، چووە (دیمشق) هاتووچووی تەقیەدین ئیبن تەیمییەی کردووە، زانایەکی زەین تیژ و ئاقڵ مەند بووە، ساڵی ٧٢٣ك – ١٣٢٤ز چووە (حەج) لە گەڕانەوە لە (مەدینە)ی پیرۆز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (بەقیع) بە خاك سپێردرا، (الكفاية)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٣/ ٤٤٣ – ٤٤٤.

٢. معجم المؤلفين٢٣/١٠.

٣. معجم أعلام الكورد ٦٠٤ – ٦٠٥.

٤. الذيل على طبقات الحنابلة ٣٧٦/٤.

٥. شذرات الذهب ٦١/٦.

## محەممەد سەعید ئیبراهیم گۆرانی (١٣٣٨)

ناوی محەممەد سەعیدە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی محەممەدی کوڕی ئیبراهیمی گۆرانی یە، لە (١٢)ی مانگی شەعبانی ساڵی ١١٣٤ك – ١٧٢٢ز لە (مەدینە)ی پیرۆز هاتووتەدنیا، هەر لەوێ پەروەردەبوو، قورئانی پیرۆزی هەموو لەبەر کرد، دەرسی لە خزمەت باوکی و مەلا عبدالرحمان و مەلا مەحمودی جامی و مامۆستا محەممەد سولەیمانی کوردی خوێند، پاشان کرا مودەرریس لە مزگەوتی خۆشەویست (درودی خوای لێ بێ) لە (ڕەوضە)ی شەریف دەرسی دەداوە، لە جێگای باوکی، لە ١٩ی مانگی شەعبانی ساڵی ١١٩٦ك – ١٧٨٢ز کۆچی دوای کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٦٥١ – ٦٥٢.

٢. سلك الدرر ٤/ ٢٧ – ٢٨.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥١٢.

## محەممەد سەعید ئەحمەد دێلژەیی (١٣٣٩)

ناوی محەممەد سەعیدە، کوڕی مەلا ئەحمەدە، خەڵکی گوندی (دێلژە)یە، لە دەوری ساڵی ١٢٥٠ك – ١٨٣٤ز لە (سلێمانی) هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، هەر لەلای ئەو ئیجازەی وەرگرت، ساڵی ١٢٨٨ك – ١٨٧١ز باوکی چووە حەج، لەو سەفەرە کۆچی دوایی کرد، مامۆستا محەممەد لەو بەروارە بووە جێگری باوکی لە دەرسدانەوە و کاروباری مەلایەتی، ساڵی ١٣٠٨ك کرا موفتی، ساڵی ١٣١٥ك – ١٨٩٧ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (سەیوان) لە سلێمانی بە خاك سپێردرا، کتێبی (الرسالة الحميدية)ی داناوە، لە زانستی (کەلام).

کوڕەکانی: (مەلا عبدالعزیز) و (مەلا مەحمودی بێخود) و (مەلا ئەحمەد).

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٤١ – ٥٤٢.

## محەممەد سەعید ئەحمەد مەردۆخی (١٣٤٠)

ناوی محەممەد سەعیدە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی مەحمودی کوڕی ئەحمەد عەللامەی کوڕی شێخ مصطەفای تەختی یە،ساڵی ١١٥٢ك – ١٧٣٩ز هاتووتەدنیا، تاقەسواری مەیدانی زانیاری چەرخی خۆی بووە، لە لای (أمان الله خان) والی ئەردەلان، لە مزگەوتی (دار الاحسان) کرا مەلاو مودەرریس.

چەند قوتابی وای هەبوون لە کوردستان و عەرەبوستان ناوبانگیان دەرکرد، بۆ نمونە: محەممەد موفتی زەهاوی، سەید عبدالرحیم مەولەوی، مەلا خضری (نالی) شاعیر.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٢٣٦ك – ١٨٢٠ز کۆچی دوایی کرد.

چەند کوڕی زانای هەبوو: (شێخ عبدالقادر) و (شێخ محەممەد وەسیم) و (شێخ محەممەد جەسیم) و (شێخ محەممەد نەسیم).

سەرچاوەکان:

١. تأریخ مشاهیر کورد ١/٢٩٧.

٢. بنەماڵەی زانیاران ١٤٠ – ١٤١.

## محەممەد سەعید باغەمرەیی (١٣٤١)

ناوی محەممەدە، کوڕی مەلا سەعیدی کوڕی مەلا مصطەفای کوڕی مەلا سەعیدە، ساڵی ١٩٢٣ز لە گوندی (باغەمرە) هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبەکانی قۆناغی سوختەیی تەواوکردن، لە قۆناغی موستەعیدی چووە (هەولێر) مزگەوتی حاجی قادر دەباغ، لای مەلا عبدالله ی بێتواتەیی، ماوە تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕاوە (باغەمرە) ماوەك لەوێ ماوە، پاشان باری کرد، بۆ (دارەتوو)ی نزیك (هەولێر) چەند جاران چووە حەج.

لە بەرواری ١٤/١٢/١٩٨٤ز دوای نوێژی هەینی نزیك هەولێر، بە کارەساتی (سەیارە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٣٤٩ – ٣٥٠.

## محەممەد سەعید بریفکانی (١٣٤٢)

ناوی محەممەد سەعیدە، کوڕی مەلا یاسینی بریفکانە، لە گوندی (بادی) نزیک (دهۆك) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (تورکیا) ماوەك لە مەدرەسەکانی (جزیرە)ی بۆتانی خوێند، دوایی گەڕاوە (عێراق) ماوەك لە (هەولێر) بوو، دوایی چووە (چەل) لای مەلا حەیدەر، دوایی چووە (ئەسپیندارە)ی نزیك (ئامێدی)، پاشان هاتە (ئاکرێ) ساڵی ١٣٣٨ك – ١٩١٩ز لەلای مەلا ئەحمەد ئیجازەی وەرگرت.

مامۆستا زاتەکی ڕوو لە خوا بوو، مەبەستی دنیا نەبوو، چەند زانای پێگەیاندن، سەرچاوە بوو بۆ وەڵامەکانی پرسیارانی شەریعەت.

دانراوەکانی: (فضلاء بهدینان) و (السلطان صلاح الدین الایوبي) و (أرکان الحج) و (نظم فتح القریب وسیرة الرسول) و (مقتطفات من سیرة ابن هشام) و (ولادة النبی صلی الله علیه وسلم) و (زیارة القبور) و (قصائد عربیة دینیة).

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٧٦ز لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد، لە (دهۆك) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: أسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامیة ٣٢.

## محەممەد سەعید ڕەمەزان بوطي (١٣٤٣)

دکتۆر محەممەد سەعید، کوڕی مەلا ڕمەزانە، ساڵی ١٣٤٨ك – ١٩٢٩ز لە گوندی (جیلکا)ی جزیرەی بۆتان کوردستانی تورکیا هاتووتەدنیا، بە منداڵی لە خزمەت باوکی چووە (دیمشق) ماوەك لەلای ئەوی خوێند، دوایی ناردیە لای شێخ حەسەنی حەبەنەکە، ماوە لەوێ تا بڕوانامەی ئامادەیی لە شەریعەت وەرگرت، پاشان چووە (ئەزهەر) ساڵی ١٩٥٣ز بڕوانامەی لەوێ وەرگرت، گەڕاوە (دیمشق) لەوێ کرا مودەرریس، دووبارە بۆ خوێندنی باڵا گەڕاوە (ئەزهەر)، ساڵی ١٩٦٥ز بڕوانامەی دکتۆرای لە شەریعەتی ئیسلامی وەرگرت، نامەی دکتۆرای لە ژێر ناونیشانی: (ضوابط المصلحة في الشریعة الإسلامیة) بوو، مامۆستا جگە لەو بابەتە چاك چاکانەی بەڵاوی

کردوونەوە، ئەو نمونە نایابانەی لەسەری ڕۆیشتووە، ئەو کتێبانەی لێکۆڵینەوەی لێ کردوە، چەندان کتێبی سوودبەخشی داناون، لە جیهانی ئیسلامی کراینە دەستووری خوێندن، بەلاوکراینەوە، زانایان لێ ڕازی بووینە. بۆ نمونە:

١. فقه السيرة.
٢. كبرى اليقينيات الكونية.
٣. السلفية فترة زمينة مباركة، لا مذهب إسلامي.
٤. من روائع القرآن.
٥. الإسلام ملاذ كل المجتمعات الإنسانية.
٦. نقض أوهام المادية الجدلية.
٧. مسألة تحديد النسل.
٨. هذا والدي.
٩. هذه مشكلاتهم.
١٠. هذه مشكلاتنا.
١١. من الفكر والقلب.
١٢. منهج الحضارة الإسلامية في القرآن.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٦٥٢ – ٦٥٣.

## محەممەد سەعید زەهاوی (١٣٤٤)

ناوی محەممەد سەعیدە، کوڕی مەلا محەممەد فەیزی زەهاوی یە، لە ناوچەی پشدەر هاتوونە (بەغدا)، ساڵی ١٢٦٨ك – ١٨٥١ز هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، ماوەك لەلای ئەو ماوە، پاشان چووە مەدرەسەی (سلیمانیە) لای مەلا عبدالقادری کوردی، ئەویش ڕێزی لێنا، ئەسمائە خانی کچی خۆی لێ مارە کرد، وەسیەتی کرد دوای خۆی ئەو بکەنە جێگری، لەوێ زانستەکانی تەواوکرد، گەڕاوە لای

باوکی لە (١٥)ی مانگی (محرم)، ساڵی ١٢٩٣ك – ١٨٧٦ز باوکی ئیجازەی پێدا، پاش ئەوەی مامۆستا عبدالقادر کۆچی دوایی کرد، بە پێی وەسیەتنامەکە زەهاوی کرا جێگری.

پلە و پایەکانی:

١. ساڵی ١٨٩٠ز تا ساڵی ١٩١٥ز موفتی بەغدا بوو

٢. ماوەی حەوت ساڵان ئەندامی دادگا و جێگری سەرۆکی دادگا بوو.

٣. ساڵی ١٩١٨ز کرا سەرۆکی ئەنجومەنی تەمیزی شەرعی سونی.

٤. ماوەی دە ساڵان جێگری قازی و بەڕێوەبەری ئەوقاف بوو.

٥. کرا بەڕێوەبەری زانستی و سەرۆکی لیژنەی جێبەجێ کردنی کاروباری قوتابیان.

کۆچی دوایی: لە ١٣/٥/١٩٢١ز کۆچی دوای کرد، لە تەك باوکی لە مەدرەسەی (سلیمانیة) بە خاك سپێردرا، لەبەر ئەوەی مامۆستا خەریکی دەرسدانەوە و قازییاتی بوو، بۆیە جگە لە یەك کتێبی کورت لە (کەلام) نەمانزانیوە دانراوی دی هەبی، وەك خۆی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| عاق تدريسي عن التأليف | لكن ليس اني متأسف |
| بتلاميذي ألّفت كتابا | كل فرد في العلم مؤلف |

دوای خۆی ئەمجەد ئەفەندی کوڕی جێگری بوو، لە پێشدا باسمان کرد.

سەرچاوەکان:

١. الامام أمجد الزهاوي ٦٨.

٢. مشاهير الكورد ١/٢٣١.

٣. لب الالباب ٢/٢٤٧.

٤. بوژاندنەوە ١/٣٢٨ / ٣/٢٠٠ – ٢٠١.

## محەممەد سەعید عبێدی (١٣٤٥)

ناوی محەممەدسەعیدە کوڕی ئەحمەدی کوڕی فەتتاحە، لە پیاو ماقوڵانی (ئەبوعوبەیدە)ی نزیك (هەڵەبجە)یە، دەوری ساڵی ١٣٠٠ك – ١٨٨٢ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە ناوچەی خۆیان قۆناغی سوختەیی بڕی، لە قۆناغی موستەعیدی چووە (کەرکوك) لای مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی ڕیازیاتی خوێند، پاشان چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادر، ماوە تا ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (ئەبوعوبەیدە) لەگەڵ مەلا عبدالله ی مەلا قادر دەستی کرد بە دەرسدانەوە یەك لە فەقێیەکان مامۆستا عبدالکریمی (مدرس) بوو.

خووڕەوشتی: زاتەکی بە دین و لە خواترس و دڵنەرم و ڕووخۆش بوو، سەرەڕای مەلایەتی مامەڵە و بازرگانی دەکرد، تەنیا نانی دەستی خۆی دەخوارد، شتی لە کەس وەرنەدەگرت، خزمەتی فەقێیانی دەکرد، ساڵی ١٣٤٥ك – ١٩٢٦ز کۆچی دوایی کرد، یەك ڕۆژ بەر لە وەفاتی بەردەوام ئایەتی ﴿ الله لطیف بعبادە...﴾ (شوری/١٩)ی دەخوێند.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدین ٥٥٠ – ٥٥١.

## محەممەد سەعید عەجاج ئیزۆلی (١٣٤٦)

ناوی محەممەد سەعیدە، کوڕ عەجاجی کوڕی عەلی یە، عەشیرەتی (ئیزول)ە، لە نزیك (ماردین) دادەنیشن، ساڵی ١٣٠٧ك – ١٨٨٩ز لە (عەجلون)ی ئوردن هاتەدنیا، بۆ خوێندن چووە لای شێخ محەممەد هاشمی تەلەسانی لە (دیمشق)، هەر لەو زاتە تەریقەتی شازەلی وەرگرت، گەڕاوە (ئوردن) لە (بارحە) کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن، سەفەری کرد بۆ کوێت و میصر و عێراق، خەریکی دەرسدانەوە و ئیرشاد بوو، لە ٧/٧/١٩٧٢ز کۆچی دوایی کرد، شێخ ئیسماعیلی کوڕی بووە جێگری.

مامۆستا سەعید چەند دانراوی هەیە، لەوانە: (التعرف بحقائق التصوف) و (فوائد الأذکار ومحبة العزیز الجبار) و (مولد الروح النبویة خیر الخلائق الکلیة) و (عصمة الأنبیاء)

و (القصائد الروحية) و (رسالة في التوحيد) و (نشر الاعطار المحمدية) و (دوحة الإمداد في ذكر بعض كرامات أولياء الأكراد).

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٦٥٠ – ٦٥١.

## محەممەد سەعید مەولەوی (١٣٤٧)

ناوی محەممەد سەعیدە، کوڕی سەید محەممەدی کوری سەید عبدالرحیمی مەولەوییە، لە دەوری ساڵی ١٢٩٠ك – ١٨٧٣ز لە گوندی (سەرشاتە) ڕۆژهەڵاتی زێی (سیروان) هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، گەڕا لە چەند قوتابخانان، پاشان چووە (بیارە) تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عومەر وەرگرت، بووە مەلا لە (شمیران) دوایی باری کرد، بۆ (گوندە)، ساڵی ١٣٦٠ك – ١٩٤١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٤٩.

## محەممەد سەلەمە حەڕانی (١٣٤٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی سەلەمەیە، خەڵکی (حەڕان)ە، زانایەکی شەرع زان و فەرموودەناس بووە، لە هیشامی حەسەنی بیستووە، ناسراوە بە بڕواپێکراو، ساڵی ١٩١ك – ٨٠٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ١/٣٢٩.

٢. البداية والنهاية ١٠/٢٣٥.

## محەممەد سولەیمان حەڕانی (١٣٤٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی سولەیمانی کوڕی عبدالله یە، خەڵکی (حەڕان)ە، مەزهەبی شافیعی یە، لە منداڵیەوە چووە (حەما)، یەکەم جار پیشەساز بوو، دوایی وازی هینا، دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (دیمشق)، ساڵی ٧٧٣ك – ١٣٧١ز گەڕاوە (حەلەب)، لەوێ کرا قازی و مودەڕریس، ساڵی ٨٠٦ك – ١٤٠٣ز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

شذرات الذهب ٧/٦٠ – ٦١.

معجم أعلام الكورد ٦٠٥.

## محەممەد سولەیمان صەیدی (١٣٥٠)

ناوی محەممەدە، کوڕی سولەیمانی کوڕی حاجی سەید مەحمودە، نازناوی (صەیدي)یە، واتە: ڕاوچی، ساڵی ١٨٧٤ز لە گوندی (خانەقا)ی نزیك (پاوە) هاتەدنیا.

دەستی کرد بە خوێندن، لە مزگەوتەکانی (هەورامان) و (شارەزور) و (پایگەلان) و (بیارە) قۆناغەکانی خوێندنی بڕی، پاشان چووە لای مەلا جەلالی خورماڵ، ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە گوندەکەی خۆی دەستی کرد بە مەلایەتی و دەرسدانەوە، هەروەها ئیشی کشتوکاڵیشی دەکرد، دوایی چووە لای شێخ عوسمانی تەوێڵە تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت، (صەیدي) جگە لە مەلایەتی شاعیریش بوو، بەلاّم بەم نازناوە شاعیری تر هەیە، صادق سەید عەلی هەورامیە.

سەرچاوە: مێژوی ئەدەبی کوردی ٣/٢٦٣ – ٣٠٠.

## محەممەد سولەیمان کوردی (١٣٥١)

ناوی محەممەدە، کوڕی سولەیمانی کوڕی مەدەنییە، ساڵی ١١٢٦ك – ١٧١٤ز لە (دیمشق) هاتەدنیا، پاشان لە خزمەت باوکی چووە (مەدینە)ی پیرۆز، لەوێ لای باوکی و شێخ یوسفی کوردی و چەندان زانایان خوێندنەکەی تەواوکرد، ئیجازەی مەلایەتی لە عبدالله سالمی بەسرایی وەرگرت، زانایەکی بە توانا بوو، لە زانستەکانی ئەقلی و نەقلی سەرکەوتوو بوو، بە تایبەت لە فیقهی شافیعی زۆر ئاگادار بوو، مەلا صبغةالله ئەفەندی حەیدەری فەقێی ئەو زاتەیە.

چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. الحواشي المدينية على شرح المقدمة الحضرمية.
٢. شرح المقدمة الحضرمية.

٣. القول الفصل على شرح مقدمة الفقيه عبدالله بافضل.

٤. التواني عن الساعي لقضاء حوائج الانسان.

٥. الثغر البسام عن معاني الصور التي يزوج فيها الحكام.

٦. عقود الدرر في بيان مصطلحات تحفة ابن حجر.

٧. فتاوى.

٨. جالية الهمم.

٩. الفوائد المدنية في بيان إختلاف العلماء من الشافعية.

١٠. الإنتباه في فضل الصلاة.

١١. حاشية على شرح الغاية للخطيب.

١٢. زهر الربا في بيان أحكام الربا.

١٣. شرح منظومة الناسخ والمنسوخ.

١٤. الدرة البهية في الأسئلة الجاوية.

١٥. فتح الفتاح بالخير على من يريد معرفة شروط الحج عن الغير.

١٦. فتح القدير باختصار متعلقات النسك للأجير.

١٧. الفوائد البهية فيمن يفتي بقوله من أئمة الشافعية.

١٨. كاشف اللثام عن حكم التجرد قبل الميقات للإحرام.

١٩. كشف المروط عن محذرات ما للوضوء من شروط.

٢٠. المسلك العدل.

كۆچی دوایی: شەوی پێنج شەمە ١٦ی مانگی مەولود، ساڵی ١١٩٤ك – ١٧٨٠ز كۆچی دوایی كرد، لە (رەوضە)ی شەریف نوێژی لەسەر كرا، لە (قبة العباس) سەرەوەی گۆڕەكەی باوكی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەكان:

١. هدية العارفين ٢/٣٤٢ /٦/٢٢/٧.

٢. إيضاح المكنون ٣/١٢٩.
٣. معجم المؤلفين ٣/٥٤.
٤. مشاهير الكورد ٢/١٣٩.
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٠٢ – ٥٠٣.
٦. سلك الدرر ٤/١١١ – ١١٢.
٧. الأعلام ٦/٧٥.
٨. معجم أعلام الكورد ٦٠٥.

## محەممەد سەلیم ئەردەلانی (١٣٥٢)

مامۆستا محەممەد سەلیم ئەردەلانییە، خەڵکی کوردستانی ئێرانە، دەستی کرد بە خوێندن، پاشان هاتە کوردستانی (عێراق) لەلایەن مەلا صبغةالله ماوەرانی ئیجازەی وەرگرت، لە مزگەوتی عومەری لە (موصل) دەرسی داوە، ساڵی ١١٨١ك – ١٧٦٧ز مصطەفا عبدالغنی شێخ یەحیا لەلای خوێندووە، دوایی بوویتە مەلای مزگەوتی (زەکەریا)، لەو کاتە خەتیبی عومەری خاوەنی (منهل الأولياء) لەلای دەخوێند، ساڵی ١٢٠٣ك – ١٧٨٨ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (نەبی شیت) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٣٣٦ – ٣٣٨.
٢. مشاهير الكورد ٢/١٣٤.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٠٠ – ٥٠١.
٤. منهل الأولياء١/ ٢٧٧ – ٢٧٨.
٥. معجم أعلام الكورد ٦٥٣.

## محەممەد سەلیم مەردۆخی (١٣٥٣)

ناوی محەممەد سەلیمە، کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عبدالکریمی کوڕی شێخ عبدالغفارە، نەوەی شێخ ئەحمەدی عەللامەی مەردۆخییە، ساڵی ١٢٧٤ك – ١٨٥٧ز لە

گوندی (تەختە) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، ماوەك لە (سنە) بوو، ماوەك لە (سابلاغ)، دوایی هاتە شاری (سلێمانی)، ماوەك لەلای شێخ عبدالقادری موهاجیر ماوە، دوایی چووە (بیارە) لای مەلا قادر کانی کەوە ئیجازەی وەرگرت، هەروەها تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عومەری (ضیاءالدین) وەرگرت، جەنابی شێخ ئیجازەی ئیرشادی پێدا، مامۆستای مەردۆخی جگە لە مەلایەتی شاعیرەکی چاك بووە، شیعری کوردی و عەرەبی و فارسی هەیە، خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆز بوو، تا ساڵی ١٣٣٧ك – ١٩١٨ز کۆچی دوایی کرد.

چەند دانراوی خۆی هەیە، لەوانە:

١. قەصیدەی عەرەبی لە مەتحی شێخ نەجمەدینی بیارە، لە کۆتاییدا دەڵێ:

فیارب هب لي فیه قلبا مصدقا (سلیما) من الزیغ وسوء التبدل

٢. تەرجومەی قەصیدەی سەعدی شیرازی، لە عەرەبی بۆ فارسی بە هۆنراوە.

٣. قەصیدەی عەرەبی بۆ شێخ عومەر، لە سەرەتاوە، دەڵێ:

رأیت الناس في الآفاق للشبان عشاقا وإني عاشق شیخاً إلیه کنت مشتاقا

٤. تەخمیسی شیعری شێخ عومەر بە عەرەبی.

٥. قەصیدەی فارسی لە مەتحی شێخ عومەر.

٦. چەند ئەشعاری (تەصەووف)

٧. قەصیدەی (هائیە).

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژوی زانایانی کورد ٦/٣٣٩ – ٣٤٨.

## محەمەد سۆرانی (١٣٥٤)

شێخ مەلا محەمەد سۆرانی، یەکە لە پیاوماقوڵانی شاری (حەلەب)، لە مەدرەسەی (ئەحمەدیە) – کە تایبەت بو بە قوتابیانی کورد – دەرسی دەدا، هەروەها تەریقەتی قادری بەلاو دەکردەوە، هەر لەو شارە ساڵی ١٢٣١ك – ١٨١٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٣٧٥.

٢. معجم أعلام الكورد ٦٥٣ – ٦٥٤.

## محەممەد شاهەنشا ئەییوبی (١٣٥٥)

ناوی محەممەدە، کوڕی شاهەنشای کوڕی مەلیك بەهرامی کوڕی فەڕوخ شای کوڕی شاهەنشای کوڕی ئەییوبە، لە مەلیکە ئەییوبییەکانە، ساڵی ٦١٦ك – ١٢١٩ز لە وڵاتی (شام) هاتەدنیا، لەگەڵ ئەوە کە سەرکردە بو زانایەکی ئایینی بوو، (بوخاری) خوێندووە و دەرسی داوە، ئیجازەی بە شێخ شەمسەدین داوە، ساڵی ٦٨٣ك – ١٢٨٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد٦٠٧.

## محەممەد شەریف بەرزنجی (١٣٥٦)

مامۆستا محەممەد شەریف، لە سەیدەکانی بەرزنجەیە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (مەدینە)ی پیرۆز دابەزیوە، کتێبی (عدة الإنسان لمعرفة مداخل الشيطان)ی داناوە، سەرەتایەکەی بە: (الحمد لله مقلوب القلوب) دەست پێ دەکا، ساڵی ١١٣٤ك – ١٧٢١ز تەواوی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٠٣.

٢. إيضاح المكنون ٢/٩٤.

٣. هدية العارفين ٢/٣١٦.

٤. معجم المؤلفين ١٠/٦٦ – ٦٧.

٥. معجم أعلام الكورد ٦٥٥.

## محەممەد شەریف گۆرانی (١٣٥٧)

ناوی محەممەد شەریفە، کوڕی مەلا یوسفی کوڕی قازی مەحمودی کوڕی مەلا کەمالەدینی گۆرانی (صدیقی)یە، لە خزمەت باوکی خوێندووە، کە گەیشتە تەفسیری بەیزاوی، قورئانی پیرۆزی هەموو لەبەرکرد، ساڵی ١٠٥٥ك – ١٦٤٥ز چوە حەج، دوو ساڵان لەوێ ماوە، پاشان گەڕاوە کوردستان، دووبارە گەڕاوە (مەککە) و (مەدینە) ماوەك لەوێ دەرسی داوە، دوایی چووە (یەمەن) لە شاری (تەعز) و (مەخاوب) نیشتەجێ بوو، هەر لەوێ لە مانگی سەفەری ساڵی ١٠٧٨ك – ١٦٦٧ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی:

١. حاشیە لەسەر تەفسیری بەیزاوی تا سەرەتای سورەتی (مریم).

٢. حاشیە لەسەر تەفسیری بەیزاوی تا کۆتایی.

٣. حاشیە لەسەر شەرحی ئیشاراتی (طوسی).

٤. حاشیە لەسەر (تهافت الفلاسفة)ی خواجە زادەی رۆمی.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٩١ – ٤٩٢.

٢. معجم المؤلفين ١٠/٦٨.

٣. كشف الظنون ١/١٩٣.

٤. معجم أعلام الكورد ٦٨١.

٥. إيضاح المكنون ١/١٤٢.

٦. هدية العارفين ٦/٢٩١.

٧. مشاهير الكورد ٢/١٥٦.

٨. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/٢٥٧.

## محەممەد شەعبان ئەخلاطی (١٣٥٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی شەعبانی کوڕی ئەبوطاهیری کوڕی حەسانی کوڕی عەلییە، خەڵکی (ئەخلاطە)، فەرموودەی خوێندووە و دەرسی داوە، دەنگی خۆش بووە لە مەشهەدی حوسێنی پێش نوێژی کردووە، لە مانگی مەولودی ساڵی ٧٣٠ك – ١٣٣٠ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٠.

## محەممەد شەعبان دیاربەکری (١٣٥٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی شەعبانی کوڕی ئەحمەدە، خەڵکی (دیاربەکر)ە، نازناوی (کامی)یە، ساڵی ١٢٠١ك – ١٧٨٦ز کۆچی دوایی کردووە.

دانراوی تورکی هەنە لەوانە: (الرد علی النصاری) و (فاتح المشکلات) و (مولد النبي صلی الله علیه وسلم) و (منشآت) و (دیوانی شعر).

سەرچاوە: هدیة العارفین ٦/٣٤٦.

## محەممەد شەفیع مەرعەشی (١٣٦٠)

ناوی محەممەد شەفیعە، کوڕی ڕەحمةالله ی کوڕی محەممەدە، خەڵکی (مەرعەش)ە، ساڵی ١٠١٦ك – ١٦٠٧ز هاتەدنیا، پاشان لە (ئەصفەهان) نیشتەجێ بوو، زانایەکی مێژووناس و نەتەوەناس بوو، کتێبی (بحر الفوائد في التواریخ والأنساب)ی داناوە.

سەرچاوە: معجم المؤلفین ١٠/٧٠.

## محەممەد شوکری موفتی (١٣٦١)

مامۆستا محەممەد شوکری موفتی شەرعی شاری (ئامێدی) بووە، لە مزگەوتی گەورە ووتارخوێن بووە، لە مەدرەسە بەناوبانگەکەی (قەبەهان) دەرسی داوە، کتێبخانەکی دەوڵەمەند لە دەستنوس و چاپی لەبەردەست بووە، بەشێکیان نووسراوی ساڵی ١٥٧٣ز بوون دەوری سوڵتان حوسێنی والی، مامۆستا موفتی ساڵی ١٣٢٤ك – ١٩٠٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: أسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٣١.

## محەممەد شیرانشی (١٣٦٢)

مامۆستا محەممەد خەڵکی شیرانش (شەهرانش – شرانش)ە، سەر، بە قەزای (زاخۆ)یە، یەك بووە لە زانایە مەزنەکانی سەردەمی خۆی.

چەند دانراو و حاشیەی لەسەر کتێبەکانی خوێندن هەنە، لەوانە:

١. حاشية على عصام الوضع: ساڵی ١٠١٦ك – ١٦٠٧ز تەواوی کردووە، نوسخەکمان لەلایە، محەممەد مصطەفا دایەخەجێ ساڵی ١١١٤ك نووسیتیەوە، سەرەتایەکەی بە: (قوله على تقدير تقدم الديباجة.....) دەست پێ دەکا.

٢. حاشية على عصام الإستعارە: سەرەتایەکەی بە: (قوله إلى ألطاف ربه الخفية....) دەست پێ دەکا.

٣. حاشيه على جزء (عم) من تفسير البيضاوي.

٤. حاشية على الجامي: في النحو.

٥. حاشية على شرح الشمسية في المنطق.

مامۆستا لە مەدەرەسەی ئیخلاص (بەدلیس) ساڵی ١٠٠٠ك دەرسی دەدا.

سەرچاوەکان:

١. كشف الظنون ١/١٩٣.

٢. الأكراد في بهدينان ١٩٠.

٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/٧٤ – ٨٠.

## محەممەد صادق نعمةالله (١٣٦٣)

شێخ محەممەد صادق کوڕی شێخ نعمةالله یە، لە گوندی (کاکۆزەکەریا) دانیشتووە، خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆز بووە، زانیاری بەلاوکردوتەوە، ئامۆژگاری خەڵکانی کردووە، لەبەر ڕێزداری ناوبانگی بە (فاضل) ڕۆیشتووە، کتێبی (قاموس الأنساب)ی داناوە.

سەرچاوە: بنەماڵەی زانیاران ١٠٣.

**محەممەد صالّح دیاربەکری (١٣٦٤)**

ناوی محەممەد صالّحە، کوڕی مصطەفای کوڕی عومەرە، خەڵکی (دیاربەکرە) ساڵی ١٢٦٣ك - ١٨٤٦ز لە (دیمشق) هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، ماوەك لەلای عبدالقادر جەزائیری بوو، ماوەك دەرسی فەرموودەی دەخوێند، ساڵی ١٢٩٩ك چووە (ئەزمیر) تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عوسمان وەرگرت، پاشان چووە (ئەستەمبوڵ) لەوێ کرا موفتی (یەمەن)، ساڵی ١٣٠٠ك گەڕاوە (دیمشق)، ساڵی ١٣١٤ك چووە (مەککە)ی پیرۆز، دوایی گەڕاوە (دیمشق)، لە (٥)ی مانگی شەعبانی ساڵی ١٣٧٠ك - ١٩٥٠ز لە تەمەنێکی درێژی پڕ تاعەت کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (دەحداح) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: نثر الجواهر والدرر ١٢٤٠ - ١٢٤١.

**محەممەد ضیائەدین هەکاری (١٣٦٥)**

ناوی محەممەدە، نازناوی ضیائەدینە، ناسراوە بە (ئەبو عیسا)، یەك بووە لە سەرکردەکانی سوڵتان صەلاحەدینی ئەییوبی و لە ڕاوێژکارەکانی نزیکی، دەورێکی زۆری هەبووە لە ڕێکخستنی وەزارەتی حکومەتی ئەییوبی، زانایەکی شارەزا بوو، بەتایبەت لە زانستی (کەلام) دەستی باڵا بوو، دانراوی خۆی زۆرن، لە ڕۆژی سێ شەمە (٩)ی ذی القعدەی، ساڵی ٥٨٥ك - ١١٩٠ز لە (قودس) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: مشاهیر الکورد ٨٦.

**محەممەد طاها باشوری (١٣٦٦)**

ناوی محەممەدە، کوڕی مەلا طاهای کوڕی مەلا ئەحمەدە، خەڵکی گوندی (باشورە) لە دەشتی هەریر، پلکزای شێخ مصطەفای نەقشبەندی بووە بۆیە ناوبراوە بە (مەلا محەممەدی پلکێ)، ساڵی ١٣١٨ ك - ١٩٠٠ز هاتەدنیا.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوخەتیی تەواوکرد، لە قۆناغی موستەعیدی چووە لای مەلا ئەحمەدی ئاشۆکانی، لە گوندی (بنەسراوە)ی گەورە، دوایی

چووە لای مەلا شێخ حوسێنی سورچی لە گوندی (قەراسنج)، ماوەکیش چووە (قازیخانـە) لای مەلا عوسمانی خورمەلەی، پاشان چـووە لای شـێخ مصـطەفـای نەقشـبەندی، سـاڵی ١٩٣٢ز لە خزمەت شێخ ئیجازەی وەرگرت، لەگەڵ ئەو بەرێزانە:

١. مەلا ئیسماعیل سوسەیی.
٢. مەلا مصطەفای ئاشۆکانی (مامم)
٣. مەلا عبداللە ی بەحرکەیی (بابم)

مەلایەتی: لەسەر فەرموودەی شێخ لە گوندی (نۆغەران) بووە مەلا، ماوەکی زۆر لەوێ دەرسی دەداوە، ساڵی ١٩٥٨ز باری کرد بۆ (موصل)، لە مزگەوتی نەجیب جـادر کرا پێش نوێژ بە مووچەی برایەوە دە دینار، ساڵی ١٩٦٦ز گـەڕاوە (هـەولێر)، زۆربـەی ڕابواردنی لە مزگەوتی شێخ مصطەفا بوو، لە بەرواری ١/٩/١٩٨٤ز کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: (مەلا صادق) و (مەلا موحسین) و (حاجی حەمیـد) و (مـەلا طاهـا - کاکە مەلا).

سەرچاوە: النجم الزاهر ٦٨.

## محەممەد طاها بالیسانی (١٣٦٧)

ناوی محەممەدە، کـوڕی شـێخ طاهـای کـوڕی عـەلی کـوڕی عیسـای کـوڕی ئەحمەدی کوڕی مصطەفای کـوڕی عیسـایە، سـاڵی ١٣٣٦ك - ١٩١٧ز لـە (بالیسـان) هاتەدنیا، لە خزمەت بابی دەستی بە خوێندن کرد، پاشان لەسەر فەرمانی بـابی چـووە لای شێخ عومەری کاکی، دوایی چووە (کۆیە) لای مەلا عبدالقادری کانی دەربەندی، دوایـی چووە لای مەلا مصطەفای توتمـەیی، مـاوەکیش لـەو شـوێنانەی خوێنـد: خـەتێ، شـیرێ، هەرووتەکەون، پاشان چووە مزگەوتی حاجی قادر لە (هەولێر)، دوایی گەڕاوە لای کاکی مەلا شێخ عومەر ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایـەتی: یەکـەم جـار بـووە مـەلا لـە ناوچـەی (هەڵەبجـە)، دوایـی لەسـەر فەرموودەی کاکی گەڕاوە (هەولێر) لە مزگەوتەکەی خۆیان لە گەڕەکی (سیطاقـان) کـرا

ووتارخوێن، دوایی لە گەڕەکی (مستەوفی) مزگەوتێکی دروست کرد بەناوی (بالیسانی) لەوێ دەرسی فەقێیانی دەدا، ساڵی ١٩٦٥ز کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن لە مزگەوتی گەورەی (کۆیە)، پاشان کرا مودەڕریس لە (کویێسە)ی سەر بە شاری (ڕومادی)، ساڵی ١٩٧٠ز کرا مەلا لە مزگەوتی (مصرف) لە (بەغدا)، دوایی چووە مزگەوتی حاجی حەسەن بارح، لە گەڕەکی (سبع ئەبکار).

کۆچی دوایی: لە بەرواری ٢٥/٤/١٩٩٥ز لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی گەیلانی بە خاك سپێردرا.

دانراوەکانی: چەند دانراوی کوردی و عەرەبی هەیە، لەوانە:

١. كيف تحج وكيف تعتمر.
٢. اللطف الخفي نظم عقائد النسفي.
٣. القول الوفي في شرح اللطف الخفي.
٤. النصائح المفيدة.
٥. القول الحصين في تقسير سورة ياسين.
٦. القول المنصف في تفسير سورة يوسف.
٧. تفهيم الأمة في تفسير جزء (عم).
٨. القول المبارك في تفسير جزء (تبارك).
٩. ثمن ماء الكوثر.
١٠. أقول هذا.
١١. هذا شعري وهذا شعوري.
١٢. هذا رأيي وهذا مذهبي.
١٣. دەنگی دەروون تەفسیری سوڕەتی (نون).
١٤. چرای ڕۆناکی بۆ ڕێگای پاکی.
١٥. ڕۆڵە پەروەری.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالرحمان شەمشولەیی، مەلا بەهائەدین خەتی، مەلا عبدالکریم خورشید جانەیی، مەلا ئیسماعیل مەلا قەرەیی.

کوڕەکانی:

١. دکتۆر شێخ ئەحمەد: مامۆستای کۆلیژی شەریعەیە لە زانکۆی کۆیە.

٢. شێخ حوسێن مامۆستای زانکۆیە.

٣. ناصح: پزیشکە.

سەرچاوەکان:

١. القول المنصف ٢٢٧

٢. اسهمام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢١٧ – ٢٦٥.

## محەممەد طاها بالیسانی (١٣٦٨)

ناوی محەممەد طاهایە، کوڕی یەحیای کوڕی سولەیمانی کوڕی محەممەدە، نازناوی (أبوالفیض)ە، لە گوندی (بالیسان) هاتووتەدنیا، زانایەکی گەڕیدە بووە، چوویتە (بەغدا) لەوێ بۆ (حیجاز) لەوێ بۆ (شام)، ساڵی ١١٥٥ك – ١٧٤٢ز گەڕا لە چەند شوێنانی کۆن، لەو بابەتە کتێبی (رحلة الکردي في بغداد ومکة والشام والبقاع الأثرية)ی دانا.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٠/١٠٧.

٢. معجم أعلام الکورد ٦٥٩.

## محەممەد طاهیر بریفکانی (١٣٦٩)

مامۆستا شێخ محەممەد طاهیر بریفکانی، دەستی کرد بە خوێندن، لە قۆناغی سوختەیی سەرکەوت، هاتە گوندی (پیرزین) نزیك (هەولێر)، ماوەك چووە لای مەلا عوسمانی شەوەکی، دوایی چووە (موصل) لای شێخ محەممەد رضوانی ئیجازەی وەرگرت،

دەستی کرد بە دەرسدانەوەی ئالقەیی، لە مزگەوتی (رضوان)، پاشان لە ماڵەوە دانیشــت، قوتابی دەچوونە لای.

مامۆستا جگە لە مەلایەتی شێخی تەریقەتی (قادری) بوو، ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد، زۆر دەردەچوو بۆ ناوچەی (ئەتروش) و (مزوری) و (عەشائیر سـەبعە)، بـەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام تا ساڵی ١٩٦٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: أسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٣١.

## محەممەد طاهیر دیاربەکری (١٣٧٠)

ناوی محەممەد طاهیرە، کوڕی عومەری کوڕی مصـطەفـا عـورف زادەی حەسـەنیە، ساڵی ١٢١٥ك – ١٨٠٠ز لە (دیاربەکر) هاتەدنیا، تەمەنی حەوت ساڵان بوو لە خزمەت باوکی چووە (دیمشق)، دەستی کرد بە خوێندن، لەلای باوکی و چەند زانایانی تر کۆتـایی بە خوێندن هێنا، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، فێری زمـانی (تـورکی) بـوو، لــە مەزهـەبی حەنەفی شارەزا بوو، لە مزگەوتی گەورەی (ئومەوی) کرا پێش نوێژ، دوایـی کـرا (ئـەمین فەتوا)، دوایی کرا (موفتی)، شوێنی تایبەتی لە قوتابخانەی (چەقمەقی) هەبوو، پاشان ئـاژاوە پەیدابوو، دوورخراوە بۆ قەڵاتی (ماغوصە) لە (قوبرص)، دوایی گوازرایەوە (ئیزمیر) پـاش سێ ساڵ ناردرا (ئەستانە) لەوێ بەردرا، کرا قازی (بنغازی) دوایی کرا قازی (خەرپوت)، دوایی کرا قازی (حەما)، گەڕاوە (دیمشق) کرا جێگری دادگای شەرعی.

مامۆستا زاتەکی شەرع زان و زیرەك بوو، دوور لە دنیا و ڕوو لە خێـر بـوو، بۆ خەڵکان بە سـوودبوو، لــە ٦ی ڕەبیعـی دووەم، سـاڵی ١٣٠١ك – ١٨٨٣ز کۆچـی دوایی کرد.

سەرچاوە: نثر الجواهر والدرر ٢/١٢٦٠ – ١٢٦١.

## محەممەد طاهیر کوردی (١٣٧١)

ناوی محەممەد طـاهیرە، کوڕی حـاجی عبـدالقادر شـازەمان کـوڕی مـەحمودە، عبدالقادر دانیشتوی قەڵاتی هەولێر بوو، بە نیازی سەفەری حەج چووە (مەککە)ی پـیرۆز

لەوێ نیشتەجێ بوو، ساڵی ١٩٠٢ز ئەو کوڕە هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە قوتابخانەی (الفلاح)ی (مەککە) سەرەتایی تەواوکرد، ساڵی ١٩٢٢ز لە خزمەت باوکی چووە (میصر) لە (جامع الأزهر) وەرگیرا، هەر لەوێ لەلای مامۆستا عبدالعزیزی ڕوفاعی فێری جۆرە نووسینەکان و نەخش و نیگار بوو، ساڵی ١٩٢٥ز بڕوانامەی (دبلۆم)ی وەرگرت، گەڕاوە (مەککە) ساڵی ١٩٣٠ز لە قوتابخانەی (الفلاح) کرا مامۆستای خەت ساڵی ١٩٣٤ز دووبارە گەڕاوە (میصر)، ساڵی ١٩٣٩ز کتێبی (تأریخ الخط العربي) لە چاپدا، گەڕاوە (مەککە) نمونەی خەتی (نسخ) و (ثلث)ی لە چاپدا، ساڵی ١٩٤٦ز دەستی کرد بە نووسینەوەی قوڕئانی پیرۆز، ساڵی ١٩٥٠ز تەواوی کرد، لە چازانی مامۆستا دەڵێن: سوڕەتی (یاسین)ی لەسەر یەك (هێلکە) نووسیتە، ساڵی ١٩٦٤ز سەفەری (هەولێر)ی کرد، لەلای غەفور چەلەبی خاڵی دابەزی.

بەشێك لە قوتابییەکانی: یوسف ذنون، ولید الأعظمي، یحیی سلوم عباس، محمد صالح الموصلي.

مامۆستا چەند دانراوی لە بابەت خەت و ئایین هەیە، لەوانە:

١. التاریخ القویم: مێژووی (مەککە)یە، چوار بەرگی چاپ کراوە، ئەوی تر دەست نووسن.
٢. الأحادیث النبویة في الآداب الدینیة.
٣. التفسیر المکي.
٤. أدبیات في الشاي والقهوة والدخان: ساڵی ١٩٦٧ز لە (جدة) لە چاپ درا.
٥. تأریخ الخط العربي وآدابە: ساڵی ١٩٣٩ز لە (قاهیرە) چاپ کرا.
٦. تأریخ القرآن وغرائب رسمه وحکمه.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٨٠ز لە (مەککە)ی پیرۆز کۆچی دوایی کرد، برایەکی زانای هەبوو، ناسرابوو بە (محەمەد مەککی کوردی) مطوفی حاجیان بوو، چەند

نامیلکەی دەربارەی چۆنیەتی حەج داناوە، چاپی کردووە، پێشکەشی دەکردن بە وانەی دەچوونە لای.

سەرچاوەکان:

١. نثر الجواهر والدرر ٢/١٢٥٧ – ١٢٥٩.

٢. معجم أعلام الكورد ٦٥٦ – ٦٥٨.

٣. أسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٦٩.

٤. هەولێرم وادیوە ٦٥ – ٦٦.

٥. ئاسۆی فۆلکلۆر ٢٠٠١/٤ز ٩٤ – ٩٥.

٦. خۆری ئیسلام ٢٠٠٥/٢٨ز ٥٣.

## محەممەد طاهیر مائی (١٣٧٢)

شێخ محەممەد طاهیر، یەك بووە لە مەلایە چاکەکانی دەڤەری (مائێ) قەزای (ئامێدی)، لەو شوێنە دەرسی داوە و زانیاری بەلاوکردوتەوە، زۆرجاران لە ناوچەکە دەگەڕا بۆ ووتووێژ لەگەڵ زانایەکان، بۆ لابردنی گیروگرفتەکان، مامۆستا شیعری کوردی و عەرەبی و فارسی هەیە، دەوری ساڵی ١٩١٨ز کۆچی دوایی کرد، کوڕی ئەو (ئەنوەر) مائییە، ساڵی ١٩١٣ز هاتەدنیا، لە (بامەڕنێ) و (زاخۆ) و (دهـۆك) و (ئامێدی) خوێند، زیرەك و نووسەر و مێژنووس بوو، نووسینی کوردی و عەرەبی هەیە، لە ١٩٦٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: أسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٣١.

## محەممەد عارف ئەرضرۆمی (١٣٧٣)

ناوی محەممەد عارفە، کوڕی محەممەدە، ناسراوە بە: (قاضی زادە)، خەڵکی شاری (ئەرضرۆم)ە، شەرع زان و کەلام زان بووە، ساڵی ١١٧٣ك – ١٧٦٠ز کۆچی کرد.

چەند دانراوی خۆی هەیە، لەوانە: (بحر الفتاوى) و (الرسالة السعدية) و (شرح روضات الجنات) و (شرح كلمة التوحيد).

سەرچاوەکان:

١. هدية العارفين ٢/٣٣٣.

٢. معجم المؤلفين ١٠/١١٥.

## محەممەد عەبباد ئەخلاطی (١٣٧٤)

ناوی محەممەدە، کوڕی عەببادی کوڕی مالیکی کوڕی داودی کوڕی حەسەنی کوڕی داودە، نازناوی (ئەبو عبدالله صەدرەدین)ە، مەزهەبی حەنەفی بوو، زانایەکی شەرع زان و فەرموودەناس بووە، ساڵی ٦٥٢ك – ١٢٥٤ز کۆچی دوایی کردووە.

ئەو کتێبانەی داناون: (تلخيص الجامع الكبير) و (مقصد المسند) و (تعليق على الجامع الصحيح).

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٦٠٨.

٢. تاج التراجم ٢٦٢.

٣. معجم المؤلفين ١٠/١١٨.

٤. كشف الظنون ١/٤٧٢.

٥. هدية العارفين ٢/١٢٥.

## محەممەد عەبباس دەنیسەری (١٣٧٥)

ناوی محەممەدە، کوڕی عەبباسی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عوبێدە، ناسراوە بە: (عمادەدین)، خەڵکی (دەنیسەر)ی نزیك شاری (ماردین)ە، ساڵی ٦٠٦ك – ١٢٠٩ز هاتەدنیا، بۆ خوێندن چووە (شام) و (میصر) تا شارەزا بوو لە مەزهەبی شافیعی، نووسەر و شاعیر بوو، دکتۆرەکی چاك بووە، ساڵی ٦٨٦ك – ١٢٨٧ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (المقالات المرشدة في درج الأدوية المفردة) و (نظم مقدمة المعرفة) و (نظم الترياق الفاروقي).

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٣/٣١٤.
٢. شذرات الذهب ٥/٣٩٧ – ٣٩٨.
٣. فوات الوفيات ٣/٣٩٢ – ٣٩٤.
٤. كشف الظنون ٢/١٧٨٤.
٥. معجم المؤلفين ١٠/١١٨ – ١١٩.
٦. هدية العارفين ٢/١٣٦.
٧. إيضاح المكنون ٢/٣٢٨.
٨. معجم أعلام الكورد ٦٠٨.

**محەممەد عبدالرحمان کوردی (١٣٧٦)**

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالرحمانی کوڕی محەممەدئەمینی کوردیە، خاوەنی (تنوير القلوب)ە، زمان زان و زمان ڕەوان و نووسەر و ڕۆشنبیر بووە، لەسەر ڕێبازی ئەهلی تەصەووف ڕۆیشتووە، بوخاری شەریف و (موطأ)ی ئیمام مالیك و تەفسیری بەیزاوی لەلای سەلیم بیشری سەرۆکی ئەزهەر خوێند، پلەی (دکتۆرا)ی وەرگرت، کرا ووتارخوێن و پێش نوێژ، کتێبانی (تأريخ البلاغة) و (نظرات في البيان)ی داناوە، ساڵی ١٤٠٨ك – ١٩٨٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. عقد الجوهر ٢٠٨٠ – ٢٠٨١.
٢. معجم أعلام الكورد ٦٥٩.

**محەممەد عبدالرحمان ماردینی (١٣٧٧)**

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالرحمانە، خەڵکی (ماردین)ە، نازناوی ئەبو مەنصورە، مەزهەبی حەنەفی بووە، لە (قودس) نیشتەجێ بووە، دەرسی بە ئەبوبەکری قەلقەشەندی داوە، لە ١٥ی مانگی (محرم)ی ساڵی ٨٠٢ك – ١٣٩٩ز کۆچی کرد.

سەرچاوە: الضوء اللامع ٨/٣٩.

## محەممەد عبدالرحیم ئورمەوی ( ١٣٧٨ )

ناوی محەممەدە، نازناوی (صەفیەدین)ە، کوڕی عبدالرحیمی کوڕی محەممەدە، خەڵکی (ورمێ)یە، لە مانگی ڕەبیعی دووەم ساڵی ٦٤٤ك - ١٢٤٦ز لە (هیند) هاتەدنیا، لەلای بابی داکی (باپیری لە داك را) فێری شەریعەت بوو، ساڵی ٦٦٧ك چووە (یەمەن) لەوێ چووە حەج، پاشان چووە (میصر) چوار ساڵان لەوێ ماوە، ئەمجا چووە (کۆنیا) یازدە ساڵان لەوێ ماوە لەلای خاوەنی کتێبی (التحصیل) چەند زانیاری وەرگرت، ساڵی ٦٨٥ك چووە (دیمشق) لەوێ کرا سەرۆکی زانایان، لە قوتابخانە بەناوبانگەکان دەرسی دەداوە، زاتەکی بە دین و پڕ خێر و بڕوا چاك بووە، بەشێکی زۆری قورئانی پیرۆزی لەبەربوو، ئیمامی سوبکی و ئیمامی ئەسنەوی مەتحیان کردووە.

دانراوەکانی: (الزبدة) و (الفائق) و (النهایة) و (الرسالة السیفیة).

کۆچی دوایی: لە مانگی صەفەری، ساڵی ٧١٥ك - ١٣١٥ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٣٧.

٢. البدایة والنهایة ١٤/٨١.

٣. البدر الطالع ٢/١٨٧.

٤. کشف الظنون ١/٨٧٣.

٥. هدیة العارفین ٢/١٤٣.

٦. معجم المؤلفین ١٠/١٦٠ - ١٦١.

## محەممەد عبدالرحیم چورستانی (١٣٧٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی مەلا عبدالرحیمی کوڕی عومەری کوڕی شەریفی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی محەممەد ئاغای کوڕی پیرخدری شاهۆیە، عەشیرەتی (میرئاودەلی)یە، ساڵی ١٨٩٤ز لە گوندی (ئابلاغ) نزیك (سلێمانی) هاتەدنیا.

خوێندنی: لە خزمەت باوکی دەستی بە خوێندن کرد، پاشان باوکی بووە مەلای مەجید بەگی جاف لە (هەڵەبجە)، ئەویش لەوێ لەلای فەقێیەکان دامەزرا، دوایی باوکی باری کرد بۆ (سلێمانی)، ئەویش چووە (هیران) لای کاك مصطەفا، دوایی باوکی باری کرد بۆ (بەرزنجە) لەوێ کۆچی دوایی کرد، مامۆستاش کۆتایی بە خوێندن هینا.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (سەراو)ی شاربازێر، پاشان چووە (بادین) لە پشدەر، دوایی چووە (ڕانیە)، لەوکاتە خەڵکی ناوچەکە لە دژی داگیرکاری ئینگلیز بەشەرهاتن، ئەویش ناوچەکەی بۆمباباران کرد، لە ئەنجامدا کتێبخانەی مامۆستا سووتا، ساڵی ١٩٣٢ز چووە (سلێمانی)، ساڵی ١٩٣٦ز کرا مەلای مزگەوتی (نەقیب).

کۆچی دوایی: ڕۆژی پێنج شەمەی، مانگی نیسان، ساڵی ١٩٦٣ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (گردی جۆگە) بە خاك سپێردرا.

مامۆستا جگە لە مەلایەتی شاعیریش بوو، نازناوی شیعری (چورستانی) بوو دیوانی شیعری کوردی هەیە، چاپ کراوە، بابەتەکانی ئەمانەن: پاڕانەوە، گەورەیی خوا، یادی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ)، ئەوین و عەشق، نەتەوایەتی، ناووخاك، بەهار و نەورۆز....

نمونەی شیعرە ئاینیەکانی:

لە مەحشەدرا شەفاعەت کردنی طاها ڕەجامانە
که عەزم و هیممەتی بۆ ئوممەتی داماوی دەرمانە

شەفیعی (رحمة للعالمین) بێ، غیرەتی وایە
نەبێ ڕازی بێ، ئوممەتی دووچاری خوسرانە

شەفاعەتیە ئومێدم گەرچی بێ مایەم لە پەیڕەویا

کە ئەو کانی کەرەم، دەس مایەی ڕەحمی گەدایانە

بە جاهی خۆت لە ڕۆژی (أمتي، واشفع تشفع)دا

لە هاوارم وەرە وەختێ، جەنابت سەدری دیوانە

لە کۆتاییدا دەڵێ:

دوعای خێرم ڕەجایە ئەی براگەل بۆ بکەن خێرە

ئەگەرچی شیعرەکانم وەك دڵم خاو و پەرێشانە

سەرچاوەکان:

١. تأريخ مشاهير كورد ٢/٣٩٠.

٢. مێژووی ئەدەبی کوردی ٦/٢٣٧ – ٢٤٧

## محەممەد عبدالرحیم عێراقی (١٣٨٠)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالرحیمی کوڕی حوسێنی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی زەینی ئەبو فەضلە، برای وەلیەدین ئەحمەد ئەبو زەرعەی کوردی عێراقییە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (قاهیرە) دانیشتووە، ماوەك دەرسی دەداوە، دوایی وازی هینا، زاتەکی بەڕێز و دیمەن جوان بوو، ساڵی ٨٠٢ك – ١٣٩٩ز چووە سەفەری حەج، لەبەر نەخۆشی حەجی پێنەکرا، گەڕاوە، هەر بەهۆی ئەو نەخۆشییە کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الضوء اللامع ٨/٤١.

## محەممەد عبدالرحیم میلانی (١٣٨١)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالرحیمی کوڕی حوسێنی عومەری (میلانی)یە، (میلان: گوندێکە و ناوی عەشیرەتێکی کوردە)، دەرسی لەلای ئەحمەد حوسێن چارەپەردی خوێندووە، دوایی (موغنی) ماموستای شەرح کردووە، سەرەتایەکەی بە: (الحمدلله الفاطر الحكيم...) دەست پێ دەکات، لە عەرەبستان ئەو کتێبە ناودەبردرێت بە (مغني الأكراد)، بە هۆنراوە مەتحیان کردووە:

كتاب جليل القدر ليس كمثله بجمع تصانيف النحاة أولي الفخر
فكيف لقاريه الفخار لأنه تملك علما ليس يستحصي في حصر
ويكفي له فخرا لقد جاء اسمه بمغن للأكراد يشفي ذوي الضر

نوسخەکی دەستنووسی ئەو کتێبەمان لەلایە، ساڵی ١٠٩٥ك نووسراوە.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ١/٣٩٢ – ٣٩٥.
٢. کشف الظنون ٢/١٧٥١.
٣. معجم المؤلفين ١٠/١٥٨.

## محەممەد عبدالرزاق کورد عەلی (١٣٨٢)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالرزاقی کوڕی محەممەدە، ناسراوە بە (کورد عەلی)، خەڵکی ناوچەی (سلێمانی)یە، ساڵی ١٢٩٣ك – ١٨٧٦ز لە (دیمشق) هاتەدنیا، باوکی لەبەر خوێندنی دانا، ناردیە قوتابخانەی (الرشدیة)، تەمەنی دوازدە ساڵان بوو باوکی کۆچی دوایی کرد، بەڵام وازی لە خوێندن نەهینا و کۆڵی نەدا، فێری زمانی تورکی و فارسی و فەڕەنسی بوو، دیوانی (متنبي) و مەقاماتی حەریری لەبەرکرد، کرا سەرۆکی کۆڕی زانستی عەرەبی، گۆڤاری (المقتبس)ی دەرکرد، ساڵی ١٣١٥ك گۆڤاری (الشام)ی سەر بە حکومەت دەرکرد، دوایی گۆڤاری (المقتطف)ی دەرکرد، ساڵی ١٣١٩ك – ١٨٠١ز چووە (میصر) ڕۆژنامەی (الرائد)ی دەرکرد، گەڕاوە (دیمشق) لەوێ لەلای والی تورك زمانیان لێدا، لەسەر فەرمانی والی ماڵەکەیان پشکنی، هەرچەندە چیان نەدیتەوە گومانی لێ بکرێت، بەڵام مامۆستا دڵی شکا دیمشقی بەجێ هێشت، گەڕاوە (میصر) لەوێ ساڵی ١٣٢٤ك – ١٩٠٦ز گۆڤاری (المقتبس) و ڕۆژنامەی (الظاهر) و (المؤید)ی دەرکردن، ساڵی ١٩٠٨ز گەڕاوە (دیمشق) دیسان تومەتیان پێکرد، کەوا دژی حکومەتی عوسمانی نووسیوە، هەڵات بۆ (میصر)، لەوێ بۆ (ئاورووپا)، پاشان چاوپۆشی لێکرا، گەڕاوە ڕۆژنامەی (الشرق)ی دەرکرد، لە ژیانی دووجار دەوری وەزیری دیتووە.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٧٢ك - ١٩٥٢ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوی زۆرن، لەوانە: (خطط الشام) و (تأريخ الحضارة) و (غرائب الغرب) و (أقوالنا وأفعالنا) و (دمشق مدينة السحر والشعر) و (امرأء البيان) و (غابر الأندلس وحاضرها) و (الإسلام والحضارة العربية) و (القديم والحديث) و (كنوز الأجداد) و (المذكرات) و (الإدارة الإسلامية في عز العرب) و (غوطة دمشق).

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٣٧٨ - ٣٨٠.

٢. معجم المؤلفين ١٠/١٦٢.

٣. الأعلام ٧/٧٣ - ٧٥.

## محەممەد عبدالرەسول بەرزنجی (١٣٨٣)

ناوی محەممەدە، کوڕی سەید عبدالرەسولی کوڕی قەلەندەری کوڕی عبدالسیدی کوڕی عبدالرسولی حوسێنی بەرزنجی یە، لە ١٢ی مانگی مەولود، ساڵی ١٠٤٠ك - ١٦٣٠ز لە (بەرزنجە) هاتووتەدنیا.

لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (مەدینە)ی پیرۆز، لەلای مەلا شەریفی کورانی و مەلا ئیبراهیمی کورانی خوێندنەکەی بردەسەر، مامۆستا سەفەری کردووە بۆ (هەمەدان) و (بەغدا) و (دیمشق) و (حەلەب) و (ئەستەمبۆڵ) و (ماردین) و (میصر) و (مەککە) و (مەدینە)، پاشان لە مەدینە کرا مودەرریس، دوایی کرا سەرۆکی زانایان.

کۆچی دوایی: لە ٤ی (محرم)ی ساڵی ١١٠٣ك - ١٦٩١ز لە (مەدینە) کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: نزیکەی حەفتا دانراوی خۆی هەیە، لە (هدیة العارفین ٦/ ٣٠٢ - ٣٠٣) ناوەکانیان هەیە، بۆ نمونە:

١. الجانب الغربي بحل مشكلات ابن العربي: لە فارسی تەرجومەی کردووە بۆ عەرەبی.

٢. مخرج المنباك في دخان التنباك.

٣. الفصول في مناقب عبد الرسول: لە مەتحی باوکی.

٤. شرح الهمزية.

٥. السهام الصواب لأولي الألباب.

٦. التأييد والنصر والعون للقائل بكفر أبي جهل وفرعون.

٧. شرح الخارق وجهل المارق.

٨. الإشاعة لأشراط الساعة.

سەرچاوەکان:

١. الأعلام ٢/١٧ /٧/٧٥.

٢. تأريخ السليمانية ٢٧٧ – ٢٧٨.

٣. معجم أعلام الكورد ٦١٢.

٤. تزيين العبارة لتحسين الإشارة / پێشەکی – ٧ –.

٥. الشيخ معروف النودهي ٧٤.

٦. هدية العارفين ٦/٣٠٢.

٧. إيضاح المكنون ٣/٥٩.

٨. مشاهير الكورد ٢/١٢٨.

٩. معجم المؤلفين ١٠/١٦٥.

١٠. سلك الدرر ٤/٦٥ – ٦٦.

١١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٧/٢٦٢ – ٢٦٧.

## محەممەد عبدالله (بەدرەدین) (١٣٨٤)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالله یە، نازناوی (بەدرەدینە) خەڵکی (هەولێر)ە، ساڵی ٦٨٦ك – ١٢٨٧ز یا ساڵی ٦٨٠ك – ١٢٨١ز هاتووتەدنیا، لە قوتابخانەی (مەرجان) لە بەغدا دەرسی داوە، شاعیر و نووسەر بووە، ساڵی ٧٧٥ك – ١٣٧٣ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٣/٤٨٦.

٢. شذرات الذهب ٦/٢٣٨.

٣. معجم أعلام الكورد ٦١٤.

## محەممەد عبدالله بەندەنیجی (١٣٨٥)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالله ی کوڕی موبارەکی کوڕی کەرەمە، خەڵکی (بەندەنیج – مەندەلی)یە، پاشان چوویتە (بەغدا)، ساڵی ٥٣٨ك – ١١٤٣ز ئیجازەی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بی) وەرگرتووە، بەشێك لە فەرموودەکانی کتێبی (حلیة)ی ئەبو نوعەیمی گێڕاوەتەوە، ساڵی ٦٢٥ك – ١٢٢٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: سیر أعلام النبلاء ١٣ – ١٤٨ – ١٤٩.

## محەممەد عبدالله (بن تەیمییە) (١٣٨٦)

ناوی محەممەدە کوڕی عبدالله یە کوڕی عبدالحلیمی کوڕی عبدالسلامی کوڕی تەیمییەیە، ساڵی ٧٥٧ك – ١٣٥٦ز هاتەدنیا، مەزهەبی حەنبەلی بووە، لە (دیمشق) دانیشتووە، لەوێ خەریکی بازرگانی بوو، دوایی کرا قازی لە (ئەسکەندەری)یە، هەروەها دکتۆرەکی چاك بوو، ڕۆژی یەك شەمەی ١٧ی مانگی ڕەمەزان، ساڵی ٨٣٧ك – ١٤٣٤ز لە (قاهیرە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٧/٢٢٥.

## محەممەد عبدالله جزیری (١٣٨٧)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبداللە یـە، نازنـاوی شەمسـەدینە، مەزهـەبی شـافیعییە، شەرع زان و زیرەك و ڕۆشنبیر بووە، چوویتە (عەدەن) چەند پلە و پایەی پێدراوە پاشـان بەندکرا و ئازاردرا، ماڵەکـەی داگـیر کـرا، دوایـی بـەردراو ڕزگـارکرا، دەوری سـاڵی ٦٦٠ك – ١٢٦١ز کۆچی کرد، کتێبـی (المختصر في الرد على اهل البدع)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٦١٣.

٢. معجم المؤلفين ١٠/٢٠٧.

٣. الأعلام ٧/١١١ /١٠/٦٠.

## محەممەد عبدالله جەلی (١٣٨٨)

ناوی محەممەدە، کـوڕی مـەلا عبـدالله ی کـوڕی مـەلا ئەسـعەدی (جەلی)یـە، ناسراوە بە: (جەنابی مەلای – مەلای گەورە)، دایکـی عائیشـەخانە، کچـی حـاجی بـەکر ئاغای حەوێزییە، ساڵی ١٨٧٦ز هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لەلای موستەعیدەکانی باوکی دەستی کرد بە خوێندن، تـا کتێبـی (الخادم)ی تەواوکرد – کـە دانـراوی باپیرەگـەورەیتی –، ئـەمجا چـووە خزمـەت بـاوکی زانستەکانی تەواو کرد، ساڵی ١٨٩٤ز لە تەمەنی ١٨ ساڵی دا ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: دەستی کرد بە دەرسدانەوە، ساڵی ١٩٠٨ز باوکی کۆچـی دوایـی کرد، هەموو پلە و پایەکانی باوکیان بەوی دا، ساڵی ١٩١٢ز کرا موفتی (کۆیە)، سـاڵی ١٩١٥ز کرا ئەندامی ئەنجومەنی زانستی (موصل)، سـاڵی ١٩١٩ز کـرا قـازی (کۆیـە)، ساڵی ١٩٢٤ز کرا ئەندامی ئەنجومەنی دامەزراندنی عێـراق لـە (بەغـدا)، پاشـان گـەڕاوە (کۆیە) ساڵی ١٩٢٨ز وازی لە فەرمانبەری هێنا، خـۆی دەسـت بـەتاڵ کـرد، تـەنیا بـۆ دەرسدانەوە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا ئەحمەدی ئەفەندی ئاکریێ، مەلا محەممەد مودەرریسی دهۆك، مەلا شێخ محەممەدطاهیری شۆشی، مەلا ئەبوبەکری کۆیی، مەلا صادیقی ماویلیان، مەلا عبدالقادر کانی دەربەندی، مەلا مەحمودی (ڕاجی)، مەلا شێخ عبدالکریمی ئۆمەراوا، مەلا فتح الله ی هەرتەلی، مەلا محەممەدی شێروانی – قەپران، مەلا مەعصومی هەورامی، مەلا عبدالحمیدی عەسکەری.

جەنابی مەلا کاتی جەنگی گەورەی جیهانی، ووتارخوێندنەوەی ڕۆژانی هەینی بە شێخ نورەدینی برا گچکەی سپارد، خۆی خەریکی فەتوا و دەرسدانەوە و نووسین بوو.

چەند دانراوی هەیە، زۆربەیان دەست نووسن چاپ نەکراون، ناوەکانیان:

١. المصقول في الاصول: ساڵی ١٩٨١ز لە (بێروت) چاپ کراوە، فائیزی مەلا بەکر ساڵی ٢٠٠٩ز لێکۆڵینەوەی لە سەر کرد، وەك نامەی دکتۆرا پێشکەشی زانکۆی کرد.
٢. القائد في العقائد.
٣. الكلام.
٤. الكلام الجديد.
٥. حقيقة الايمان.
٦. المشاهد: لەسەر شێوەی مەقاصیدی تەفتازانییە.
٧. الاله والطبيعة والعقل والنبوة.
٨. المعجزات والكرامات
٩. حقيقة الإسلام.
١٠. أبهي المآرب، وإثبات الواجب.
١١. كشف الأستار، في مسألة الإختيار.
١٢. ضياعان عظيمان.
١٣. الأشخاص الستة.

١٤. الحدس سلم الإرتقاء.

١٥. خراب العالم.

١٦. غايتي وأملي في علمي وعملي.

١٧. حكايات خەون و كەرامات

١٨. دیاری مەلا محەممەدی کۆیی.

١٩. عەقیدەی ئیسلام.

٢٠. نوێکەرەوە (مجدد).

٢١. فڕی فڕی قەل فڕی.

٢٢. الوسيلة في علم أصول الفقه.

٢٣. تەفسیر قورئانی پیرۆز بە کوردی، ساڵی ١٩٤٣ز تەواوی کرد، لە ١٩٦٨ز چاپ کرا، ساڵی ٢٠٠٩ز هەموو بەرگەکان پێکەوە چاپ کران، جگە لەو حاشیە بەنرخانەی لەسەر (جمع الجوامع) و (تحفە) و کتێبانی تری هەیە.

کۆچی دوایی: لە بەرواری ١٩٤٣/١٠/١٢ز کۆچی دوایی کرد، پەرتوکخانەکی دەوڵەمەند لە کتێبانی باوك و باپیرانی لە پاش بە جێما.

وە هەروەها کوڕێکی لە پاش بەجێما، ناسرابوو بە: (مامۆستا مەسعود محەممەد)، لە ١٩١٩ز لە دایك بوو، لە ساڵی ١٩٥٢ز کرا حاکم، ساڵی ١٩٥٣ز کرا ئەندامی کۆڕی نائیبان، ساڵی ١٩٦٤ز کرا وەزیری دەولە، ساڵی ١٩٦٦ز کرا ئەندامی ئەنجومەنی خزمەتگوزاری لە (بەغدا)، ساڵی ١٩٧٥ز تا ساڵی ١٩٧٨ز سەرۆکی کاتی کۆڕی زانیاری کورد بوو و زانا و زیرەك و مێژووناس و ڕۆشنبیر و ئەدیب و نووسەر و زمان زان و زمان ڕەوان بوو، چەند کتێبی داناون، لەوانە:

١. إعادة التوازن إلى ميزان مختل: ساڵی ١٩٧٧ز چاپ کرا.

٢. من هموم الحياة: ساڵی ١٩٨٨ز چاپ کرا.

٣. گەشتی ژیانم.

٤. حاجی قادری کۆیی: سێ بەرگە.

٥. چەپکێك لە گوڵزاری (نالی).

٦. دەستە و دامانی (نالی).

٧. مرۆڤ و دەوربەر.

٨. إلى العظيم غورباتشۆف.

لە ٢٠٠٢/٤/١ز لە (هەولێر) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. المصقول ١٣- ٣٢.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٣٤ – ٥٣٦.

٣. مشاهير الكورد ٢/١٣٥ – ١٣٦.

٤. معجم المؤلفين ١٠/٢٣٣.

٥. مێژووی ئەدەبی کوردی ٥/٣٠٣ – ٣٧٨.

٦. محمد بن عبدالله الجلي ١٠٢ – ١١٦.

٧. بنەماڵەی زانیاران ٥٦٣ – ٥٦٥.

٨. الأعلام ٧/١٢٤.

٩. معجم أعلام الكورد ٦٧٩ – ٦٨٠.

١٠. أعلام كورد العراق ٧٣٦ – ٧٨٢.

١١. خۆری ئیسلام ١٩٩٨/١ز / ٢٠٠٣/٢٠ز.

دیاری خۆم بۆ جەنابی مەلا گەورەی (کۆیە)

سمي حبيب الله مفخر عصره — لشرح قواعد الأصول المسدد

تسربل سربال المعارف والهدى — أتاه المعالي كل صوب ومقصد

علت ذروة العلى ثواقب فكره — فجاء له العلم مع الفخر والمجد

تضلع في شتي العلوم باسرها — وما خاف في الله من ملامة حسد

فحسن نبات الأرض من كرم البذر سليل كرام النجب، في كل مشهد
وتحريره رمز الفخار لشعبنا فمصقوله المصقول، سيف المهند
وسيلته، القائد، كذاك المشاهد على طرز ما جاء المقاصد للسعد
بكشفه للأستار، أبهى المأرب تنادي دعاة الحق في القرب والبعد
حواش على جمع الجوامع والتحفة بفضل يراع مع بنان ومع يد
وتفسيره الكردي قد طاب ذكره فأحسن به في كل حفل ومعهد
ألا يا (أبا المسعود) ذكرك خالد سلام عليك، يوم موت ومولد
و (طاهر) يدعو رافع الأيدي للسما لأعلامنا الكرد، ذوي العز والمجد

٢٥/٨/٢٠٠٩ز.

لە ٢٠٠٩/١٠/١٠ لەزانكۆی کۆیەم خوێندەوە، لە کۆڕێکی گەورە بەیادی ئەو مامۆستایە بەسترابوو.

## محەممەد عبدالله حەڕانی (١٣٨٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالله ی کوڕی عەبباسی کوڕی عبدالحمیدە، خەڵکی (حەڕان)ە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، ساڵی ٤٨٤ك – ١٠٩١ز هاتەدنیا، لە ٥٦٠ك – ١١٦٤ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (روضة الأدباء)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٢/٢٦٧.
٢. هدية العارفين ٦/٩٤.
٣. معجم المؤلفين ١٠/٢٢١ – ٢٢٤.
٤. سير أعلام النبلاء ١٢/١٩٤.
٥. المنتظم ١٠/٤٧١.
٦. معجم أعلام الكورد ٦١٤.
٧. الأعلام ٢/١٨٢ /٦/١٢١ /٧/١٠٦.

## محەممەد عبداللە خەرپانی (١٣٩٠)

ناوی محەممەدە، کوڕی مەلا عبداللە ی، کوڕی شێخ ئیسماعیلی کوڕی شێخ محەممەدی کۆسەیە، لە مەدرەسەی باوکی دەستی کرد بە خوێندن، لە ژیانی باوکیدا لە چەند شوێن گەڕا بۆ خوێندن، پاش کۆچی دوایی باوکی ماوەك چووە (کەرکوك)، پاشان چووە (بەغدا)، دوایی چووە (سنە)، لەوێ چووە (سابلاغ) ئیجازەی لە مەلا محەممەدی بانەیی وەرگرت، گەڕاوە (خەرپان) دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی و دەرسدانەوە، ساڵی ١٢٥٠ك – ١٨٣٤ز (تقریب المرام)ی نووسییەوە، هەروەها شیعری داناوە بە بۆنەی کۆچی دوایی باوکی، ساڵی ١٢٨٣ك – ١٨٦٦ز لە (خەرپان) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: بنەماڵەی زانیاران ١٩٩ – ٢٠٤.

## محەممەد عبداللە دیاربەکری (١٣٩١)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبداللە یە، خەڵکی (دیاربەکر)ە، لە (قوسطەنطینییە) دەرسی داوە، گەڕاوە وڵاتی خۆی لە ڕێگادا ساڵی ١٠٩٧ك – ١٦٨٥ز کۆچی دوایی کرد، حاشیەی لەسەر شەرحی (نخبة الفکر) هەیە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٥٠٦.

٢. معجم أعلام الکورد ٦١٤.

٣. هدیة العارفین ٢/٢٩٩.

٤. معجم المؤلفین ١٠/٢٠١ – ٢٠٢.

## محەممەد عبداللە دیاربەکری (١٣٩٢)

ناوی محەممەدە کوڕی عبداللە یە، ناسراوە بە (ڕەزا) خەڵکی دیاربەکرە، ساڵی ١٠٩٠ك – ١٦٧٩ز هاتەدنیا، دکتۆر و ڕۆشنبیر بووە، کتێبانی (الاصفیة في الکلیات الطبیة) و (مختصر الانموذج)ی داناون، ساڵی ١١٨٠ك – ١٧٦٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الکورد ٦١٤.

٢. معجم المؤلفين ١٠/٢٠١.

٣. هدية العارفين ٢/٣٣٦.

## محەممەد عبداللە زیارەتی (١٣٩٣)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبداللە یە، خەڵکی گوندی (زیارەت)ی مەلا زادانە، دەکەویتە بناری کێوی (پیرمەم – سەربەن)، زانایەکی زیرەك و بەتوانا بووە کتێبی (چەغمینی) لەلای مەلا یەحیای مزوری خوێندووە، گوێی لە باسی (شەعیرییە) ڕاگرتووە، لە دەرسی مامۆستای حاڵی بووە، نامیلکەکی لەسەر ئەو باسە نووسیوە، سەرەتایەکەی (الحمدلله الذی أقام السموات بامره...) دەست پێ دەکا، پێشکەشی بە داود پاشای والی (بەغدا) کردووە، هەروەها (توحید الصانع، ببرهان التمانع)ی داناوە، ئەویشی پێشکەش بە داود پاشا کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماء ومدارس في أربيل ٩٢.

٢. بوژاندنەوە ٢/٣٦٣ – ٣٦٤ /٦/١٠١ – ١٠٢.

## محەممەد عبدالە شارەزوری (١٣٩٤)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبداللە ی کوڕی قاسمی شارەزورییە، نازناوی (کەمالەدینە) ساڵی ٤٩٢ك – ١٠٩٨ز هاتووتەدنیا، زانایەی شەرع زان بووە لە (بەغدا)ی خوێندووە، دوایی کرا قازی (موصل) لەوێ قوتابخانەی بەناوی شافیعییەکان دروست کرد، هەروەها مێوانخانەی خێراتی لە (مەدینە)ی پیرۆز دروست کرد، ساڵی ٥٤٢ك لە بەندیخانەی قەڵاتی موصل گیرا، دوایی بەردرا لە ماڵەوە دەست بەسەر بوو، ساڵی ٥٥٠ك چووە (شام) لای نورەدین مەحمود زەنکی، ماوەك لە (دیمشق) ماوە، ساڵی ٥٥٠ك – ١١٦٠ پلەوپایەی پێ درا، زاتەکی بەڕێز و بەخێر و خێرات بوو، شاعیر و

نووسەر و ڕۆشنبیر بوو، ڕۆژی پێنج شەممەی مانگی (محرم)ی ساڵی ٥٧٢ك – ١١٧٦ز لە (شام) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. وفيات الأعيان ٣/٣٧٥ – ٣٧٨.

٢. طبقات الشافعية الكبرى ٣/٣٦٩ – ٣٧٢.

٣. شذرات الذهب ٤/٢٤٣.

٤. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ٢/٩٩.

٥. المنتظم ١٠/٥٣٩.

٦. ژیناوەری زانایانی کورد ٤٧٢ – ٤٧٣.

٧. مشاهير الكورد ١/٢٦٣.

٨. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٥٨ – ٤٦٠.

٩. الأعلام ٣/٢٦٠ /٧/١٠٧.

١٠. تأريخ السليمانية ٢٥٨.

١١. معجم أعلام الكورد ٦١٥.

١٢. سير أعلام النبلاء ١٢/٣٥٥ – ٣٥٦.

## محەممەد عبدالله شەریفی (١٣٩٥)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبداللە یە، خەڵکی (دیاربەکر)ە، ناسراوە بە: (شەریفی – قەیاس)، زانایەکی مەنتیق زان بووە، کتێبی (السيف الناطق في علم المنطق)ی داناوە، ساڵی ١١٧٥ك – ١٧٦١ز تەواوی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٠٥.

٢. معجم المؤلفين ١٠/٢٠١.

٣. هدية العارفين ٢/٣٣١.

٤. معجم أعلام الكورد ٦١٤.

## محەممەد عبدالله شێخ وەتمانی (١٣٩٦)

ناوی محەممەدە، کوڕی مەلا عبدالله ی کوڕی مەلا مەحمودە، (مەلا مەحمود): ساڵی ١٧١٧ز هاتووتەدنیا، لە گوندی (خواجالی) پیرانشاری لاجان هاتە (وەسان)ی باڵەکاتی لای شێخ عەبباس خوێندنی تەواوکرد، ئیجازەی وەرگرت گەڕاوە (ئێران) دیتی گوندەکەیان بە دەست شای ئێران تێکدراوە، چاوی بەرایی نەدا لەو وڵاتە بمێنێ، هاتەوە (شێخ وەتمان) دەستی کرد بە دەرسدانەوە و مەلایەتی تا ساڵی ١٧٨٥ز لە گوندی (ناوبەرگە) کۆچی دوای کرد، دوای ئەو مەلا کاك عبدالله ی کوڕی لە جێی دانیشت، ئەویش زانایەکی بەرز بوو، حاشیەی لەسەر کتێبانی خوێندنی سەرەوە هەیە، ئەویش کۆچی دوایی کرد، کوڕی ئەو مەلا محەممەدە، کە ئێستا باسی دەکەین: مەلا محەممەد ساڵی ١٧٨٩ز لە گوندی (شێخ وەتمان) هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، هەر لەلای ئەو کۆتایی پێ هینا، زانایەکی زیرەك و بە توانا بوو حاشیەی لەسەر (پشدەری) شەرحی تشریح و (أشكال التأسیس) و (ئوسطرلاب) هەیە، مامۆستا مەلا عبدالله جەلی و حاجی قادری کۆیی لەلای ئەویان خوێندووە، لەگەڵ فەقێیەکان دەچوونە (سینگوڕە): کوێستانی شێخ وەتمانیان، هەر بەوبۆنەیە بۆیادگار، حاجی قادری کۆیی کاتی لە (ئەستەمبۆڵ) بوو، نامەکەی هۆنراوەی بۆ مەلا عبدالله ی جەلی ناردە (کۆیە) تێیدا نووسیوە، دەڵێ:

بەبیرت دێ زەمانێ چووینە باڵەك بە پێخاوسی نە کەوشم بوو نە کاڵەك
کە چووینە (سینگوڕە) سینەم گڕی بەست وەکو قەندیلی سەرگەردان وەکو مەست

مامۆستا چەند ساڵان لە شێخ وەتمان مەلا بوو، دەرسی دەداوە، پاشان ساڵی ١٨٦٧ز بە سەفەر هاتە (هەولێر) لەوێ کۆچی دوایی کرد لە گۆڕستانی (شێخ عبدالله – شێخەلـلا) بە خاك سپێردرا.

شەش کوڕی مەلای هەبوو: مەلا عبدالرحمان و مەلا بایەزید و مەلا کاك ئەحمەد و مەلا ئیسماعیل و مەلا عەلی و مەلا طاها.

سەرچاوەکان:

١. علماء ومدارس في أربيل ١٢١.
٢. بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز ٩١ – ٩٨.
٣. نامەی مەلا محەممەد شێخ وەتمان.

## محەممەد عبدالله شێروانی (١٣٩٧)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالله ی کوڕی محەممەدە، عەشیرەتی (شێروانی)یە، ساڵی ١٨٩٤ز لە (مەخمور) هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانی لە مەدرەسەکانی دەشتی هەولێر تەواوکرد، چووە گوندی (عالّلا) لای مەلا ئەمینی هەولێری، دوایی چووە (دیبەگە) لای مەلا عبدالفتاحی خەتێ، پاشان چووە (کۆیە) لای جەنابی مەلا محەممەدی جەلی، ساڵی ١٩٢٨ز ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە (کۆزەپانکە)، دوایی باری کرد بۆ (مەخمور)، پاشان چووە (شێخانان)، لەوێ باری کرد بۆ (قەپران)، لەو شوێنانە فەقێی هەبوون، دوایی لەلایەن حکومەت کرا مودەرریس، پاشان ماوەك دوورخراوە بۆ (کەرکوك)، دوایی هاتە (هەولێر) کرا بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئایینی لە (قەڵات)، دوایی خانەنشین کرا، لە ماڵەوە نیشتەجێ بوو، نزیك مزگەوتی شێخ نورەدین.

خورەوشتی: زاتەکی بە ئارام و خۆڕاگر بوو، قسەخۆش بوو، ڕووخۆش بوو، مەتەڵ و پەندی پێشینانی زۆر دەزانین، خەتی خۆش بوو، چەند حاشیەی بەنرخی لەسەر (تحفە) هەیە، هەروەها حاشیەکانی مەلایانی جەلی (کۆیە)ی هەموو کۆکردۆتەوە سەر نوسخە توحفەکەی خۆی، منیش سوودم لێ وەرگرتووە، لەسەر توحفەکەی خۆمانم نووسیون، خودا پاداشتیان بداتەوە.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٧٦ز لە (هەولێر) کۆچی دوایای کرد، لە گۆڕستانی گردی پیرداود بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: الإکلیل في محاسن أربیل ٣١٨ – ٣٢٠.

## محەممەد عبدالله عولاسە (١٣٩٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالله یە کوڕی عولاسەیە، خەڵکی (حەڕان)ە، لـەلای چەند زانایانی خوێندووە، خۆی دەرسی بە ئیبن موبارەك (١١٨ك – ١٨١ك) و وەکیـع و چەند زانایان داوە، دوایی کرایتە (قازی) ناسـراوە بـە قـازی جنۆکـەکان، گۆیـا کێشـەك دروست بووە لەسەر ئاوی بیرەك لە نێوان چینەك ئادەمیزاد و چـینەك جنۆکـە، هـەردوولا چوونە لای ئەو قازی یە، ئەویش پێکی هێناون لەسەر ئـەوە: ڕۆژان بـۆ ئادەمیزادەکـان و شەوان بۆ جنۆکەکان بی، دوای ئەو بڕیارە هەر کەس شەوان چووبایە سەر بیرەکە، بەردی بۆ دەهاوێژرا و دەردەکرا، خوا دەیزانی چۆنە.

سەرچاوە: سیر أعلام النبلاء ٥/٤٠٣ – ٤٠٤.

## محەممەد عبدالله کورد ئەفەندی (١٣٩٩)

ناوی محەممـەدە کـوڕی عبـدالله یـە، ناسـراوە بـە (کـورد ئەفەنـدی) خـەڵکی شارەزوورە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە مزگەوتی گـەورەی (بروسـا) دەرسـی داوە، سـاڵی ١٠٨٢ك – ١٦٧٣ز کۆچی دوایی کردووە، ئەو کتێبانەی داناون:

١. حاشیة علی تعلیقات عصام.
٢. حاشیة علی شرح الآداب.
٣. شرح الطریقة المحمدیة.
٤. شرح الکواکب الدریة.
٥. الفواتح المکیة ومرقاة العلوم العقلیة والنقلیة.

سەرچاوەکان:

١. هدیة العارفین ٢/٢٥٣.

٢. معجم المؤلفين ٢٣٢/١٠.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٠٦.

## محەممەد عبدالله مەهانی (١٤٠٠)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالله ی کوڕی ئەبوبەکری (مەهانی)یە، مەهان: ناوچەیەکی گەورەی نزیك (شنۆ)یە، لە مەزهەبی شافیعی شارەزا بووە، کرایتە قازی (هەولێر) لە مەدرەسەی قەڵات و خوارەوەی قەڵات دەرسی دەدا، دوایی چووە (موصل)، ساڵی ٦١٨ك – ١٢٢١ز چووە (حەلەب)، دەوری ساڵی ٦٢٧ك – ١٢٢٩ز کۆچی کرد.

سەرچاوە: تأريخ أربيل ١٥٨/١ – ١٥٩.

## محەممەد عبدالله هەرشەمی (١٤٠١)

زانای بەناوبانگ و پایەدار، مەلەوانی دەریای زانست، بەدین و ڕوو لە خوا شارەزای زانیاری و شەریعەت، مامۆستای مەلا محەممەد، کوڕی عبدالله ی کوڕی مصطەفایە، ناسراوە بە (مەلای حاجی) خەڵکی گوندی (هەرشەم)ە، دەکەوێتە بناری ڕۆژئاوای چیای (پیرمەم – سەربەن)، دەرسی لەلای مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی کچلك مەلای باپیری مەلا ئەفەندی هەولێر خوێندووە، پاشان چوویتە لای مەلا محەممەد ئەفەندی خەتێ ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، کرایتە موفتی (دێرە) نزیك هەرشەم، مزگەوت و قوتابخانەی لە (هەرشەم) دروست کردووە، دەستی کردووە بە دەرسدانەوە، چەندان مەلا لەسەر دەستی دەرچووینە و ئیجازەیان وەرگرتووە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالقادری بیارەی، مەلا ئیبراهیمی دۆغرەمەچی، مەلا شێخ عبدالحمیدی بریفکانی، شێخ ئەبوبەکری کوڕی.

مەدرەسەی هەرشەم: یەك بووە لە قوتابخانە بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی، بۆیە مەلا عبدالقادر لە بیارەوە هاتووە بۆ ئەو شوێنە، شێخ عبدالحمید ساڵی ١٨٤٣ز لە بریفکان هاتووە بۆ ئەو جێگایە، جگە لە مەلای حاجی، مەلا ئەحمەدی مەلا عبدالله ی مەلا

وەیس و مەلا عبدالرحیمی هەرشەمی، شان بە شانی مەلای حاجی دەرسیان داوە، مەلای حاجی تەنیا کاری مەلایەتی کردووە و دەرسی داوە، خەریکی وێرد و سۆفیەتی نەبوو، بەلاّم کە شێخ ئەبوبەکری (کوڕی) چووە (تەوێڵە) لای شێخ عوسمان تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت، وە لەلایەن جەنابی شێخ کرا (خەلیفە)، وە پاشان گەڕاوە (هەرشەم) دوای نوێژان خەتمیان دەکرد، مەلای حاجیش لەگەڵیان دادەنیشت بەشداری دەکرد، دەیفەرموو: {هەرچەندە من سۆفی نیمە، بەلاّم دانیشتنی ناو ئەو ئاڵقەیەم زۆر پێ خۆشە، چونکە یادی خوودا دەکەن}.

مەلای حاجی تا ساڵی ١٨٧٠ز لە ژیاندا بوو، دوای ئەو بەروارە کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (هەرشەم) بە خاك سپێردرا.

شەش کوڕی هەبوون:

١. شێخ ئەبوبەکر: لە پێش دا باسمان کرد.

٢. مەلا عەلی: لە پێشدا باسمان کرد.

٣. صبغةالله (مەلا صەبغە): منداڵی نەبوو.

٤. مەلا ئیبراهیم: ساڵی ١٩١٤ز کۆچی دوایی کرد، یەك کوڕی هەبوو شێخ طاها، ئەویش سێ کوڕی هەبوو:

أ. حاجی عبدالله ناسرابوو بە (عوبێد).

ب. حاجی عبدالرحمان.

ت. مەلا ئیبراهیم: ئێستا پێش نوێژە، لە مزگەوتی شێخ مصطەفا، لە (هەولێر).

٥. عبدالله: ناسرابوو بە (مام فەقێ)، ئەویش کوڕێکی هەبوو ناو حەمەد، ئەو سێ کووڕی هەبوو: ئەحمەد، حوسێن، حەسەن.

٦. مەلا عوسمان: دوو کوڕی هەبوو، سەعید، ڕەسوڵ

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٥٠.

٢. النجم الزاهر ٨٧ – ١٥٩.
٣. علماء ومدارس في أربيل ٧٢ – ٧٥.
٤. دەنگی زانا ٢٠٠١/٥٠م ٩٤ – ٩٥.

## محەممەد عبدالله هەکاری (١٤٠٢)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالله ی کوڕی ئەحمەدە، مەزهەبی شافیعییە، ساڵی ٧٣١ك – ١٣٨٤ز هاتەدنیا، لە (قودس) و (نابلس) و (خەلیل) و (حمص) قازی بووە، کتێبی (درء تعارض العقل والنقل)ی ئیبن تەیمییەی کورت کردیتەوە، هەروەها (میدان الفرسان)ی محەممەد خەلافی غەزی کورت کردیتەوە، ساڵی ٧٨٦ك – ١٣٨٤ز لە (حمص) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٠ – ٤٨١.
٢. كشف الظنون ٢/١٩١٦.
٣. هدية العارفين ٢/١٧٢.
٤. معجم المؤلفين ١٠/١٩٨.
٥. شذرات الذهب ٦/٢٩٢.
٦. الأعلام ٧/١١٤.
٧. الدرر الكامنة ٣/٤٦٦.
٨. معجم أعلام الكورد ٦١٦.

## محەممەد عبدالله هەولێری (١٤٠٣)

ناوی محەممەدە کوڕی عبدالله یە، خەڵکی (هەولێر)ە، ساڵی ٦٦٢ك – ١٢٦٣ز هاتەدنیا، زانایەکی بە دەسەڵات بوو لە شەریعەت و فەتوا و شیعر، ساڵی ٦٩٣ك کرا موفتی، پاشان کرا قازی (شام)، ساڵی ٧٣٨ك – ١٣٣٧ز لە ئەسپەکەی کەوتە

خوارەوە کۆچی دوایی کرد، براگەورەکی هەبوو لەسەر ناوی خۆی محەممەد، ساڵی ٦٥٠ك - ١٢٥٢ز لە (حەلەب) هاتەدنیا، ساڵی ٧٢٥ك - ١٣٢٥ز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. أربيل في مختلف العصور ٩٥.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨١.
٣. شذرات الذهب ٦/١١٨.
٤. البداية والنهاية ١٤/١٨٩.
٥. الدرر الكامنة ٣/٤٦٧ - ٤٦٨.

## محەممەد عبدالأحد دیاربەکری (١٤٠٤)

ناوی محەممەدە کوڕی عبدالأحدی کوڕی یوسفی دیاربەکرییە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، زانایەکی خواپەرست و بە دین بووە، ئاقڵ و هۆشمەند بووە، دەنگ خۆش و زمان ڕەوان بووە، لە ١٧ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٧٤٣ك - ١٣٤٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٣/٤٨٩.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٢.

## محەممەد عبدالعزیز حەڕانی (١٤٠٥)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالعزیزی کوڕی محەممەدی کوڕی جەلالەدینی کوڕی عەزی کوڕی بەدرە، خەڵکی (حەڕان)ە، قورئانی پیرۆز و کتێبی (العمدة)ی لەبەرکرد، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، بە داخەوە هێشتا داوی سپی لە ڕیشی پەیدا نەبوو بوو، ساڵی ٨٦٠ك - ١٤٥٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الضوء اللامع ٨/٥٢.

## محەممەد عبدالعزیز هەولێری (١٤٠٦)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالعزیزە، نازناوی (ئەبو عبدالله)یە، زانایەکی مەزنی مەزهەب شافیعی بووە، لە مەدرەسەی (نظامیة)ی بەغدا دەرچووە دوایی لەوێ دەرسی داوە، شاعیر بووە، هۆنراوەی ئاینی هەیە، چوویتە (دیمشق) لەوێ دەوری ساڵی ٥٨٠ك – ١١٨٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٦٥.
٢. الإكليل في محاسن أربيل ٥٧.
٣. طبقات الشافعية الكبرى ٣/٣٧٤.
٤. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ١/١٢٢.

## محەممەد عبدالغنی حەڕانی (١٤٠٧)

ناوی محەممەدە، کوڕی قازی عبدالغنی کوڕی یەحیای کوڕی محەممەدی کوڕی ئەبوبەکرە، نازناوی (بەدرەدینە) خەڵکی (حەڕان)ە، مەزهەبی حەنبلییە، دەوری ساڵی ٧٠١ك – ١٣٠١ز هاتەدنیا، دەرسی لە خزمەت باوکی و چەند زانایان خوێند، بووە مامۆستا، دەرسی فەرموودەی دەداوە، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٧٧٨ك – ١٣٧٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٤/١٩ – ٢٠.

## محەممەد عبدالفتاح (ڕەئیس) (١٤٠٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالفتاحە، ناوبراوە بە (ڕەئیس) لەبەرئەوەی مەلا عبدالفتاحی باوکی کاتی فەقێیەتی لای مەلا حەسەنی مەلا عەلی قزلجی لە تورجان سەرپەرشتی ئیش و کاری فەقێیەکانی دەکرد، واتە سەرۆکی فەقێیان، ئەو ناوە بۆ مەلا محەممەدی کوڕی ماوە.

ناوبراو ساڵی ١٣٢١ك – ١٩٠٣ز لە شاری (بۆکان) هاتەدنیا، قورئانی پیرۆز و (کلیات)ی سەعدی شیرازی لەلای باوکی خوێند، دوایی چووە لای مەلا محەممەدی گرویسی چەند کتێبی سوختایەتی تەواوکردن، ساڵی ١٩١٩ز چووە لای مەلا سەید حوسێن طاهیر بوغە، دوایی چووە لای مەلا صادیقی (کانی ڕەش)، ساڵی ١٩٢٤ز چووە لای مەلا حوسێنی مەجدی، (جمع الجوامع) و شەرحی (چەغمینی) خوێند، گەڕاوە (بۆکان) لای قازی موحسین حیساب و هەندەسەی تەواوکرد، ساڵی ١٩٢٥ز هاتە خانەقای مەولانا خالید لە (سلێمانی) لە خزمەت شێخ عومەری قەرەداغی داوای جێی کرد، شێخ فەرمووی: {ئەو نانەی بۆ فەقێیەکان تەرخان کراوە، بەشی ئەوانە، ناتوانم کەسی تر زیاد وەربگرم لەسەر بەشی ئەوان}.

مەلا محەممەد بە دڵ ساردی گەڕاوە لای فەقێیەکان شەو ماوە، بە هەزار خەم و پەژارە بەیانی فەقێیەك ناو (عینایەت) عەرزی مامۆستای کرد: {قوربان شەو و ڕۆژەك بەشی من (٣) سێ نانە، لەگەڵ محەممەد دەکەم بە نیوە، جەنابت ئەگەر دەرسی پێ بدەی}. بەم شێوەیە وەرگیرا، لەوێ (تەجوید)ی بوخاری و توحفە و شەرحی مەنهەج و تەهزیب و سەرەتای شەرحی مەواقیف و ئوسطرلابی خوێند، ساڵی ١٩٢٨ز ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە (گەلالە)ی ماوەت قەزای چوارتا، دەستی کرد بە کاروباری مەلایەتی و دەرسدانەوە، محەممەد ئاغای عەبباس ئاغای پشدەر زۆر یارمەتی دەدا، لەگەڵ خۆی برد بۆ حەج، ساڵی ١٩٣١ز چووە (بیارە) بۆ زیارەتی شێخ عەلائەدینی نەقشبەندی.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبداللە گەناوی، مەلا حوسێن دەشتێوی، مەلا زاهید پاوەیی، مەلا مصطەفا زەڵمی، مەلا عبداللە گەلالی، شێخ عبدالرئوف بێژوەی، مەلا خدر سیسێری، مەلا ڕەسولی گەلالی، مەلا ئەحمەدی حاجی عەدێ، سەید عەلائەدین (سجادی)، مەلا عبداللە حانیە، مەلا عەلی دولکانی، مەلا ئەبوبەکری وەجاغی، مەلا عبداللە حەسەن زادە، مەلا سەعید زمناکۆ، مەلا عبدالرحمانی کوڕی.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٧٠ز لە (گەلالە) باری کرد، هاتە گەڕەکی خەبات لە (سلێمانی) لەوێ لە بەروارای ٢٦/٤/١٩٧٩ز کۆچی دوایی کرد، لە گردی سەیوان، بە خاك سپێردرا.

دانراوەکانی:

١. نامیلکەی حەج.

٢. نامیلکەی تەجوید.

٣. شەرحی هۆنراوەی فەرائیزی مەلا عەلی قزلجی.

٤. تەفسیری چەند (جزو) لە قورئانی پیرۆز بە کوردی.

٥. کورتەباسی نیکاح و تەڵاق و مامەلەت، لە توحفە.

بەشێك لە شیعری شێخ عبدالرئوف نەقشبەندی بێژوەی لە مەتحی مامۆستا:

حاجی مامۆستا گەلالەی کردە دیواری عیلم

لەم گەلالە دێ هەڵاڵە و نەفحەیی ڕەحمانیە

مەدیەنی دینە مەدینەی عیلمە، وادی ئەیمەنە

سەر بلندی نیشتمانە، فەخری کوردستانیە

ڕووگەیە بۆ کەشفی موشکیل ڕێزی تەحقیقاتەکەی

دورر و یاقووتی بە قیمەت گوفتەکەی سەحبانیە

موختەسەر کەششافە بۆ ئایاتی حەق لوببی ئوصول

دەرسی بۆ شەرحی مەقاصید لوئلوئی عەممانیە

ئیش و پیشە و بەرهەمی نووسینە زانینە عەمەل

هانی گەل بۆ هەلئەدات و خولقەکەی قورئانیە

وەعز و دەرس و بەحس و ئیرشادی لە بۆ تەبلیغی حەق

بووتە مایەی ژینەوەی دین و شەکی تێدا نیە

ڕافیعی دینی موبینە و مالیکی ساحەی علوم

شافیعم بە، ڕۆژی خۆی گیانم لە بۆت قوربانیە

(نەقشبەندی) بەسیەتی، وەسفی ئەمانە ناکرێ

نابڕێرێ قەترەیێ دەریا، بە ئەم ئاسانیە

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٣٧ – ٥٣٨.

٢. فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٢٧٤.

٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٥/١٢.

٤. دەنگی زانا ٥٥ – ٢٦ / ٢٠٠١ز.

٥. تأريخ فرهنگ وأدب مكريان ٣٨١ – ٣٨٢.

٦. شخصيات كردية ١٤/٦ / ١٩٧٩م.

## محەممەد عبدالقادر شەوەکی (١٤٠٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی مەلا عبدالقادرە، خەڵکی گوندی (شەوەك)ە، لە بناری زورگی (سێنك) ڕووی ڕۆژئاوا، سەر ڕێگای (هەولێر – سەربەن)، زانایەکی چاکی سەردەمی خۆی بووە، مامۆستا ئیبراهیم فەسیح باسی زیرەکی کردووە، بە مەنتیق زان و کەلام زانی داناوە، ناوبراو ساڵی ١٨٤٧ز لە گوندی خۆران مەلا بووە، مەلا ئەحمەدی کوڕی خۆی لە خزمەتی خوێندووە.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٤٧.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ٢٥٤.

## محەممەد عبدالقادر قانیع (١٤١٠)

ناوی محەممەدە، کوڕی شێخ عبدالقادری کەڵۆس کوڕی شێخ سەعیدی کوڕی شێخ محەممەد دۆڵاشە، ساڵی ١٣١٨ك – ١٩٠٠ز لە گوندی (ڕێشێن) هاتەدنیا، قۆنداغە

بوو باوکی کۆچی دوایی کرد، پاش چوار ساڵ دایکیشی کۆچی دوایی کرد، سەید حوسێنی چۆڕی چاودێری کرد و لەبەر خوێندنی دانا، ماوەك لە (سلێمانی) خوێند و ماوەك چووە (کۆیە) و ماوەك لە (کەرکوك) و ماوەك لە (سەقز) پاشان چووە خزمەت مامۆستا ئیبن قەرەداغی، دوایی لەبەر گوزەران نەسوڕانی نەیتوانی خوێندنەکەی بباتەسەر، وازی هینا، ماوەك مەلایەتی گوندانی کرد، جارجاریش ئیش وکاری دەکرد، تا ژیانی بباتە سەر، ناوبراو زیرەك و زمان ڕەوان بوو، شاعیرەکی چاك بوو، نازناوی (قانیع)ە شیعری بە کوردی و فارسی داناوە.

دیوانی هەیە، ساڵی ١٩٧٩ز چاپ کرا، ئەو دیوانە سەرجەمی شیعرەکانیق، وە ئەو شیعرانەی پێشتر چاپ کرابوون: (گوڵاڵەی مەریوان) و (باخچەی کوردستان) و (شاخی هەورامان) و (چوارباخی پێنجوین) و (دەشتی گەرمیان)، لە دیوانەکەدا هەن.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٨٥ك – ٧/٥/١٩٦٥ز لە گوندی (لەنگەدێ) ناوچەی (شلێر) سەر بە (پێنجوێن) کۆچی دوایی کرد.

لە شیعرێکی تێهەڵکێش لەگەڵ شیعری حافزی شیرازی دەڵێ:

تو خوا زولف و خەناوی زەمانی وەصلت کامە؟

(اني رأيت دهراً، من هجرك القيامة)

ئیظهاری عەشق بازی تاکەی بکەم بەبێ سوود؟

(ليست دموع عيني هذي لنا العلامة)

من ئیمتیحانی بەختم ئەکەم وەلێ ئەزانم

(من جرب المجرب، حلت به الندامة)

أی دل لە یاری بێ مەیل، بێ مەیل بە چونکە ڕاستە

(في بعدها عذاب، في قربها السلامة)

صۆفی ئەڵێ بەبێ ڕەنج، ویصالی دولبەرم هەس

(والله ما رأينا حباً، بلا ملامة)

دوێنێ لە بەختی من یار، چارشێوی شەرمی لادا
(کالشمس في ضحاها، تبدو من الغمامة)
(قانیع) لە شەوقی چاوی، عاشق بە جامی مەی بوو
(حتی یذوق منه، کأسا من الکرامة)

هەروەها دەربارەی گازاندەکردن لە زەمانە، دەڵێ:

بێ حەیایی باوە ئەمڕۆ، قوڕ بە سەر داکا حەیا
کەندەڵان سەر بەرز و شادە، خۆی بشارێت و چیا
گوڵ ئەگەر ئەقڵی ببێ قەت سەر لە خاك ناکاتەوە
چونکە ڕۆژی دڕك و داڵە و گەرمە بازاڕی گیا
با لە هەورا سەر نیگون بن، مانگ یا ڕۆژی جوان
شەمشەمە کوێرە ئەڵێ: {من نامەوێ شوعلەی ضیا}
ئەی فەلەك ڕاستۆنەبی، بۆ ڕێك و پێکی دەورەکەت
گورگ ئەبێتە شوانی ڕان و دز ئەبێتە ئەولیا
نێرە گاجووتی ئەبەیتە، ڕێزی لوقمانی حەکیم
فەیلەسوفێکیش ئەخەیتە، ژێر چەپۆکی ئەشقیا
تۆ بە مێرولەی زەعیف ئیشی سولەیمانی ئەکەی
خاتەمی سۆری نیگینت، کردە دەست دێوی (هەیا)

سەرچاوەکان:


١. تأریخ مشاهیر کورد ٢/٤٠٢ – ٤٠٥ – ٤٢١.
٢. هەوێنی عیشق و ئازادی ٥٢.
٣. مێژووی ئەدەبی کوردی ٦/٤٣٥ – ٤٤٩.
٤. کۆنگرەی زانیارانی کورد ٢٤٧ – ٢٥٣.

## محەممەد عبدالقاهیر شارەزوری (١٤١١)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالقاهیری کوڕی عبدالرحمانی کوڕی حەسەنی کوڕی عبدالقادری کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو قاسمی کوڕی مظفری کوڕی عەلی کوڕی قاسمی شارەزورییە، ساڵی ٦٩٨ك – ١٢٩٨ز هاتەدنیا، لە (موصل) دەرسی دەداوە، ساڵی ٧٣٨ك – ١٣٣٧ز چووە (شام) لەوێ نیشتەجێ بوو، ناوبراو شاعیرەکی چاك بوو.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٠/١٨٤.
٢. الدرر الكامنة ٤/٢١.
٣. منهل الأولياء ١/٢٢١.
٤. مشاهير الكورد ٢/١٢٦.
٥. معجم أعلام الكورد ٥٧٩ – ٦١٣.

## محەممەد عبدالکریم خەواهیرزادە (١٤١٢)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالکریمی کوڕی ئەحمەدە، خوارزای مەلا عبدالرحمانی پێنجوێنی بووە، بۆیە ناسراوە بە (خەواهیرزادە) واتە: خوارزا، ساڵی ١٢٨٧ك – ١٨٧٠ز لە (پێنجوێن) هاتەدنیا، لە خزمەت پێنجوینی خاڵی پەروەردە بوو، دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (تورجان)، دوایی چووە (مەهاباد)، گەڕاوە (پێنجوێن)، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، لە ناوچەی (مەریوان) بووە مەلا، پاشان چووە گوندی (نزارە)، پاشان لەسەر فەرمانی عوسمان پاشای جاف کرا قازی (پێنجوێن)، مامۆستا یەك بوو لە زانایە بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی لە مێژوو و ڕووداوەکان ئاگادار بوو، زانیاری لە قورئانی پیرۆز بەهێز بوو تەفسیری قورئانی پیرۆزی کردووە بە کوردی لە چوار بەرگ، بەناوی (تەزکاری ئیمان، بۆ قەومی کوردان)، تا ئێستا دەستەکی خێرخوازی نەگەیشتیتێ چاپی بکات، هەروەها نامیلکەی (مەصدەر و ئیسمی مەصدەری)هەیە، ساڵی

١٣٥٤ك – ١٩٣٥ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی حاجی شێخ لە (پێنجوێن) بە خاك سپێردرا.

دوو کوڕی مەلای هەبوون: (مەلا ئەحمەد): لە سلێمانی بوو، وە (مەلا هبةالله): لە پێنجوێن بوو.

سەرچاوەکان:

١. أسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٦٤.
٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/١٣٧ – ١٤٠.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٣٨ – ٥٣٩.
٤. بنەماڵەی زانیاران ٤٥١ – ٤٥٢.

## محەممەد عبدالکریم (صیدیقی) (١٤١٣)

مامۆستا مەلا محەممەد عبدالکریم صیدیقی، یەکە لە زانایە مەزنەکانی (هەولێر)، ناسراوە بە (ئالتی بەرماق)، واتە: شەش پەنجە، پلەکی زیادی هەبووە لە پەنجەی دەستی، مامۆستا واعیز و پێش نوێژ بووە لەو مزگەوتەی تا ئێستا بەناوی ئەوە، (ئالتی بەرماغ) لەناو بازاڕی هەولێرە.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٢٤٣.

## محەممەد عبدالکریم مەرعەشی (١٤١٤)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالکریمی کوڕی عبدالله ی کوڕی مورتەضای کوڕی عەلی کوڕی کەمالەدینی کوڕی قیوامەدینە، خەڵکی (مەرعەش)ە، وەزیر بووە، شەریعەت زان و مێژووناس بووە، شاعیر بووە.

دانراوەکانی: (التعليقة على من لا يحضره الفقيه) و (تأريخ آل محمد).

کۆچی دوایی: ساڵی ١٠٠٠ك – ١٥٩٢ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم المؤلفين ١٠/١٨٩.

## محەممەد عبدالمؤمن مەردۆخی (١٤١٥)

ناوی محەممەدە، نازناوی جەمالەدینە، ناسراوە بە (آیةالله)، كوڕی شێخ عبدالمؤمنی مەردۆخی یە، ساڵی ١٢٩٨ك – ١٨٨٠ز هاتەدنیا، نووسەر و ڕۆشنبیر بوو، تەمەنی خۆی هەموو تەرخان كرد بۆ خزمەتی ئایین، شیعری هەیە (تأریخ الكرد وكوردستان) و قاموسی كوردی و عەرەبی و فارسی داناوە، ساڵی ١٣٩٦ك – ١٩٧٦ز كۆچی دوایی كرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٦٧٥.

## محەممەد عبدالملك فارقی (١٤١٦)

ناوی محەممەدە نازناوی (ئەبو عبدالله)یە كوڕی عبدالمليكە، خەڵكی (میافارقین)ە، لە (بەغدا) دابەزیوە، ئامۆژگاری خەڵكانی كردووە، بڕوایان پێهاتووە، كەراماتی لێ دەگێڕنەوە، ساڵی ٥٦٤ك – ١١٦٨ز لە تەمەنی هەشتا ساڵی دا كۆچی دوایی كرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٤/٢١٤.

## محەممەد عبدالملك مارانی (١٤١٧)

ناوی محەممەدە كوڕی عبدالمليكە، خەڵكی (ماران)ە، مروجی نزیك (موصل)، بە دور نازانم دەشتی (ناوكوڕ) بی، مەزهەبی شافیعی بووە، زانایەكی بە توانا بووە، لەگەڵ پاشایان دانیشتووە و شاعیر بووە و، دەرسی داوە، ساڵی ٥٧٦ك – ١١٨٠ز هاتەدنیا، لە مانگی شەووالی ساڵی ٦٥٩ك – ١٢٦١ز كۆچی دوایی كرد.

سەرچاوەكان:

١. سیر أعلام النبلاء ١٣/ ٣٩٨.
٢. وفيات الأعيان ٢/٤٠٧ – ٤٠٨.
٣. معجم البلدان ٥/١٠١ /٢/٥٣٢.
٤. شذرات الذهب ٥/٢٩٩.

## محەممەد عبدالمنعم حەڕانی (١٤١٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالمنعمی کوڕی عەممای کوڕی هامیلی کوڕی مەوهوبی فەرمووەدەناسی حەنبەلی یە، ساڵی ٦٠٣ك - ١٢٠٦ز لە (حەڕان) هاتەدنیا، بۆ خوێندن چووە (بەغدا)، دوایی سەفەری کرد بۆ (دیمشق) و (ئەسکەندەرییە) و (قاهیرە) زاتەکی بە دین و بە خولق و خوو بووە، ڕێزدارو پڕ سوود بووە، شەوی چوار شەمەی ٨ی مانگی ڕەمەزان، ساڵی ٦٧١ك - ١٢٧٣ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/٣٣٤.

٢. الذیل علی طبقات الحنابلة ٤/٢٨١ - ٢٨٢.

## محەممەد عبدالوەهاب حەڕانی (١٤١٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی عبدالوەهابی کوڕی مەنصوری حەنبەلی یە، ساڵی ٦١٠ك - ١٢١٣ز لە (حەڕان) هاتەدنیا، زانایەکی شارەزا بووە بەتایبەت لە شەریعەت و ئوصول، فەقێی مەجدەدین بن تەیمیە بووە، بۆ خوێندن چوویتە (دیمشق) دوایی چوویتە (میصر) ماوەك جێگری قازی بووە، گەڕایتەوە (دیمشق) کرا مودەڕریس، ماوەك پێش نوێژی حەنبەلیەکان بووە، ناوبانگی زیرەکی و زمان ڕەوانی ڕۆیشتبوو، شاعیر بوو بەسۆز دیوانی (ابن الفارض)ی دەخوێندەوە، لەگەڵ (تائیة) کە دەگریا، ساڵی ٦٧٥ك یا ٦٩٥ك - ١٢٧٦ز یا ١٢٩٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البدایة والنهایة ١٣/٢٧٨.

٢. معجم أعلام الکورد ٦١٧.

٣. فوات الوفیات ٣/٤٢٨.

٤. شذرات الذهب ٥/٣٤٨.

٥. الذیل علی طبقات الحنابلة ٤/٢٨٧ - ٢٨٩.

## محەممەد عوبێداللە حەڕانی (١٤٢٠)

ناوی محەممەدە، کوڕی عوبێداللە ی کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی عبدالعزیزە، خەڵکی (حەڕان)ە، ساڵی ٣٦٦ك – ٩٧٦ز لە (میصر) هاتەدنیا هەر لەوێ پەروەردە بووە، شەرع زان و مێژووناس بووە، نووسەر و ئەستێرەناس بووە، حاکمی کوڕی عبدالعزیزی سەرۆکی میصر ڕێزی دەگرت، چەند پلەوپایەی پێدا، بەڵام مامۆستا دەربارەی باوەڕی ناو و دەنگی خۆش نەبوو، زانایانی ئەو سەردەمی لێی ڕازی نەبوون، زۆرجاران ناویان دەهینا، بە (ڕافزی)، لە مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ٤٢٠ك – ١٠٢٩ز لە (میصر) کۆچی دوایی کرد.

دانراوی زۆرن، لەوانە:

١. التلويح والتصريح في معاني الشعر: (٣) بەرگە.

٢. القضايا الصابيه في التنجيم: (٣٠٠٠) لاپەڕەیە.

٣. الأمثلة للدول المقبلة في الحساب والنجوم.

٤. تأريخ مصر: (١٢) دوازدە بەرگە.

٥. الأديان والعبادات: (٣٥٠٠) لاپەڕەیە.

٦. جونة الماشط.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٠/٢٧٦.

٢. الكامل ٧/٣٤٤/ پەراوێز.

٣. شذرات الذهب ٣/٢١٦ – ٢١٧.

٤. وفيات الأعيان ٤/١٢ – ١٤.

٥. كشف الظنون ١/١٢٩ – ٣٠٤.

## محەممەد عوبێدالله نەصیبی (١٤٢١)

ناوی محەممەدە، کوڕی عوبێداللەی کوڕی محەممەدە، نازناوی (ئەبولحەسەنە) ساڵی ٣١٤ك - ٩٢٦ز لە شاری (نوسەیبین) هاتەدنیا، زانایەکی مێژووناس و شاعیر بووە، چووە (بەغدا) لەوێ ماوە تا ساڵی ٣٨٤ك - ٩٩٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الأنساب ٥/٣٩٤.

## محەممەد عثمان ئەفەندی موفتی (١٤٢٢)

ناوی محەممەدە، کوڕی مەلا عوسمان ئەفەندی کوڕی ئەبوبەکر ئەفەندی کچەك مەلایە، ساڵی ١٢٩٠ك - ١٨٧٣ز لە قەڵاتی (هەولێر) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لای موستەعیدەکانی مەدرەسەی قەڵات قۆناغی سوختەیی بڕی، دوایی چووە لای شێخ عەلی ئەفەندی مامی، بەشێکی فەرموودەی پێغەمبەری (درودی خوای لێ بێ) لەلا خوێندن، ئیجازەی (المسلسلات)ی لێ وەرگرت، پاشان چووە لای حاجی مەلا عومەر ئەفەندی مامی، کۆتایی بە خوێندن هێنا، ئیجازەی مەلایەتی لێ وەرگرت.

چووە خزمەت شێخ حوسامەدینی (تەوێڵە) تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت، پاشان لە (موصل) بەشداری تاقیکردنەوەی زانایانی کرد، دەرچوو بە پلەی بەرز، کرا مودەرریس لە (هەولێر) پاشان کرا (موفتی).

خووڕەوشتی: زانایەکی بەناو بوو، زیرەك و زمان ڕەوان بوو، نووسەر و ئەدیب و شاعیر بوو، شیعری کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی هەیە، بۆ نمونە لە هۆنراوەی (تەصەووف) بە عەرەبی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| يا ساقي الراح باللذات والنعم | وناشط الفكر بالاحداء والنغم |
| قم فاسقني سقية تشفى بها شغفى | اكدار قلبي بها تمحو وتنعدم |

دانراوەکانی:

١. نامیلکەی تەریقەتی نەقشبەندی.

٢. تەفسیری بەشێك لە قورئانی پیرۆز بە کورتی.

٣. شەرحی بەشێك لە حەدیسی بوخاری.

٤. شەرحی قەسیدەی بوردییە.

٥. قەسیدەك لەسەر شێوازی قەسیدەی بوردییە.

٦. پێنج خشتەکی بەشێك لە شیعرەکانی (فضولی) شاعیری تورکی.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٤٥ز کۆچی دوایی کرد، مامۆستا قازی ڕەشاد ئەفەندی کوڕی جێگری بوو، لە پێشدا باسمان کرد.

سەرچاوەکان:

١. أربیل في مختلف العصور١٣٩.

٢. علماء ومدارس في أربیل ٣٥.

٣. أعلام کورد العراق ٧٥٤.

## محەممەد عوسمان تەوێڵەیی (١٤٢٣)

ناوی محەممەدە کوڕی شێخ عوسمان سیراجەدینی تەوێڵەیە، نازناوی (بەهائەدینە)، ٨ی مانگی ڕەبیعی دووەم، ساڵی ١٢٥٢ك – ١٨٣٦ز لە گوندی (بیارە) هاتەدنیا، لە خانەوادەکی ئایین پەروەر و ڕوولەخوا پەروەردە بوو، دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی لای مەلا مەحمودی دەشی تەواوکردن، پاشان قۆناغەکانی تری کۆتایی پێ هینا، تەریقەتی نەقشبەندی لە باوکی وەرگرت، دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی داب و دەستووری تەریقەت، بە ماوەکی کەم سەرکەوتوو بوو لە پلەکانی (تەصەووف) لەلایەن شێخی باوکی کرا (خەلیفە).

بەشێك لە مریدەکانی: شێخ عومەری برای، مەلا ئەحمەدی نۆدشەی، سەید عبدالرحیمی مەولەوی، (شێخ بەهائەدین): شێخەکی هەڵکەوتوو و بەناوبانگ بوو، چەند کەراماتی لێ دەگێڕنەوە، سەفەری حەجی کرد، لەو سەفەرە چووە (شام) و (میصر) و (مەدینە) گەڕاوە (هەورامان) ساڵی ١٢٩٨ك – ١٨٨١ز لە تەوێڵە کۆچی دوایی کرد.

کورەکانی: شێخ عەلی حوسامەدین و شێخ صادق و شێخ مەزهەر و شێخ جەعفەر و کاکە شێخ: بەناوی باوکی کرابوو، ئەویش کوڕێکی نووسەری هەبوو، ناو (محەممەدئەمین کاردۆخی): لە ١٩١٦ز هاتەدنیا، ساڵی ١٩٨٢ز لە (سلێمانی) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٢٣ – ٥٢٥.

٢. یادی مەردان ٢/٧٥ – ٨٨.

٣. بنەماڵەی زانیاران ٤٠٣ – ٤٠٦.

٤. تأريخ السليمانية ٢٣٠.

٥. تأريخ مشاهير كورد ٢/٣٠٥ – ٤٨٤.

## محەممەد عثمان ماردینی (١٤٢٤)

ناوی محەممەدە کوڕی فەخرەدین عوسمانی کوڕی عەلی یە، خەڵکی (ماردین)ە، مەزهەبی شافیعی یە، کتێبانی (الحاوي) و (التنبيه)ی لەبەر بووە.

چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. البحر الموّاج في شرح المنهاج: (١٤) بەرگە.

٢. حاشية على الجامع الصحيح للإمام البخاري.

٣. شرح الورقات.

ساڵی ٨٧١ك – ١٤٦٦ز لە گەڕانەوەی سەفەری حەج کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٠٦.

٢. كشف الظنون ٢/١٨٧٥.

٣. معجم المؤلفين ١٠/٢٨٤.

٤. الضوء اللامع ٨/١٢٧.

٥. هدية العارفين ٦/٢٠٥.

## محەممەد عثمان (مەحوی) (١٤٢٥)

ناوی محەممەدە کوڕی مەلا عوسمانە خەڵکی گوندی (باڵخ)ە، ناوچەی (ماوەت)، ساڵی ١٢٤٦ك –١٨٣٠ز لە (سلێمانی) هاتەدنیا، نازناوی (مەحوی)یە.

خوێندنی: لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکردن، گەڕا لە چەند شوێنان لە حوجرەی فەقێیان، ماوەك چووە (سنە)، دوایی چووە (مەهاباد) لای مەلا عبداللهی پیرەباب، گەڕاوە (سلێمانی) لای چەند زانایانی خوێند، چووە (بەغدا) لای محەممەد فەیزی زەهاوی کۆتایی بە خوێندن هێنا، ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: ساڵی ١٨٥٩ز مامۆستا زەهاوی کردیە مودەرریس لە مزگەوتی ئیمامی ئەعزەم لە (بەغدا)، لە ١٨٦٢ز گەڕاوە (سلێمانی) کرا ئەندامی دادگا، لە ١٨٦٨ز باوکی کۆچی دوایی کرد، وازی لە فەرمانبەری هێنا، دەستی کرد بە دەرسدانەوە، تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ محەممەد بەهائەدین تەوێڵەیی وەرگرت، پاشان لەلایەن حکومەت دورخستراوە لە وڵات، ساڵی ١٨٧٤ز ڕەوانی (بەغدا) کرا، دوایی ئازاد کرا، گەڕاوە (سلێمانی)، ساڵی ١٨٨٣ز چووە سەفەری حەج، بە (ئەستەمبوڵ)دا چوو، لەوێ چاوی بە سوڵتان عبدالحمید کەت، ئەویش ڕێزی گرت، فەرمانی دا خانەقای لە (سلێمانی) بۆ دروست بکرێت، مووچەی بۆ ببڕنەوە، گەڕاوە دەستی کرد بە دەرسدانەوە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا محەممەد حەسەن مەلا عەلی قزلجی، مەلا مەحمودی مەزناوی، مەلا سەعید ئەفەندی نائیب ئۆغلی کەرکوك، عبدالعزیز مەلا ئەمین موفتی سلێمانی.

مەحوی و شیعر: مامۆستا جگە لە مەلایەتی و تەصەووف، شاعیرێکی چاك و چالاك بووە، دڵ و دەروون ساف بووە، خواناسی لە شیعرەکانی دەتریسکێتەوە، لە

(بەحری نور)ە بەنرخەکەی، دڵسۆزی خۆشویستنی خـوا و پێغەمبـەر (درودی خـوای لـێ بی) ئەدرەوشێتەوە، بۆ نمونە دەڵێ:

چ مەدحێکت بکەم لائیق بە تۆ (یا خیر خلق الله)
منی بێ خێری نالایق، کە جیبریلت سەناخوانە
بەیانی گەورەیی خولقی کەسێ ئایەت لە شەئنی بێ
نەمەقدوری من و تۆیە، نە ئیشی (قوسس) و (سەحبان)ە
لە ئادەم تا مەسیحا ئەنبیا یەك یەك بە قەومی خۆی
خەبەرداره لە پاش ئێمە کە دێ ئەو فەخری ئەکوانە
رشینەی ئاگری بەردایە عومری ئاگری (زەردەشت)
بە بەرقی بوو کە شەق بوو، تاقی (کیسرا) بوو بە وێرانە

کۆچـی دوایـی: سـاڵی ١٣٢٤ك – ١٩٠٦ز کۆچـی دوایـی کـرد، لـە خانەقاکەی خۆی لە سلێمانی بە خاك سپێردا.

سەرچاوەکان:


١. ژیناوەری زانایانی کوردستان ٢٩٢ – ٢٩٤.
٢. معجم أعلام الكورد ٦٨٢.
٣. دیوانی مەحوی / پێشەکی ٥ – ٦.
٤. خۆری ئیسلام ١٧/ ٢٠٠٢ز.
٥. أسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٦٤.
٦. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٥/٣١٤.
٧. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٢٧ – ٥٢٨.
٨. مشاهير الكورد ٢/١٦٢ – ١٦٣.
٩. مێژووی ئەدەبی کوردی ٤/١٩٥ – ٢٣٤.
١٠. گوڵزاری کوردستان ١٧٥.

١١. بنەماڵەی زانیاران ٤٧٢ – ٤٧٣.

١٢. تأريخ السليمانية ٢٣١ – ٢٣٦.

**محەممەد عثمان موسا دیاربەکری ( ١٤٢٦ )**

ناوی محەممەدە کوڕی عوسمانی کوڕی موسای کوڕی عبداللە ی کوڕی محەممەدە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، ساڵی ٦٥٩ك – ١٢٦١ز لە (مەککە)ی پیرۆز هاتەدنیا، دەرسی لەلای باوکی و چەند زانایان خوێند، خۆشی دەرسی فەرموودەی دەداوە، ماوەك کرا جێگری قازی (مەککە)ی پیرۆز، لە ١٠ی جیمادی دووەم، ساڵی ٧٣١ك – ١٣٣١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٤/ ٤٤.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٣.

**محەممەدعثمان یوسف دیاربەکری ( ١٤٢٧ )**

ناوی محەممەدە، کوڕی عوسمانی کوڕی یوسفی کوڕی محەممەدی ئاسنگرە، لە (میصر)ی خوێندووە، لە فەرموودە شارەزابووە، کتێبی (محرر)ی مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد لەبەرکردووە و شەرحی لەسەر نووسیوە، دەرسی لەلای ئیبن حەمران خوێندووە، مامۆستایەکەی زۆر مەتحی زیرەکی کردووە، ماوەك لە (حەلەب) نووسەر و چاودێری ئەوقاف بووە، ساڵی ٧٠٩ك کرا ووتارخوێنی مزگەوتی گەورە، پاشان گواستراوە مزگەوتی ئەمەوی لە(دیمشق)، ماوەك قازی حەنبەلییەکان بوو، لە ٧ی جیمادی یەکەم ساڵی ٧٢٤ك – ١٣٢٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٤/١٢٢.

٢. شذرات الذهب ٦/٦٥

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٣.

٤. الذیل علی طبقات الحنابلة ٤/٣٧٦ – ٣٧٧.

٥. معجم أعلام الکورد ٦١٧.

### محەممەد عەدلەخان (١٤٢٨)

مامۆستا مەلا محەممەد خەڵکی گوندی (ئەبوعوبێدە)ی سەر بە (هەڵەبجە)یە، دەوروبەری ساڵی ١٣٠٠ك – ١٨٨٢ز لەو گوندە هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغە سەرەتاییەکانی لەو گوندە و قوتابخانەکانی هەڵەبجە تەواوکرد، ئەمجا چووە (بیارە)، لەوێ کافیة و شافیة و جمع الجوامع و چەند کتێبی تری خوێند، هەمووی لەبەرکردن، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، بووە مەلا لە گوندی (هۆمەرمل) قەزای (کفری)، لەوێ خەریکی دەرسدانەوە بوو، ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد، دوایی باری کرد بۆ (عەنەب)، ماوەکی زۆر پێ نەچوو، ساڵی ١٣٦٥ك – ١٩٤٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدین ٥٣٦ – ٥٣٧.

### محەممەد عەلی ئەخلاطی (١٤٢٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلییە، خەڵکی (ئەخلاط)ە، زانایەکی شەرع زان و ئوصول زان بووە، کتێبی (الحدود المتداولة)ی داناوە، لە بابەت (أصول الفقة) ساڵی ٧٠٨ك – ١٣٠٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. کشف الظنون ٢/١٤١١.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٤٨٧.

٣. معجم المؤلفین ١١/٧.

### محەممەد عەلی بەرزنجی (١٤٣٠)

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلییە کوڕی بابارەسولە، لە سەیدەکانی (بەرزنجە)یە، ساڵی ١٢٦٩ك – ١٨٥٢ز هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە ناوچەی سولێمانی خوێندنەکەی بردەسەر، پاشان سەفەری (ئەستەمبۆڵ)ی کرد، ماوەك لەوێ ماوە، کرا موفتی

گەڕاوە سلێمانی، زانایەکی زیرەك و زمان ڕەوان بوو، جگە لـە زمـانی خـۆی عـەرەبی و فارسی و تورکی دەزانی، ساڵی ١٣٢٤ك – ١٩٠٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. تأريخ مشاهير كورد ٢/٩٦.

٢. تأريخ السليمانية ٢٨٥.

## محەممەد عەلی بروجردی (١٤٣١)

ناوی محەممەدە، نازناوی (ئەبوبـەکر)ە، کـوڕی عـەلی کـوڕی عومـەرە، خـەڵکی (بروجرد)ە، یەکە لە زانایە مەزنەکانی مەزهەب شافیعی، لە (بەغدا)ی خوێند، پاشان چووە (مەرو) خەریکی خواپەرستی بوو، تا مانگی مـەولود، سـاڵی ٥٥٥ك – ١١٦٠ز کۆچـی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٧٠ – ٤٧١.

## محەممەد عەلی جامیع (١٤٣٢)

ناوی محەممەدە کوڕی عەلی کوڕی جامیعە، ساڵی ٤٥٠ك – ١٠٥٨ز لە هەولێر هاتەدنیا، هەر لەوێ پەروەردە بووە، یەك بووە لە زانایە مەزنەکانی سـەردەمی ئـەبولهیجای سەرۆکی هەولێر، ووتاری ڕۆژانی هەینی داوە، مامۆستا خضر نەصر کە لە هـەولێر سـاڵی ٥٣٣ك – ١١٣٨ز دەرسی داوە، دەڵێ: {ناوبراو یەکەم مامۆستای شەرع زانی هەولێرە، منیش لە خزمەتم خوێندووە}، ساڵی ٥٥٠ك – ١١٥٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأريخ أربيل ١/٣٧٠.

## محەممەد عەلی جزیری (١٤٣٣)

ناوی محەممەدە کوڕی عەلی کوڕی غالیـی جزیریـە، نازنـاوی شەمسـەدینە، لـە (دیمشق) دانیشتووە، سـەفەری کـردووە بـۆ (یەمـەن) لـەوێ سـاڵی ٦٨٩ك – ١٢٩٠ز کوژرا، کتێبانی (المقامات الجزرية) و (الإعتراض المبدي لوهم التاج الكندي) داناون.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ١١/٣٢ – ٣٣.

٢. کشف الظنون ١/١١٩.

٣. إیضاح المکنون ٢/٥٣٥.

٤. هدیة العارفین ٢/١٢١ – ١٣٦.

٥. معجم أعلام الکورد ٦١٨.

**محەممەد عەلی جزیری (١٤٣٤)**

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلی کوڕی مەهرانی جزیری یە، نازناوی ئەبو عبدالله یە، چووە (بەغدا) دەرسی لەلای (ئیلکیای هیراسی) خوێند، گەڕاوە (جزیرە) دەستی کرد بە دەرسدانەوە، چەند زانا لەسەر دەستی ئەو دەرچوون، زاتەکی بە دین و لە خواترس و دڵ ڕۆناك بوو، زۆر کەراماتی لێ دەگێڕنەوە، ساڵی ٥٤٥ك – ١١٥٠ز لە (دیاربەکر) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: طبقات الشافعیة الکبری ٣٩٥ – ٣٩٦.

**محەممەد عەلی حەڕانی (١٤٣٥)**

ناوی محەممەدە کوڕی عەلی کوڕی عبدالله ی کوڕی ئەبولفەتحی کوڕی ئەبوحەسەنی (حەڕانی)یە، ساڵی ٦٤٠ك – ١٢٤٢ز لە (حەلەب) هاتووتەدنیا، لە (قاهیرە) نیشتەجێ بووە، لەلای چەند زانایانی خوێندوە، خۆی دەرسی فەرموودەی بە مامۆستا (زەهەبی) و چەندانی تر داوە، زاتەکی بە دین و ڕوو لە چاکە و بێ فیز بوو، حەزی لە گفتوگۆی بابەتی فەرموودە بووە، ساڵی ٧١٠ك – ١٣١٠ز لە (قاهیرە) کۆچی کرد.

سەرچاوە: الدرر الکامنة ٤/٧٠.

**محەممەد عەلی حەڕانی (١٤٣٦)**

ناوی محەممەدە کوڕی عەلی کوڕی محەممەدی کوڕی صەدەقەیە، خەڵکی حەڕانە گەڕیدە بووە و بازرگانی کردووە، صەحیحی ئیمامی موسلیمی گێڕایتەوە و بەلاوی

کردوتەوە، مانگی مەولود ساڵی ٥٨٤ك – ١١٨٨ز لە تەمەنی نۆهەت و حەفت ساڵیدا لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. سیر أعلام النبلاء ١٢/٤٢٥ – ٤٢٦.

٢. شذرات الذهب ٤/٢٨٢.

## محەممەد عەلی حصکەفی (١٤٣٧)

ناوی محەممەدە کوڕی عەلی کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی محەممەدە، خەڵکی (حصن کیفا – شەرناخ)ە، مەزهەبی حەنەفی بووە، ساڵی ١٠٢٥ك – ١٦١٦ز هاتووتەدنیا، لە (دیمشق) دانیشتووە، لە شەریعەت و فەرموودە و ئوصول و تەفسیر و نەحو شارەزا بووە، بۆ خوێندن چوویتە (ڕەملە) و (قودس)، چووە سەفەری حەج، ماوەك لە مەدینەی پیرۆز ماوە بۆ خوێندن، دوایی کرا موفتی حەنەفییەکان، لە ١٠ی شەووالی ساڵی ١٠٨٨ك – ١٦٧٧ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (شرح تنویر الأبصار) و (خزائن الأسرار) و (إفاضة الأنوار) و (حاشیة علی تفسیر البیضاوي) و (حاشیة علی البخاري) و (شرح القطر).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ١١/٥٦ – ٥٧.

٢. کشف الظنون ٢/١٨١٥.

٣. إیضاح المکنون ١/١٤٠.

٤. خلاصة الأثر ٤ /٦٣ – ٦٥.

٥. هدیة العارفین ٢/٢٩٥ – ٢٩٦.

٦. الأعلام ٢/٢٨٨ /٧/١٨٨.

٧. معجم أعلام الکورد ٦١٩.

## محەممەد عەلی حصکەفی (١٤٣٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلی کوڕی مەنصورە، خەڵکی (حصن کیفا)یە، نازناوی شەمسەدینە، مەزهەبی شافیعی بووە، ساڵی ٨١٩ك لەوشارە هاتووتەدنیا، لە نەحو و صەرف و شیعر و مۆسیقا شارەزا بووە، سەفەری بۆ (شام) و (میصر) و (حیجاز) کردووە.

چەند دانراوی هەیە، لەوانە: (شجرة في النحو) و (شجرة في الصرف) و (رفع الحجاب في ذبائح أهل الكتاب) و (تحقيق الكلام في موقف المأموم والإمام)، لە ١٠ی مانگی جیمادی دووەم، ساڵی ٨٥٩ك – ١٤٥٥ز لە (قودس) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١١/ ٣ – ٤ – ٦٥.

٢. إيضاح المكنون ١/٢٦٧.

٣. معجم أعلام الكورد ٦٢٠.

## محەممەد عەلی (شێخ محەممەدی خاڵ) (١٤٣٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ ئەمینی خاڵ کوڕی شێخ محەممەد کوڕی شێخ ئیسماعیلی کوڕی شێخ مصطەفایە، دەچێتەوە سەر مەلا ئەبوبەکری (مصنف) – خوا لێی خۆش بی –، ساڵی ١٩٠٤ز لە شاری سلێمانی هاتەدنیا، لە بنەماڵەکی ئایین پەروەر و زانیاری خواز پەروەردە بووە، لە تەمەنی نۆ ساڵی دا باوکی کۆچی دوایی کرد، شێخ ئەمینی باپیری بەخێوی کرد و لەبەر خوێندنی دانا، ماوەك لە مەدرەسەی خۆیان لە خزمەت باپیری خوێند، پاشان چووە لای مەلا شێخ جەلالی قەرەداغی، زۆربەی کتێبەکانی لەلای ئەو تەواوکردن، دوایی چووە لای مەلا حوسێنی (پسکەند)ی توحفە و تەهزیبی خوێند، ساڵی ١٩٣١ز باپیری کۆچی دوایی کرد، لەلایەن ئەحمەد تەفیق بەگ مامۆستا خاڵ لە شوێنی باپیری دانرا، ساڵی ١٩٣٩ز بەشداری کرد لە تاقیکردنەوەی وەزارەتی داد لە (بەغدا) پاش دەرچوونی کرا قازی.

ئەو پلە و پایانەی وەری گرتووە:

- قازی بوو لە: هەڵەبجە، چەمچەماڵ، سلێمانی، کەرکوك، موصل.
- ساڵی ١٩٥٣ز کرا ئەندامی کۆڕی زانیاری (عێراق).
- ساڵی ١٩٦٢ز کرا ئەندامی دادگای تەمیزی شەرعی لە بەغدا.
- ساڵی ١٩٦٧ز خانەنشین کرا.
- ساڵی ١٩٧٢ز کرا جێگری سەرۆکی کۆڕی زانیاری (کورد).

پلەی زانیاری: خۆی ئاویتە ناو دەریای زانیاری، بەهۆی زانایە مەلەوانەکانی کوردستان، شارەزابوو لە هەموو زانستەکان، کەون و نوێ، لەلایێکەوە قازی شەرعی بوو، کێشەی کۆمەڵایەتی پێك دەینا، لەلاییکەوە دەرسی دەداوە، مێشکی قوتابیانی ئاو دەداوە، لە هەموو کاتێکدا قەڵەمەکەی لەکار بوو بۆ نووسینی بابەتانی تەفسیر و شیعر و ئەدەبیات و مێژوو و نەحو و صەرف و بەلاغە و کەلام و مەنتیق و فەلسەفە و حیکمە و دەروناسی و ئەستێرەناسی، جگە لە پەند و قسەی نەستەق و چیرۆك، بە ڕاستی پەرتوکخانەی کوردی دەوڵەمەند کرد، کارە پیرۆزەکانی قەت نابی لە بیربکرێن، نووسەران و ڕۆشنبیرانی کورد قەرداری ئەو زاتەنە، ئەو هەموو پاداشانە نادرێنەوە، تەنیا بە خوای گەورە.

دانراوەکانی عەرەبی:

١. الشيخ معروف النودهي: ساڵی ١٩٦١ز لە (بەغدا) چاپ کرا.
٢. البيتوشي: ساڵی ١٩٥٧ز لە چاپخانەی مەعاريف لە بەغدا چاپ کرا.
٣. حلقة مفقودة من تأريخ البصرة: لەلایەن کۆڕی زانیاری عێراق چاپ کرا.
٤. تأريخ الأمارات الأفراسيابية: ساڵی ١٩٦١ز لە (بەغدا) چاپ کرا.
٥. شرح وتقديم كنز اللسن: ساڵی ١٩٨٥ز لە (موصل) چاپ کرا.
٦. تعليقات على برهان المنطق.
٧. تعليقات على آداب البحث.

دانراوەکانی کوردی:

٨. ژیاننامەی موفتی زەهاوی: ساڵی ١٩٥٣ز لە بەغدا چاپ کرا.

٩. ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن (درودی خوای لێ بێ): ساڵی ١٩٣٧ز لە سلێمانی چاپ کرا.

١٠. چەند (پەند) ساڵی ١٩٥٧ز لە (بەغدا) چاپ کرا.

١١. فەلسەفەی چەند مەسەلەی ئیسلامی، ساڵی ١٩٣٨ز لە سلێمانی چاپ کرا.

١٢. تەفسیری سورەی (فاتیحە)، ساڵی ١٩٥٥ز لە سلێمانی چاپ کرا.

١٣. تەفسیری خاڵ: جزوی (عم)، ساڵی ١٩٣٥ز لە سلێمانی چاپ کرا.

١٤. تەفسیری خاڵ: جزوی (تبارك)، ساڵی ١٩٨٦ز چاپ کرا.

١٥. تەفسیری خاڵ: جزوی (قدسمع)، ساڵی ١٩٨١ز چاپ کرا.

١٦. تەفسیری خاڵ: جزوی (الذاریات)، ساڵی ١٩٩٠ز چاپ کرا.

١٧. تەفسیری خاڵ: جزوی یەکەم، ساڵی ١٩٦٩ز چاپ کرا.

١٨. تەفسیری خاڵ: جزوی دووەم، ساڵی ١٩٧٩ز چاپ کرا.

١٩. تەفسیری خاڵ: جزوی سێیەم، ساڵی ١٩٧٩ز چاپ کرا.

٢٠. تەفسیری خاڵ: جزوی چوارەم، ساڵی ١٩٨٤ز چاپ کرا.

٢١. ناڵەی دەرون: دوو بەرگە، ساڵی ١٩٨٤ز لە (بەغدا) چاپ کرا.

٢٢. فەرهەنگی خاڵ: قاموسی کوردی – کوردی یە، سێ بەرگە، ساڵانی ١٩٦٠ – ١٩٦٤ – ١٩٧٦ز لە سلێمانی چاپ کران.

٢٣. بابا تاهیر هەمەدانی، ساڵی ١٩٧٧ز لە (بەغدا) چاپ کرا.

٢٤. مەولودنامە: ساڵی ١٩٣٧ز لە (سلێمانی چاپ کرا.

٢٥. لێکۆڵینەوەی دیوانی شێخ ڕەزا: ساڵی ١٩٨٩ز لە (بەغدا) چاپ کرا.

٢٦. جەمالەدین ئەفغانی: ساڵی ١٩٧٦ز لە (بەغدا) چاپ کرا.

٢٧. مەلا محەممەدی خاکی: ساڵی ١٩٧٨ز چاپ کرا.

٢٨. پیشوندو پسوند.

٢٩. سۆزی مینبەر: ساڵی ١٩٩٧ز چاپ کرا.

٣٠. ئایین ڕەوشت و جوانکردن: ساڵی ١٩٤٩ز چاپ کرا.

٣١. پەروەردەی ئایین: ساڵی ١٩٧٥ز چاپ کرا.

٣٢. ڕێزمانی کوردی: ساڵی ١٩٦٠ز چاپ کرا.

٣٣. پێشگر و پاشگر: ساڵی ١٩٧٨ز چاپ کرا.

کۆچی دوایی: لە بەرواری ١٥/٧/١٩٨٩ز کۆچی دوایی کرد، دکتۆر خالیدی کوڕی لەدوا بەجێما.

سەرچاوەکان:

١. لە سەرگوزشتەکانی ژیانی شێخ محەممەدی خاڵ ١٤ – ١٧.

٢. أسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٢١ – ٢٦٥.

٣. تأريخ مشاهير كورد / فارسي /٢/٥٤٨ – ٥٥١.

٤. معجم أعلام الكورد ٦٤٨.

٥. أعلام كورد العراق ٦٩٧ – ٦٩٩.

## محەممەد عەلی خەطیب (١٤٤٠)

ناوی محەممەدە کوڕی عەلی خەتیبی، کوڕی ئەحمەدە، خەڵکی (هەولێرە)، ساڵی ٦٨٦ك – ١٢٨٧ز هاتووتەدنیا، لە (موصل) دانیشتووە، لە مۆسیقا شارەزا بووە، کتێبی (القصيده في الأنغام)ی داناوە، ساڵی ٧٢٩ك – ١٣٢٨ز تەواوی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٧.

٢. معجم المؤلفين ١١/٧.

٣. مشاهير الكورد ١٣٧.

٤. معجم أعلام الكورد ٦٠٤.

## محەممەد عەلی خەلاطی (١٤٤١)

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلی کوڕی حوسێنە، نازناوی (ئەبولفەضلە)، خەڵکی (خەلاطە)، ساڵی ٥٩٥ك – ١١٩٩ز هاتەدنیا، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (بەغدا) و (دیمشق)ی خوێندووە، چوویتە (قاهیرە) لەوێ کرایتە قازی، شەرحی وەجیزی ئیمامی عەزالی کردووە بەناوی (قواعد الشرع وضوابط الأصل والفرع)، دانراوی تری زۆرن، ساڵی ٦٧٥ك – ١٢٧٦ز لە (قاهیرە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٦٩.
٢. معجم أعلام الكورد ٦٢١.
٣. معجم المؤلفين ١٠/٣١٨.
٤. مشاهير الكورد ٣٦٠.
٥. هدية العارفين ٢/١٣٢.
٦. كشف الظنون ٢/١٣٥٨.

## محەممەد عەلی دیاربەکری (١٤٤٢)

مامۆستا محەممەد عەلی دیاربەکری، ناسراوە بە کوردی چەلەبی، سەرۆکی قازیان بووە لە (دیمشق)، هەر لەوێ ساڵی ١٠٦٦ك – ١٦٥٥ز کۆچی دوایی کردووە، (أنموذج في سبعة فنون) و (التحقيق والتوفيق بين أهل الشرع وأهل الطريق)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. إيضاح المكنون ١/١٣٦.
٢. مشاهير الكورد ٢/١٥٢.
٣. هدية العارفين ٢/٢٨٧.
٤. معجم المؤلفين ١٠/٣٠٩.
٥. معجم أعلام الكورد ٦١٨.

٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢ ٥٠٢.

**محەممەد عەلی دینەوەری (١٤٤٣)**

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلییە، نازناوی (ئەبوبەکرە) ناسراوە بە (بورهان) خەڵکی دینەوەرە، زانایەکی بەدین و خواناس و ڕاستگۆ و بڕواپێکراو بووە، کەراماتی لێ دەگێڕنەوە، ساڵی ٣٤٩ك – ٩٦٠ز چووە (بەغدا) لەوێ دەرسی بە چەند زانایاندا.

سەرچاوەکان:

١. اللباب ٦/٥٢٦.

٢. الأنساب ٢/٥٩٢.

**محەممەد عەلی ژەنگاری (١٤٤٤)**

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلی کوڕی ئەبوفەتحی کوڕی نەصری کوڕی عەسکەری کوڕی مەجدەدینی (ژەنگار)یە، دەرسی فەرموودەی لە (٢٥) مامۆستای ژن و پیاو وەرگرتووە، شەوی ١٦ی ڕەمەزان، ساڵی ٧٢٢ك – ١٣٢٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٤/٩٩.

**محەممەد عەلی سروجی (١٤٤٥)**

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلی یە کوڕی ئیبکە، خەڵکی سروجە نازناوی شەمسەدینە، ساڵی ٧١٤ك – ١٣١٥ز هاتەدنیا، زانایەکی فەرموودەناس بووە، لە (میصر) و لە (دیمشق)ی خوێندووە.

دانراوەکانی: (تخريج مائة حديث متباينة الإسناد) و (احداق الحقائق في النظم الرائق) و (كتاب في تراجم الأحمدين). ساڵی ٧٤٤ك – ١٣٤٣ز لە (حەلەب) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. كشف الظنون ١/١٦.

٢. شذرات الذهب ٦/١٤١.
٣. معجم المؤلفين ١٠/٣١٠.
٤. هدية العارفين ٢/١٥١.

### محەممەد عەلی شارەزوری (١٤٤٦)

ناوی محەممەدە، کوڕی عـەلی کـوڕی حەسـەنی کـوڕی ئەحمـەدی کـوڕی عـەلی شارەزورییە، ساڵی ٤٧٩ك – ١٠٨٦ز هاتەدنیا، لە (بەغدا) فێری زانیاری بوو، شێخەکی بڕواپێکراو و لە خواترس بوو، لە ژمێریاری و فەرائیز شارەزا بوو، دوکانی دەرمان و بۆنی خۆشی هەبوو، مەلایان دەچوونە لای دەرسی فەرائیزی پێدەدان، پاشـان چـووە (موصـل)، لەوێ باری کرد بۆ (ئازربێجان)، ساڵی ٥٥٥ك – ١١٦٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٦٨.
٢. الإكليل في محاسن أربيل ٨٨.
٣. طبقات الشافعية الكبرى ٣/٣٨٩.
٤. المنتظم ١٠/٤١١.
٥. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ٢/٥٧٣.
٦. الأنساب ٣/٤٨٩.

### محەممەد عەلی شارەزوری (١٤٤٧)

ناوی محەممەدە کوڕی عەلی کوڕی مەحمودی کوڕی عەلی یە خەڵکی شـارەزورە، نازناوی (صەلاحەدینە)، باوکی ناوبراوە بـە (قـازی شەمسـەدین) مامۆسـتا محەمـەد وەکـو باوکی یەك بووە لە زانایە چاکەکانی سەردەمی خۆی، لە مەدرەسەی (قەیمەرییە) هەردووك دەرسییان داوە، لە کۆتایی مانگی ڕەجەبی ساڵی ٦٨١ك – ١٢٨٢ز کۆچی دوایی کرد، دوای یەك مانگ مامۆستا شەرەفەدینی براشی کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: البداية والنهاية ١٣/٣٠٥.

## محەممەد عەلی عەلیاوەیی (١٤٤٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلی کوڕی زاهیری کوڕی سوارەی کوڕی جافری کوڕی حاجی یە سالّی ١٩١٩ز لە گوندی گردعازەبان، هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە گوندی (شیوە پیران) دەستی کرد بە خوێندن، لەلای فەقێ کەریم قادر عەلیاوەیی، هەر لەو گوندە ماوەك لەلای مەلا ئەحمەدی خوێند، پاشان خوێندنەکەی لەلای ئەو مامۆستایە بەرێزانە بردەسەر: مەلا ئەحمەدی ڕەش، مەلا شەریفی دووشیوانی، مەلا محەممەدی شێروانی، مەلا مەعصومی کۆیی، مەلا ئیسماعیل جدیدەی، مەلا خەلیل موخلیص، مەلا عومەر کەوری، مەلا محەممەدئەمینی قەراسنجی، ماوەکیش چووە (ئەشکەوسەقا) لای مەلا صالّحی گەرۆتە، پاشان ئاودیوی (ئێران) بوو، گەڕاوە (ڕواندز) لە ١٩٤٩/١٠/٧ز ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: لەو شوێنانە مەلا بوو و دەرسی فەقێیانی دەداوە: پەنجە عەلی نزیك کەرکوك، گرد قۆشەنەی قەراج، گردعازەبان، سالّی ١٩٦٠ز وازی لە مەلایەتی هێنا، بووە مامۆستا لە وەزارەتی پەروەردە سالّی ١٩٨٠ز خانەنشین کرا، ماوەك لە مالّی خۆی، ماوەك لە مزگەوتی سەید غەریب لە گەڕەکی (سیطاقان) ماوەك لە مزگەوتی حاجی مراد دەرسی دەدا، دوایی کرا مەلا لە مزگەوتی گەورەی ناوبازاڕ، لەوێش فەقێی هەبوون.

خووڕەوشتی: مەلایەکی زیرەك و بێ فیز بوو، قسەخۆش بوو، سەربردەی زۆر دەزانین، میوان بیا لە کەسەك خانەخوێیەکە حەزی دەکرد شەو نەنوی، تەنیا گوێ لە قسە خۆشەکانی ئەو ڕابگری، دەورێکی سەرەکی هەبوو بۆ ئاهەنگ گێڕانی ئیجازەی مەلایان، لە ١٩٨٥/١٠/٢٠ز کۆچی دوایی کرد، دکتۆر عبداللە ی کوڕی لە دوای بەجێما، مامۆستای زانکۆیە.

دانراوەکانی:

١. ژیانی فەقێیاتی لە کوردستان، سالّی ٢٠٠٣ز چاپ کرا.
٢. سالّنامە و فۆلکۆڕی کوردی.

٣. غەم ڕەوێن.

٤. دیوانی شیعر.

٥. بەسەرهاتی ژیانی خۆی.

٦. مصباح الطالب في المطالب: في النحو.

٧. مصباح الظلام للحجاج الكرام.

٨. فتاوي علماء الكورد.

٩. حەج نامە.

١٠. وريقات على تعليقات القزلجي.

سەرچاوەکان:

١. خۆری ئیسلام ٣/١٩٩٩ز.

٢. ژیانی فەقێیاتی لە کوردستان ٧ – ١٨.

## محەممەد عەلی عەونی (١٤٤٩)

ناوی محەممەد عەلییە، کوڕی عبدالقادر عەونی ئەفەندی کوڕی محەممەد عەلی ئاغایە ساڵی ١٣٠٦ک – ١٨٨٨ز لە شاری (سوێرك) سەر بە (دیاربەکر) هاتەدنیا، باپیری سەرۆك عەتشیرەتی (دنبەڵی) بوو، باوکی موفتی سوێرك بوو، ناوبراو لەسەرەتاوە لە تورکیا دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (میصر) لە (ئەزهەر) بڕوانامەی بە دەست هێنا، لەبەرئەوەی بیری نەتەوایەتی هەبوو حکومەتی تورك ڕێگای گەڕانەوەی وڵاتەکەی خۆی پێ نەدا، لە (میصر) ماوە، بە چاکی فێری تورکی و فارسی و عەرەبی و فەڕەنسی بوو، لەساڵی ١٣٧١ک – ١٩٥١ز لە (قاهیرە) کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی:

١. تەرجومەی (خلاصة تأريخ الكرد وكردستان)ي محەممەدئەمین زەکی بەگ.

٢. تەرجومەی (تأريخ الدول والأمارات الكردية)ي محەممەدئەمین زەکی بەگ.

٣. تەرجومەی (مشاهیر الكرد)ي محەممەدئەمین زەكی بەگ، ئەو سێ كتێبەی سەرەوە لە كوردی بۆ عەرەبی تەرجومە كردیە.

٤. العائلة التيمورية.

٥. تەرجومەی شەرەفنامەی بەدلیسی، لە فارسی وەلای عەرەبی.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٦٦٩.

**محەممەد عەلی (قازی محەممەد) (١٤٥٠)**

جەنابی قازی محەممەد، كوڕی عەلی كوڕی قازی میرزا ئەبوقاسمی كوڕی میرزا ئەحمەدی سابلاغی یە، ساڵی ١٩١٠ز لە (مەهاباد) هاتوەتەدنیا، لەژێر چاودێری باوكی دەستی كرد بە خوێندنی ئاینی، هەر لە زووەوە كرا سەرۆكی بەڕێوەبەرایەتی زانیاری ئەوقاف، پاشان كرا (قازی).

عەرەبی و ڕوسی و ئینگلیزی چاك دەزانی، سەرۆكی كوردەكانی ئێران بوو، لە بەرواری ١٩٤٥/١٢/٢٦ز بە پشتگیری حاجی قەرەنی ئاغای سەرۆكی (مامەش) و عبدالله بایەزید سەرۆكی (مەنگوڕ) چەندان سەرۆك هۆزانی تر، شۆڕشی سازدا لە دژی قاجارەكانی ئێرانی داگیركەر، كۆماری مەهابادی دامەزراند، خۆی سەرۆك كۆمار بوو، زمانی كوردی دانا بە زمانێكی بڕواپێكراو، چەندان ڕۆژنامە و گۆڤاری كوردی دەركرد و ڕێی پێدان، مافی ئافرەتانی دا، یەكەم سەربەخۆیەتی كورد بوو بەم شێوەیە بە ئاشكرایی بەلاوكراوە.

ئەندامی وەزارەتەكانی بەم جۆرە دانا:

| | | |
|---|---|---|
| ١. | حاجی باباشێخ جەمیان | سەرۆك وەزیران |
| ٢. | محەممەد حوسێن سەیفی | وەزیری جەنگ و بەرگری |
| ٣. | كەریم ئەحمەدی | وەزیری تەلیگراف و پۆستە |
| ٤. | مەناف كەریمی | وەزیری فەرهەنگ |
| ٥. | محەممەدئەمین موعینی | وەزیری كیشوەر |

٦. حاجی ڕەحمانی ئیلخانی وەزیری تەگبیر و ڕا
٧. ئیسماعیل ئیلخانی وەزیری ڕێگاوبان
٨. ئەحمەد ئیلاهی وەزیری ئابووری
٩. حاجی مصطەفا داودی وەزیری بازرگانی
١٠. مەحمود وەلی زادە وەزیری کشتوکاڵ
١١. خەلیل خسرەوی وەزیری کار و فەرمان
١٢. صەدیق حەیدەری وەزیری ڕاگەیاندن.

کەوایان زانی کاربەدەستەکانی ئێران، کێچیان کەوتە کەوری، لەلایەکی دیکە ئەمریکا و ئینگلیز و ڕووس، دەستیان کرد بە پیلانگێڕی، پاڵپشتی ئێرانیان کرد، ئەندازە و نەخشەیان بۆ کێشان، لەشکرێکی گەورەیان نارده سەر (قازی) لەو هێرشە دڕندەییە بە هەزاران کوردی موسوڵمانی بێ تاوانیان کوشت و تاڵان و دەربەدەریان کردن، ژمارەی (١٥) پازدە سەرکردەیان لە لەشکری قازی گرت، کاتی نوێژی نیوەڕۆ لە پێش چاوی خەڵکان، لە گۆڕەپانی (چوارچرا) لە سێدارەدران، لەگەڵ سەرۆک قازی محەممەد و ئەبولقاسم سەدری قازی برای کە ئەندامی پەرلەمانی ئێران بوو، هەروەها محەممەد حوسێن سەیفی ئامۆزای کە وەزیری بەرگری بوو، هەر هەموویان لە ٣١/٣/١٩٤٧ز لەسەریان درا و ئیعدام کران.

شایانی باسە لەو جەنگە و لەو شۆڕشە سەرۆک مەلا مصطەفای بارزان بەشدار بوو، بەڵام خۆی نەدا دەست ئێرانیان، لە نێوان سێ دوژمنی خوێن خۆری کورد: عێراق و ئێران و تورکیا شێرانە خۆی دەرباز کرد، چووە (ڕوسیا)، لەوێ نیشتەجێ بوو، تا ساڵی ١٩٥٨ز گەڕاوە (بەغدا) پاشان هاتەوە (بارزان).

سەرچاوەکان:

١. شۆڕشەکانی کورد ٢٧٠ – ٣٢٢.
٢. مشاهیر الکورد ٢/٨٦ – ٨٨.

٣. تأريخ مشاهير كورد / فارسى /٣/٥٨٨ – ٥٩٧.
٤. البارزان والحركة التحررية الكردية ٣/٤٥ – ٦٧.
٥. معجم أعلام الكورد ٤٩٩ – ٥٠٠ – ٦١٨ – ٦١٩.
٦. ستاندەرە، ژمارە ١٤، نیسانی ٢٠٠٧ز.

## محەممەد عەلی کاوانی (١٤٥١)

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلی کوڕی عبداللەی کوڕی ئەحمەدی (کاوانی)یە، ناسراوە بە ئەبولهەیجای بەغدایی، ساڵی ٤٦٨ك – ١٠٧٥ز هاتووتەدنیا، ئیسماعیل پاشا دەڵێ: {کاوانی: بەرەبابەکی کوردن لە هەولێر}[1].

مامۆستا ئەسنەوی دەڵێ: {جاوانی بەرەبابەکی کوردن، لە شاری (حیللە)ی عێراق دانیشتوون}[2]، ئەو زاتە بە منداڵی چوویتە (بەغدا) لەوێ لەلایەن ئیمامی غەزالی و حەریری فێری شەریعەت بووە، لە هەولێر نیشتەجێ بووە، سەفەری بۆ وڵاتی (فارس) کردووە، لە (خەفتیان) ساڵی ٥٦١ك – ١١٦٥ز کۆچی دوایی کردووە، (خەفتیان) **لەوانەیە گوندی** (هەودییان) بی، کە ئێستا نزیکە لە (ڕواندز).

چەند دانراوی هەنە، لەوانە: (التبيان بشرح الكلمات)، (المنتظم في سلك الأدوات) و (ديواني شيعر) و (الذخيرة لأهل البصيرة) و (شەرحی مەقاماتی حەریری) و (عيون الشعر) و (الفرق بين الرأء والغين) و (مسائل الإمتحان) و (نزهة النفس وروضة المجلس).

سەرچاوەکان:

١. أربيل في العهد الاتابكي ٢٩٠ – ٢٩١.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٦٨ – ٤٦٩.

[1] هدية العارفين ٦/٩٥

[2] طبقات الشافعية / ئەسنەوی ١/٣٦٧ – ٣٦٩.

٣. كشف الظنون ١/٣٤٢.
٤. إيضاح المكنون ١/٤٨٤.
٥. معجم المؤلفين ١١/٢٣.
٦. طبقات الشافعية الكبرى ٣/٣٩١.
٧. معجم أعلام الكورد ٦١٩ – ٦٢١.

**محەممەد عەلی کوردی ( ١٤٥٢ )**

ناوی محەممەد علی‌یە، کوڕی محەممەد سەلیمی کوڕی مرادی کوردی حەنەفی یە، لە ١٨/٢/١٩١٨ز لەشاری (حەما)ی سوریا هاتووتەدنیا، قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتایەکانی لەلایەن مامەکانی تەواوکردن، پاشان چووە قوتابخانەی (دار العلم والتربیة)، دوایی چووە قوتابخانەی (شەرعییە) لە (حەما)، پاشان چووە قوتابخانەی (خوسرەویە) لە (حەلەب)، ساڵی ١٩٤٤ز چووە زانکۆی (ئەزهەر)، ساڵی ١٩٤٨ز تەواوی کرد، گەڕاوە جێگای خۆی دەستی کرد بە دەرسدانەوە و ئامۆژگاری موسوڵمانان و پێش نوێژی و ووتاردان و جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی و بەستانی کۆڕان بۆ یادی خوا و سەلاوات لێدان لەسەر پێغەمبەر (درودی خوای لێ بی)، ساڵی ١٩٨٠ز چووە (مەدینە)ی پیرۆز، ماوە لەوێ تا ساڵی ٢٠٠٠ز هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: پێگەی ئەنتەرنێت. (http://www.ghrib.net)

**محەممەد عەلی مارانی ( ١٤٥٣ )**

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلی کوڕی محەممەدی کوڕی جارودە، خەڵکی (ماران)ە، ماران: ئەو دەشتەیە نێوان ئاکرێ و موصڵ، یەك بووە لە زانایە بەرزەکانی مەزهەبی شافیعی، لە هەولێر دەرسی لەلای یونس محەممەد مەنعە خوێندووە، پاشان هەر لەوێ کرایتە قازی، شیعری نازکی هەیە، ساڵی ٦٢٩ك – ١٢٣١ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٣/١٣٦.

٢. أربيل في العهد الأتابكي ٢٢٧.

## محەممەد عەلی مەرعەشی (١٤٥٤)

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلییە، خەڵکی (مەرعەش)ی کوردستانی تورکیایە، دەرسی لەلای زانایە گەورەکانی (دیمشق) خوێندووە، لە مەزهەبی حەنەفی شارەزا بووە، لە زانستەکان ئاگاداربووە، ماوەی چل ساڵان لە قوتابخانەی (جەقمەقییە) دەرسی نەحو و صەرف و ئوصول و مەنتیق و بەلاغەی داوە، ساڵی ١٣٤٠ك – ١٩٢١ز کۆچی کرد.

دانراوەکانی: (نصيحة الخلان) و (التحفة النحوية على العوامل البركوية) و (إتحاف الطلبة بالأسئلة المنطقية).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١١/٦٣.

٢. نثر الجواهر والدرر ٢/١٣٨٧.

## محەممەد عەلی نۆدەیی (١٤٥٥)

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلی کوڕی بابارەسولە، لە دەوری ساڵی ١٠٤٠ك – ١٦٣٠ هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە لای مامۆستایانی (قەلاچوالان) کۆتایی بە خوێندن هینا، گەڕاوە (نۆدێ) دەستی کرد بە خزمەتگوزاری ئاینی پیرۆز و ڕێ نیشاندانی خەڵکان و ئامۆژگاری کردنیان، بوو بە زاتێك توانی دڵی چەند کەسان ساف بکا، فێری ڕەوشتی ئیسلامیان بکا، سەفەری (بەغدا)ی کرد چووە خزمەت شێخ محەممەد صادق، پاشان چووە سەفەری (حەج)، ساڵی ١١٢٦ك – ١٧١٤ز کۆچی دوایی کرد.

پێنج کوڕی هەبوون: شێخ ئیسماعیل و شێخ حەسەن و شێخ ئەحمەد غەزائی و شێخ محەممەد میری سۆر و شێخ عەلی.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٩٧ – ٤٩٨.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٣٠٩ – ٣١٦.

**محەممەد عەلی وەلزی (١٤٥٦)**

ناوی محەممەدە، کوڕی مەلا عەلی کوڕی مەلا عبداللە ی کوڕی مەلا عبدالقادری کوڕی مەلا عەلی (فەوزی)یە، خەڵکی گوندی (وەلزێ)ی باڵەکاتی‌یە، ساڵی ١٣٣٨ك – ١٩١٩ز هاتەدنیا، نەحو و صەرف و عەقیدەی لەلای مامی مەلا محەممەدئەمینی ئەشعەری خوێند، لە گوندی (ئوچتەپە)ی بۆکان مەنتیق و بەلاغەی لەلای مەلا عیصامەدینی شەفیعی خوێند لە گوندی (سەرا) حیکمەت و کەلام و شەریعەت و ئوصول و فەلەکیات و ریازیاتی هەر هەموو لە خزمەت باوکی تەواوکردن، لە گوندی (حەمامیان) ئیجازەی وەرگرت، لەو دەوروبەری خەریکی دەرسدانەوە بوو ساڵی ١٣٩٦ك – ١٩٧٦ز کۆچی دوایی کرد، لە تەك باوکی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. ژیناوەری زانایانی کورد ٢٣٧.

٢. تأریخ فرهنگ وادب مکریان ٢٩٣ – ٢٩٧.

**محەممەد عەلی هەولێری (١٤٥٧)**

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەدە، خەڵکی هەولێرە، پاشان چوویتە (موصل) لە زانستی (نەحو) شارەزا بووە، چەند دانراوی هەنە، لەوانە: (شرح الحاوي الصغير) و (حواش على التسهيل) و (شرح الشافية) و (شرح الكافية) و (تعريفات العلوم) وە هەروەها (أرجوزة الأنغام) کە لە ساڵی ٧٢٩ك – ١٣٢٨ز تەواوی کردووە.

مامۆستا شاعیرەکی چازان بووە، بە عەرەبی دەڵێ:

ولقد شاع عني حب ليلى وأنني — كلفت بها شوقا وهمت بها وجدا

ووالله ماحبي لها جاز حده — ولكنها في حسنها جازت الحدا

ناوبراو ساڵی ٦٨٦ك – ١٢٨٧ز هاتەدنیا، لە ٧٥٥ك – ١٣٥٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٤/٥٧.

٢. معجم أعلام الكورد ٦٢٠.

٣. الأعلام ٧/ ١٧٦.

٤. معجم المؤلفين ١٠/٣٠٢.

٥. مشاهير الكورد ١/١٣٥ - ١٣٦.

٦. هدية العارفين ٦/١٣٥.

٧. كشف الظنون ١/٤٠٦ /٢/١٣٦٩.

٨. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٣ - ٤٨٤.

## محەممەد عەلی هەولێری (١٤٥٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی عەلی کوڕی مالیکە، خەڵکی هەولێرە زانایەکی شەریعەت زان بووە، شەرحێکی بەنرخی لەسەر کتێبی (الحاوی الصغیر)ی قەزوینی داناوە، ساڵی ٦٨٦ک - ١٢٨٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٥٠.

٢. كشف الظنون ١/٦٢٦.

٣. معجم المؤلفين ١١/٣٨.

## محەممەد عماد حەڕانی (١٤٥٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی عیمادی کوڕی محەممەدی (حەڕانی)یە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، لە (ئەسکەندەریە) دابەزیوە، زانایەکی بەدین و شەرع زان بووە، کۆمەڵێك زانا لەسەر دەستی پێگەیشتوونە، بازرگانیشی کردووە، لە ١٠ی مانگی صەفەر، ساڵی ٦٣٢ک - ١٢٣٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٥/١٥٥

## محەممەد عەمر ئامێدی (١٤٦٠)

ناوی محەممەدە، کوڕی عەمری کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەدە، خەڵکی (ئامێدی)یـە، فەرموودەناس بووە، کتێبـی (مبرز المعاني في شرح حرز الأماني) دانـاوە، سـاڵی ٧٦٢ك – ١٣٦٠ز تەواوی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٦٢٢.

٢. معجم المؤلفين ١١/٩٨.

٣. هدية العارفين ٢/١٦٢.

٤. إيضاح المكنون ٤/٤٢٤.

## محەممەد عیمران نابینا (١٤٦١)

ناوی محەممەدە، کوڕی عیمرانە، لە چاوان نابینا بـووە، مەزهـەبی حەنبـەلی بـووە، خەڵکی (حەڕانە)، کتێبـی (تەیسیر)ی هەموو لەبەر بووە، لە زانیاری قورئانی پیرۆز بـەهێز بووە، پاش ساڵی ٦٨٠ك – ١٢٨١ز لە (بەغدا) دەرسـی فـەرموودەی دەداوە، سـەفەری دیمشقی کرد، زانیاری لە چەند زانایان وەرگرت، زاتەکی هێمن و لەسـەر خـۆ و زۆرزان بوو، ساڵی ٧٢٠ك – ١٣٢٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٤/١٠٢.

## محەممەد عومەر ئۆرمەوی (١٤٦٢)

ناوی محەممەدە، کوڕی عومەری کوڕی یوسـفە، خـەڵکی شـاری (ورمێ)یـە، لـە (بەغدا) دانیشتووە، لەوێ دەرسی لەلای شێخ ئەبو ئیسحاقی شیرازی خوێنـدووە، دوایـی لە (عاقول) کرا قازی، مەزهەبی شافیعی بوو ناوبراو سـاڵی ٤٥٩ك – ١٠٦٦ز هاتـەدنیا، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٥٤٧ك – ١١٥٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٤/١٤٥.

٢. معجم البلدان ١/١٥٩.

## محەممەد عومەر ئۆمەرگومبەتی (١٤٦٢)

ناوی محەممەدە، کوڕی عومەری کوڕی مەولودی کوڕی مامیلە، ساڵی ١٩١٢ز لە گوندی (ئۆمەرگومبەت) هاتەدنیا، لەو گوندە لەلای مەلا عبدالرحمان ئەحمەد دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (سێگرتکان) لای مەلا ئەحمەدی (ڕەش) دوایی چووە (سێکانی) لای مەلا عبدالرحمانی بەگزادە (لارە)، هەر لە ئۆمەرگومبەت ماوەك لەلای مەلا ڕەشید بوو، چووە (بانەمورد) لای مەلا عومەر، دوایی چووە مزگەوتی حەتك لە (کۆیە) لای مەلا محەممەد، پاشان چووە (بەردەسپی) لای مەلا سەعید، چووە (شاخەپیسکە) لای مەلا عەزیز، دوایی چووە (گۆبتەپە) لای مەلا عبدالقادر، گەڕاوە (ئۆمەرگومبەت) لای مەلا محەممەد نور، چووە (سورداش) لای مەلا عبدالمجید، هاتە هەولێر مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لای مەلا عبداللە ی بێتواتەی، گەڕاوە (سێگرتکان) لای مەلا عبدالقادری (ڕەش)، چووە (کەرکوك) لای مەلا عومەری ئۆمەرگومبەتی ئیجازەی وەرگرت.

لەم شوێنانە مەلایەتی کرد: (طالەبان) (ئۆمەرگومبەت) (سێکانی) (سێگرتکان) (ئۆمەراوە)، پاشان دەستی بەجێ هێشت، باری کرد هاتە هەولێر لە بەرواری ١٥/٣/١٩٩١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنوسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## محەممەد عومەر ئەییوبی (١٤٦٣)

ناوی محەممەدە کوڕی عومەری کوڕی شاهەنشایە، نازناوی (الملك المنصور)ە، لە مەلیکە ئەییوبییەکانە، ساڵی ٥٣٧ك – ١١٤٢ز هاتەدنیا، سی ساڵان ماوە لە مەلیکاتی، ساڵی ٦١٧ك – ١٢٢٠ز کۆچی دوایی کرد، زانایەکی مێژووناس و شاعیر و نووسەر و ڕۆشنبیر بوو، دەرسی فەرموودەی لە (ئەسکەندەریە) خوێند، پاش کۆچی دوایی باوکی کرا مەلیکی (حەما)، شەڕ و شۆڕەکی بە دژواری لەگەڵ ئەفرەنجەکان کرد، پردی بۆ لەشکری خۆی دروست کرد.

دانراوەکانی: (المضمار في التأريخ): ١٠ بەرگە و (طبقات الشعراء) و (درر الآداب في محاسن ذوي الألباب) و (ديوان شيعر).

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٨.

٢. معجم أعلام الكورد ٦٢١ – ٦٢٢.

٣. معجم المؤلفين ١١/٨٣.

٤. البداية والنهاية ١٣/٩٥.

٥. فوات الوفيات ٤/١٢ – ١٣.

٦. كشف الظنون ٢/١١٠٢.

٧. مشاهير الكورد ٣٦٦.

## محەممەد عومەر تاجەدین (١٤٦٥)

ناوی محەممەدە، کوڕی عومەری کوڕی محەممەدە، نازناوی تاجەدینە، مەزهەبی حەنەفی بووە، لە (قاهیرە) دانیشتووە، لە شەریعەت و ڕێزمانی عەرەبی دەستی باڵا بووە، خۆشنووس بووە، نووسینەکانی بێ هەڵە بووینە، مامۆستا محەممەد عبدالرحمان سەخاوی دەڵێ: {ساڵی ٨٦٩ك چاوم پێ کەت}، ساڵی ٨٨٨ك – ١٤٨٣ز کۆچی دوایی کرد، محەممەدی کوڕی جێگری بوو.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٨/٢٣٢.

٢. معجم أعلام الكورد ٦٢٢.

٣. مشاهير الكورد ٣٦٢.

## محەممەد عومەر حەڕانی (١٤٦٦)

ناوی محەممەدە، کوڕی عومەری کوڕی عبدالمحمودی کوڕی زباطی حەڕانییە، ساڵی ٦٣٦ك – ١٢٣٨ز لەو شارە هاتەدنیا، ماوەك لەوێ لەلای مەجدەدین ئیبن

تەیمییەی خوێند، پاشان چووە (دیمشق)، تا دوا ژیانی هەر خەریکی فەرمووده بوو، لە مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد شارەزا بوو، ساڵی ٧١١ك سەفەری (میصر)ی کرد، ناسرابوو بە زاتەکی دوور لە دنیا، روو لە خوا، ساڵی ٧١٨ك – ١٣١٨ز لە (قوبرص) کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٥٠ – ٥١.

٢. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٣٧٣.

٣. معجم أعلام الكورد ٦٢٢.

## محەممەد عومەر دینەوەری (١٤٦٧)

ناوی محەممەدە کوڕی عومەری کوڕی عبدالمليكە، نازناوی (جمال الدين ابو البركات)ە، مەزهەبی شافیعی بووە، ساڵی ٦١٣ك – ١٢١٦ز لە (دینەوەر) هاتووتە/نیا، لە تەمەنی ١٠ سالان لەگەڵ باوکی چووە (دیمشق) لە چیای قاسیون نیشتەجێ بوو، خوێندنی تەواوکرد، دەستی کرد بە دەرسدانەوە، زاتەکی بەدین بووە، ساڵی ٦٨٥ك – ١٢٨٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/٣٩٣.

٢. معجم أعلام الكورد ٦٢٣.

## محەممەد عومەر شێخ شەروانی (١٤٦٨)

ناوی محەممەدە کوڕی عومەری کوڕی خدری کوڕی عومەرە، عەشیرەتی (سارمەم)یيە، ساڵی ١٣٣٨ك – ١٩١٩ز لە گوندی (شێخ شەروان) هاتەدنیا، باوکی ڕەوانی (دیبەگە)ی کرد بۆ خوێندن، قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، لە قۆناغی موستەعیدی چووە (دۆلەزە) لای مەلا عوسمان، چووە (دارەبەن) لای مەلا عبدالله بابم، وە هەر لەگەڵ بابم هاتە (بەحرکە)، چووە (کۆزەپانکە) لای مەلا صالح، ماوەکیش لەلای مەلا ئەحمەدی (ڕەش) بوو، ساڵی ١٩٥٣ز کۆتایی بە خوێندن هینا، بووە مەلا لە گوندی (مشار) پاشان

هاتە هەولێر لە گەڕەکی ڕۆناکی مەلا بوو لە مزگەوتێك، لە بەرواری ١/٤/١٩٩٦ز کۆچی کرد، لە گۆڕستانی گردی پیرداود بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ١٩١ – ١٩٣.

## محەممەد عومەر فارقی (١٤٦٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی عومەرە، خەڵکی (میافارقین)ە کە ئێستا بە (سلیڤانی) ناسرایە، ساڵی ٨١٥ك – ١٤١٢ز هاتەدنیا، لە ولاتی (یەمەن) نیشتەجێ بووە، زانایەکی شەرع زان بوو، ماوەی چل ساڵ زیاتر قازی بوو، لە مانگی شەووالی ساڵی ٨٩٣ك – ١٤٨٧ز لە (وەصاب)ی چیای یەمەن کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (مفتاح الارتاج في شرح المنهاج) و (مختصر الجواهر).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٨٩/١١.

٢. هدية العارفين ٢/٢١٥.

٣. إيضاح المكنون ٢/٥٢٢ – ٥٨٧.

## محەممەد عومەر قەرەداغی (١٤٧٠)

ناوی محەممەدە، کوڕی عومەری کوڕی محەممەدی کوڕی عبداللطیفی قەرەداغی یە، لە ٩/١٠/١٩٢٨ز لە (هەڵەبجە) هاتەدنیا.

لەلای سەید ئەمینی باینجانی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان لەلایەن ئەو بەڕێزانە خوێندنەکەی بردەسەر: شێخ مصطەفای قەرەداغی، شێخ بابارەسولی بێدلی، مەلا عبدالعزیز پرێسی، شێخ نوری باباعەلی، شێخ حەسەنی ئەبوعوبێدی، ساڵی ١٩٤٨ز کۆتایی بە خوێندن هینا، کرا مودەرریس لە شوێنی باوکی: مزگەوتی محەممەد پاشا لە (هەڵەبجە)، ساڵی ١٩٥٠ز هەر لەو شوێنە کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن، پاشان هاتە مزگەوتی گەورەی سلێمانی، ساڵی ١٩٦٥ز کرا بەڕێوەبەری پەیمانگای ئاینی، دوایی ئەندامی کۆڕی زانیاری لە سلێمانی ساڵی ١٩٨٠ز کرا ئەندامی دەستەی باڵا لە ئەوقاف، هەر لەو ساڵە

هەڵبژێردرا بۆ ئەندامی نیشتمانی لە سلێمانی، چەندەهاجار کرا ئەندامی لیژنەی باڵای حەج و عومرە، چەند سەفەری کرد بۆ وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی.

خوورەوشتی: مەلایەکی زیرەك و ئازابوو، کوردی و عەرەبی و فارسی بە چاکی دەزانی، قسەخۆش و دەم بە پێکەنین بوو، نوکتەزان بوو، زمان ڕەوان بوو، شەرمی نەدەکرد، ڕەشید بوو، دەنگ خۆش بوو، خۆم گوێم لیّ بوو لە نەجەف و لە کەربەلا، ناوجەرگەی شیعان لەسەر مینبەری حوسەینیەکان وتاری دەدان، بە دەنگی بەرز مەتحی حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی دەکرد، ئەوەش لەو شوێنە شتێکی ترسناکە، گۆتنی ئاسان نیە.

سەرچاوە: تأریخ علماء بغداد ٦٠٨.

**محەممەد عومەر کوردی (١٤٧١)**

ناوی محەممەدە، نازناوی (زەینەدینە)، کوڕی عومەرە، لە زانستەکانی قورئانی پیرۆز شارەزا بووە، دەرسی لەلای (شاطیبی) خوێندووە، لەگەڵ مامۆستا عەلی سەخاوی لە (دیمشق) دەرسی داوە، لە دەرسدانەوە پلەی بەرزی هیناوە، ساڵی ٦٢٨ك – ١٢٣٠ز کۆچی دوایی کردوە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/١٢٧.

٢. معجم أعلام الکورد ٦٢١.

**محەممەد عومەر نەصیبی (١٤٧٢)**

ناوی محەممەدە، کوڕی عومەری کوڕی محەممەدی کوڕی عومەری کوڕی ئەبوبەکری کوڕی محەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عبدالقاهیری کوڕی هبة الله یە، خەڵکی شاری (نوصەیبینە)، ساڵی ٨٥١ك – ١٤٤٧ز لە شاری (حەلەب) هاتەدنیا، زانایەکی شەرع زان و ئوصول ناس و شارەزا لە نەحو و ڕێزمانی عەرەبی بووە، شاعیر و نووسەر بووە، سەفەری (قاهیرە)ی کردووە، لە (مەککە) و (مەدینە)ی خوێندووە لە

(قاهیره) و (دیمشق) کرایتـه جێگـری قـازی، لـه (حەلـەب) کتێبـی (الابتهـاج في شـرح المنهاج) لە چوار بەرگی داناوە، کتێبی تری هەیە پڕە لە شیعر و پەند و قسەی نەستەق، لە ١٣ی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، ساڵی ٩١٦ك – ١٥١١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١١/٩٢ – ٩٣.

٢. هدية العارفين ٢/٢٢٧.

٣. كشف الظنون ٢/١٨٧٤.

٤. شذرات الذهب ٨/٧٥.

٥. إيضاح المكنون ١/١٢.

## محەممەد عیسا بروجردی (١٤٧٣)

ناوی محەممەدە، نازناوی (ئەبو عبدالله)یە، کوڕی عیسایە کـوڕی دیزکـە، خـەڵکی (بروجرد)ە، خوێندنی تەواوکردووە، چـوویتە (بەغـدا) لـەوێ دەرسـی داوە، دەرسـی بـە کـوڕی خەلیفـە داوە، دەرسـی بـە ئـەبو سـەعیدی سـیراف داوە، خـەریکی زانیـاری و خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بـووە، تـا مـانگی جیمـادی دووەم، سـاڵی ٣٥٩ك – ٩٧٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ١/٣٤٧.

٢. اللباب ١/١٤٤.

## محەممەد عیسا گۆرانی (١٤٧٤)

نـاوی محەمـەدە، کـوڕی عیسـای کـوڕی ئیـبراهیم شـارانی یـە، نازنـاوی (ابـو الطيب)بووە، لە (مەدینە)ی پیرۆز دانیشتووە، پاشان چوویتە (دیمشـق) هـەر لـەوێ سـاڵی ١١٦٧ك – ١٧٥٣ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبـی (اعـلام التحقيـق وإعـلام الجاهـل والزنديق)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١١/١٠٢ – ١٠٣.
٢. إيضاح المكنون ٣/١٠٢.
٣. هدية العارفين ٢/٣٢٩.
٤. سلك الدرر ٤/٨١ – ٨٥.
٥. معجم أعلام الكورد ٦٢٣.

## محەممەد عیسا لەل (١٤٧٥)

ناوی محەممەدە، کوڕی عیسایە کوڕی لەلە، دەرسی لە خزمەت باوکی خوێندووە لە مەزهەبی شافیعی شارەزابووە، نامیلکەی (أصول الدين والسنة)ی لەلای مامۆستا ئەبولقاسم عیسا خوێندووە، ئەو نامیلکە دەستنووسی محەممەد ئیبراهیم سەربالا بووە، لەلایەن چەندان زانایانی ئەو سەردەمی پەسەندکرابوو مۆرکرابوو، لەوانە: مامۆستا عیسا لەل باوکی مامۆستا، ناوبراو لە ١٠ی ڕەمەزانی پیرۆز، سالّی ٥١٦ك – ١١٢٢ز پەسەندی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. تأريخ أربيل ١/٢٧٣.
٢. معجم أعلام الكورد ٦٢٣.

## محەممەد غازی ئەییوبی (١٤٧٦)

ناوی محەممەدە، کوڕی مەلیك غازی کوڕی مەلیکی عادیل ئەبوبەکری ئەییوبیە، نازناوی (ناصر الدین)ە، خاوەنی: (میافارقین) و (ڕوها) و (هەولێر) بوو، لە بنەماڵەی ئەییوبیەکانە، جگە لەوەی کە زاتەکی لێهاتوو و عەگید و چاوقەیم بوو، زانایەکی مێژووناس و نووسەر و شاعیر بوو، کوڕی کچی (جەوزی) دەڵێ: {ساڵی ٦١٢ك – ١٢١٥ز لە شاری (ڕوها)م دیت، قسەخۆش و زمان ڕەوان بوو}.

ناوبراو ئیجازەی لە شێخ محیەدینی عەرەبی وەرگرتووە، سەرەتایەکەی بە: (بسم الله الرحمن الرحيم و به ثقتي.....) دەست پێ دەکا.
مامۆستا بە عەرەبی دەڵێ:

اذا ما أردتَ السعدَ فيك فكن على الذي في يده السعدُ متكلا
سلّم الى الله أمراً أنت فاعله فما إلى النجم لا قولا ولا عملا

ناوبراو لە هۆلاکۆ عاسێ بوو، تەتەرەکان ماوەی بیست مانگ دەورەی شارەکەیان گرت و ئابلۆقەیان دا، دانیشتوانی شارەکە زۆر نارەحەت بوون، نەخۆشی و گرانیان کەوتەناو، لە ئەنجامدا لەشکری (هۆلاکۆ) چوونە ناوشار، بە داخەوە مەلیکیان بە دیل گرت و سەریان بڕی، لە هەموو بازاڕ و کۆڵانان سەری مەلیکیان گێڕا، پاشان لە شوێنەکی بەرچاو بە دارێیان وەکرد، دوایی ئیسلامەکان لە شوێنەك بە خاکیان سپارد، لەو شوێنە مزگەوتێکیان دروست کرد بەناوی (مسجد الرأس) واتە: مزگەوتی سەر.
سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٦٣٤ – ٦٣٥.
٢. مشاهير الكورد ٣٣٠.
٣. شذرات الذهب ٥/٢٩٥.

## محەممەد فضل الله حەیدەری ( ١٤٧٧ )

ناوی محەممەدە کوڕی فضل الله ی کوڕی ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری دووەمە، عوسمان سند لە (أصفى الموارد) دەڵێ: {مامۆستا چەرخی خۆی ڕەوشەن و بۆن خۆش کرد، خووە چاکەکانی شایێدی بەرزی ئەو زاتەنە} ، لە سەرەتاوە لەلای عاصم ئەفەندی مامی و لەلای کوڕی عاصم ئەفەندی خوێند، دوایی چووە لای خضر محەممەد ئەفەندی حەیدەری ئامۆزای ئیجازەی وەرگرت.

مامۆستا ساڵی ١٢٢٣ك لە گوندی (ماوەران) دەرسی دەداوە، لەو کاتە مصطفا ئەحمەد زەهاوی برازای محەممەد فەیزی زەهاوی موفتی (بەغدا) یەك بوو لە

فەقێیەکانی ئەو زاتە، ساڵی ١٢٢٤ك – ١٨٠٩ تا و لەرزەکی گرانی توش هات، لە ئەنجامدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: عنوان المجد ١٢٨.

## محەممەد فەقێی تەیران (١٤٧٨)

ناوی محەممەدە، لە دەوری ساڵی ١٥٦٣ز لە گوندی (تەیران) قەزای مۆکس ناوچەی هەکاری هاتەدنیا، وابزانم هەر بۆیە ناوبراوە بە: فەقێی تەیران، چونکە خەڵکی (تەیران) بووە، نەك لەبەر ئەوەی کە گۆیا زمانی باڵندانی زانیوە، جێی لێ نەبی خۆ سولەیمان پێغەمبەر نەبووە (درودی خوای لێ بی).

لە سەرەتاوە لەلای خۆیانی خوێند، پاشان چووە (جزیرە) لە گوندی (هێشت) و (فێنك)ی خوێند، زانایەکی ڕۆشنبیر و مێژووناس و شاعیر و نووسەرەکی چاکی سەردەمی خۆی بووە نازناوی خۆی جاروایە (م ، ح) میم و حێ نووسیوە کورتکرایەوەی ناوەکەی خۆیتی محەممەد، وەك دەڵێ:

میم و حێ حەفتی فەلەك چوون ژ هیجرەتی دەوران گەلەك چوون

ساڵ هەزار و چل و یەك چوون ئەڤ غەزەل ئانی دیارە

١٠٤٢ك – ١٦٣٢ز

جاریش وایە دەنووسی (فەقێ تەیرا)، وەك دەڵێ:

ئەوە مەحبوبا وەکو ستێرا تە عەسیرا کچا مێرا

تە حەلاندی (فەقێ تێرا) کەس ب حالی من نەزان

لە شیعرێك ئاماژە بە شێخ ئەحمەدی جزیری دەکات، وادیارە هاوچەرخ بووینە، ووشەی (مەلێ) بەکاردینی، ئەوەش نازناوی شێخەحمەدە، وەك دەڵێ:

بریندارێ عشقێمە د یورم ز سها بهان

زانن مەدداحێ کێمە لە هەزارو ئێك و سهان ١٠٣١ك.

سەنا خواهێ (مەلێمە) لەمێ ئەرد و جهان

بەرهەمەکانی: (چیرۆکی هۆنراوەی شێخی صەنعان) و (چیرۆکی هۆنراوەی زەنبیل فرۆش) و (چیرۆکی هۆنراوەی سیسەبان – ئەسپی ڕەش) و (هـۆنراوەی قـەڵای دمـدم) و (هۆنراوەی بە سەرهاتی بەرسیسای عابید) و (هەی ئاڤ و ئاڤ) و (دلۆ رابە).

کۆچـی دوایـی: سـاڵی ١٠٥١ك – ١٦٤١ز لـە گونـدی (وەرەزوز) سـەر بـە (مۆکس) کۆچی دوایی کرد، گۆڕەکەی پارێزراوە، زیارەت دەکرێ.

سەرچاوەکان:

١. مێژووی ئەدەبی کوردی ٢/١٧١ – ٢٧٩.
٢. تأريخ مشاهير كورد ١/١٩٨.
٣. الأكراد في بهدينان ٢٠٣.
٤. معجم أعلام الكورد ٥٤٢.

## محەممەد فەیضی زەهاوی (١٤٧٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی حەسەن بەگی کوڕی ڕۆسـتەم بـەگی کوڕی کەیخوسرەو بەگی کوڕی ئەمیر سولێمانی کوڕی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەیە، سـاڵی ١٢١٨ك – ١٨٠٣ز لە سلێمانی هاتووتەدنیا، ناوبراوە بە (زەهاوی) چونکە بـە منـداڵی لەگەڵ باوکی ماوەك لە (زەهاو) ماوە لای خاڵەکانی، دوایی گەڕاوە سلێمانی لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز، کتێبە سەرەتاییەکانی شـەریعەت و نـەحو و صەرفی خوێند، مـاوەکیش لـەلای مەلایـەکانی (زەهـاو)ی خوێنـد، مـاوەك لـەلای شـێخ مەعروفی نۆدەیی،ماوەك لای مەلا عبدالله ی خەرپانی، پاشان چووە (سنە) کـەلامی لـەلای مەلا شێخ محەممەد سەعیدی تەختی خوێند، کە مامۆستای کۆچی دوایـی کـرد، چـووە لای مەلا قەسیمی برای حیکمەتی خوێند، چووە (سابلاغ) لای مەلا محەممەد ڕەسول کۆتـایی بـە خوێندن هینا، لە تەمەنی بیست ساڵی ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: لە مەدرەسەی باباعەلی لە سلێمانی کرا مـودەرریس، سـاڵی ١٨٣٥ز کرا مودەرریس لە مزگەوتی ئەحمەد نەفتچی لە کەرکوك، ساڵی ١٨٤١ز لەسەر فـەرمانی

عەلی ڕەزای والی (بەغدا) کرا مودەڕریس لە مەدرەسەی (علمیة)، ساڵی ١٨٤٩ز کرا سەرۆکی دەرس بێژەکان، هەر لەسەر فەرمانی والی بەغدا، ساڵی ١٨٥٣ز کرا موفتی گشتی (بەغدا)، بەوبۆنەیە شاعیری موصلی عبدالباقی عومەری لە هۆنراوەکدا، بە عەرەبی دەڵێ:

قد قيل لي إذ رحت أنشد عندما شاهدت دين محمد يتجدد
في مذهب النعمان بالزوراء قد أفتي الامام الشافعي (محمد)

زەهاوی ماوەی سی و هەشت ساڵ بەردەوام بوو لەسەر کاری موفتیاتی.

خووڕەوشتی: خێرخواز و چاکەخواز و رووڵەچاکە بوو، خەریکی کۆکردنەوەی زانست بوو، لە زانستەکانی خوێندنی باڵای ئەو سەردەمی زۆر شارەزا بوو، تاکە زانای بێ وێنەی ئەو سەردەمی بوو، شاعیر و ئەدیب بوو، قسەی ورد و پڕمانا و نوکتەی زۆر دەزانی، بە (ئەمجەد)ی نەوەی خۆی دەگۆ: {أمجد! أتحب أباك أم جد؟}، واتە: ئەمجەد! باوکت خۆش دەوێ یا باپیرت؟ لە نێوان وشەی: (أمجد) و (أم جد) جوانکاری (الجناس المرفو) هەیە.

جارەك بە زەهاوییان گۆ: مامۆستا ئەوە پەنگری زستان کەوت، ئەویش فەرمووی: {قالوا: السماء قد أسقطت جمراتها، صدقوا، وهذا الثلج بعض رمادها} واتە: دەڵێن: پەنگری ئاسمان کەوتووە، ڕاستە، ئەو بەفرەی ئێستاش تۆز و مشکییەکەیتی.

لە باسی گەنجی بەسەرچوونەوە دەڵێ:

من صار يمشي بالعصا من كبر آن أوان، أن يصير راحلا
أعني الذي على ثلاث أرجل يمشي، على الأربع يمشي عاجلا

واتە: ئەوەی ئێستا لەبەر پیری بە گۆپاری دەڕوا نزیك بووە هەڵبگیرێ، مەبەستم ئەوەیە: ئەوی لەسەر سێ لاقان دەڕوا، نزیك بووە بەچواران بڕوا، واتە: بمری و دوو کەس لاشەکەی هەڵگرن یەك لە پێشەوە یەك لە دواوە، لەسەر ئەو چوار لاقانە دەڕوا بۆ گۆڕستان.

دەربارەی هەقگۆیی دەڵێ:

إنا نقول الحق بالمحافل ونبطل الباطل بالدلائل

ولا نخاف لومة من لائم ولا نهاب صولة من صائل

لە مەتحی خوای گەورە، دەڵێ:

يارب حارت في ثناك عقول ماذا عسى فيك العقول تقول؟

أن الوجود ثنا عليك بأسره فثناء أهل الفضل فيك فضول

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا حوسێن پشدەری، مەلا عبدالرحمانی قەرەداغی (ابن الخیاط)، مەلا محەممەدی کوانەدولی، مەلا شێخ حەسەنی قەرەداغی، مەلا عبداللە ی پیرەباب، مەلا عەلی قزلجی، مەلا شێخ عبداللە شێخ حەسەن، مەلا عیسای هەرتەلی، مەلا ئەحمەدی مەلا جامی، مەلا ئەحمەدی دێلێژەیی، مەلا ئەحمەدی گوێڕی، مەلا عەلی کورەیی، مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی، مەلا عبداللە، مەلا ڕەزای واعیز، مەلا محەممەدی (مەحوی)، عبدالرحمان ناجم شارەزوری، شێخ عبداللطیف نائیب، محەممەد سەعیدج ئەفەندی کوڕی.

کۆچی دوایی: نیوەشەوی دووشەم، ٣ی جیمادی یەکەم، ساڵی ١٣٠٨ك – ١٨٩٠ز ماڵئاوایی یەکجاری لە دۆستان کرد، بەرەو بارەگای خوای گەورە باری کرد، لە قوتابخانەکەی خۆی: (السلیمانیة) بە خاك سپێردرا.

مەدح و پێداهەرگوتنی زانایان بە زەهاوی:

شێخ ڕەزای تاڵەبانی دەڵێ:

مومکین نیە ئیدراکی حەقائیق بە تەواوی

مومکین نیە ئیدراکی نەکا زیهنی زەهاوی

بە فارسی و تورکیش لەو بابەتە شیعری نووسیوە.

سەید ئەحمەدی ڕاوی واعیز دەڵێ:

دفنوك ياكهف الوري تحت الثرى ويلي عليك وويل كل موحد

ماضمت الغبراء مثلك ثاويا لا، والذي هو عالم ما في الغد

أبكيت كتب العلم دمعا بل دما وبكتك كتب السعد بل والسيد

سەید عبدالله عیرفان ئەفەندی (مدرس)ی سلێمانی دەڵێ:

سألت من الأيام يوما جماعة وهم ساكبون الدمع بل ساكبوا الدم

فقلت لهم ماذا جرى من مصائبَ؟ وما ذا الذي يبكيكم بالتألّم؟

فقالوا: أما أخبرتَ يا غافل الدُنى وفاةَ الزهاوي الشهير بأعلم

کوڕەکانی: (محەممەد سەعید) و (جەمیل صیدقی زەهاوی) و (عبدالحکیم ١٢٥٦ – ١٣٥٨ك) و (عبدالغنی ١٢٧٧ – ١٣٢٣ك) و (محەممەد ڕەشید پاشا ١٢٦٤ – ١٣٢٧ك).

سەرچاوەکان:


١. عنوان المجد ٩٨ – ١٤١.

٢. الإمام أمجد الزهاوي ٦٣.

٣. موفتی زەهاوی.

٤. لب الالباب ١/٨٥.

٥. البيتوشي٣٨.

٦. مشاهير الكورد ١/٢٢٨ – ٢٣١.

٧. بوژاندنەوە ١/٢٥٧–٢٦٢–٢٩٠–٢٩٣–٣٥٢–٣٥٩ /٢٠٠/٣–٢٠١.

٨. ژیناوەری زانایانی کورد ٢١٥ – ٢١٩.

٩. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥١٧ – ٥٢٢.

١٠. تأريخ السليمانية ٢٥١ - ٢٥٦.

١١. تأريخ مشاهير الكورد ٢/٣٥ - ٣٩ – ٩٤ – ١١٨.

١٢. نثر الجواهر والدرر ١٤٠٧/٢.

١٣. معجم أعلام الكورد ٤٣٩ – ٤٨٧.

## محەممەد قادر نەچێ (١٤٨٠)

ناوی محەممەدە، كوڕی شێخ قادری كوڕی مەلا مەحمودە، خەڵكی گوندی (نەچێ)ی مەریوانە، لە دەوری ساڵی ١٣٠٣ك – ١٨٨٥ز لە گوندی (ڕەشەدێ) هاتەدنیا، دەستی كرد بە خوێندن، پاش تەواوكردنی قۆناغی سوختەیی، چووە لای مەلا عبدالرحمانی پێنجوێنی، كۆتایی بە خوێندن هینا ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (مەریوان) لە گوندی (بەییلە) بووە مەلا، دەرسی دەداوە، باری كرد بۆ باڵك، لەوێ چەند مەلای پێگەیاند، دوایی شێخ عەلائەدینی (بیارە) كردییە مودەرریس لە گوندی (دورود)، قوتابخانەكەی زۆر ئاوەدان بوو، جاروابوو سی تا چل فەقێ لەوێ دەبوون، دوایی چووە (چۆڕ)، لەوێ چووە (ووشكین)، لەوێ چووە (ڕەزاو)، ساڵی ١٣٣٦ك – ١٩١٧ز كۆچی دوایی كرد، مەلا سەعیدی كوڕی جێگری بوو، ئەویش دەوری ساڵی ١٣٥٥ك – ١٩٣٦ز كۆچی دوایی كرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٣٣ – ٥٣٤.

## محەممەد قادر هەرتەلی (١٤٨١)

ناوی محەممەدە، كوڕی مەلا قادری كوڕی مەلا عبدالله ی كوڕی مەلا محەممەدی كوڕی مەلا حەسەنە، ساڵی ١٩١٠ز لە گوندی (هەرتەل) هاتەدنیا.

خوێندنی: لە خزمەت باوكی دەستی كرد بە خوێندن، دوایی چووە لای مەلا شێخ ئەحمەد لە (وەرتێ)، دوایی چووە (زێوە) لای مەلا عبدالله، دوایی چووە لای مەلا طاهیر ئەفەندی لە (كەركوك)، گەڕاوە (هەرتەل) لای مەلا فتح الله، هاتە مزگەوتی حاجی قادر لە هەولێر لای مەلا محەممەدئەمین كونەفلوسە و مەلا عبداللهی كوڕی، چووە (سكتان) لای مەلا عبدالله، چووە مزگەوتی بایزئاغا لە (كۆیە) لای مەلا بەهائەدین ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە (وەرتێ)، دوایی چووە (زێوە)، ماوەك لە (وەراش) بوو، گەڕاوە (هەرتەل) پتر لە بیست و پێنج ساڵ لەوێ دەرسی داوە، هاتە هەولێر بووە مەلای

مزگەوتی ناوبازاڕ، ئیجازەی بەوانە داوە: مەلا ئەحمەد ئیبراهیم خەتێ، مەلا صادق مەلا ئیبراهیم خەتێ، مەلا عبدالباقی هەرتەلی، مەلا عەلی هەرتەلی، مەلا شێخ عبدالله‌ی زێخان.

کوڕەکانی: دوو کوڕی مەلای هەنە:

١. مەلا جەمال: مەلای مزگەوتی عەقید حەیدەرە لە گەڕەکی تەیراوە لە هەولێر.

٢. مەلا عبدالرحمان: مەلا بوو لە مزگەوتی پاشا، لە هەولێر باری کرد بۆ ناوچەی (ڕانیە).

سەرچاوە: علماء ومدارس في أربيل ١٢٠.

**محەممەد قازی (سلط) (١٤٨٢)**

مامۆستا محەممەد، کوڕی قازی شاری (سەلط)ە، لە کوردەکانی (هەکاری)یە، لە دەوری سوڵتان صەلاحەدینی ئەیوبی ئەو بەرەبابە کەوتنە (ئوردن)، لەوێ لە شاری (سەلط) نیشتەجێ بوون، زانایەکی فەرمووەدەناس بوو، لە قوتابخانەی (الأفضلية) دەرسی دەدا، هەروەها سەرۆکی قوتابخانەی (قۆلونییە) بوو، پاش کۆچی دوایی مامۆستا، کوڕەکانی خۆی دەرسیان دەداوە، ناوەکانیان: عبدالحق، حافظ الدين، یەحیا، تا ساڵی ١٠٩٥ك – ١٦٨٤ز پاشان ئەو بەرەبابە، لە مزگەوتی (ئەقصی)ی پیرۆز کران بە پێش نوێژ و ووتارخوێن، ناسراون بە بنەماڵەی (الإمام)، ئێستاش نەوەکانیان ماون، ئەمانەن: یەحیا محەممەد شوکری، محەممەد صالح، محەممەد یەحیا، شێخ یونس

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٦٢٤.

**محەممەد قەحطان ئورمەوی (١٤٨٣)**

ناوی محەممەدە، نازناوی (ئەبو عبدالله)یە، کوڕی قەحطانی کوڕی ئەبو عبدالله یە، خەڵکی (ورمێ)یە، مامۆستایەکی بڕواپێکراو بووە، زۆر زەنگین بووە، بۆ بازرگانی سەفەری کرد، ماڵەکی زۆری پێبوو، لە بەلەم سواربوو لەناو دەریا بەلەمەکە شکا، شمەکەکانی تەڕبوو، ماڵەکەی هەموو فەوتا، دووبارە ماڵداری کردەوە، شتێکی کۆکردەوە، ئەمجارەش لە (نیسابۆر) تالان کرا، هیچی نەما، مامۆستا عبدالكريم سەمعانی

دەڵێ: {لە شارانی بوخارا و مەرو و سەرخس لەگەڵ من دا بوو، زاتەکی چاك و قورئان خوێن و بە شەو نوێژ بوو، زۆرم خۆش دەویست}.

سەرچاوە: الأنساب ١/١١٩.

## محەممەد قەرەداغی (١٤٨٤)

مامۆستا مەلا محەممەد ساڵی ١٢١٣ك – ١٧٩٨ز لە (قەرەداغ) هاتووتەدنیا، بۆ خوێندن چووە (مورتکە) لای مەلا عبدالغفور، دوایی چووە لای مەلا شێخ عبداللطیفی بەرزنجی، دوایی چووە (هەڵەبجە) لای مەلا عبداللهی خەرپانی ئیجازەی وەرگرت، پاشان چووە لای مەولانا خالیدی شارەزوری ئیجازەی تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت، ساڵی ١٢٦٦ك – ١٨٤٩ز سولەیمان پاشای بابان مزگەوت و قوتابخانەی لە (قەرەداغ) بۆ دروست کرد، مامۆستای کردە (مدرس) دەستی کرد بە دەرسدانەوە، ساڵی ١٢٨١ك – ١٨٦٤ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (قەرەداغ) بە خاك سپێردرا.

دانراوەکانی: (شرح الإعراب) و (شرح رسالة الآداب) و (تعليقات على عبدالحكيم) و (تعليقات على الشمسية) و (تعليقات على عصام الوضع) و (تعليقات على تفسير البيضاوي) و (تعليقات على التحفة) و (تعليقات على رسالة بهاءالدين العاملي).

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٢/١٥٩ – ١٦٠.

٢. معجم أعلام الكورد ٦٨٢.

## محەممەد قەسیم گۆرانی (١٤٨٥)

ناوی محەممەد قەسیمە، کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ مەحمودی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ مصطەفایە، ساڵی ١١٣٤ك – ١٧٢١ز لە (سنە) هاتووتەدنیا، ئەو زاتە باپیرە گەورەی زۆربەی مامۆستایەکانی (سنە)یە، لە خزمەت باوکی پەروەردە بوو، دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (سیاگوێز) لای مەلا عبدالله، ماوەکیش چووە لای مەلا مصطەفای بالیسانی خۆشناو.

مامۆستا دەرسی بە چەند زانایان داوە و ئیجازەی پێداون، لەوانە: مەولانا خالیدی شارەزوری، مەلا عەلی نەصراللە زێباری. مامۆستا قەسیم خەتی خۆش بوو، بەشی کەلام لە (تهذیب المنطق) و شەرحی تەفتازانی سەر تەصریفی بە دەستی خۆی نووسیتەوە.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٢٣٤ك - ١٨١٨ز لە (سنە) کۆچی دوایی کرد.

سێ کوڕی هەبوو: حسن و حسێن و احمد

شێخ عبدالغفاری مەرۆدخی بەبۆنەی کۆچی دوایی مامۆستا بە فارسی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| بحر علم وآسمان فضل و دین | قطب عالم حضرت شیخ قسیم |
| کرد رحلت ناگهانی زین جهان | شد مقیم أندر گلستان نعیم |
| سال تأریخی وفاتش هاتفی | گفت: {جنت زینت افزود از قسیم} |
| | ١٢٣٦ ك |

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٣٥ - ٤٤٠.

٢. بنەماڵەی زانیاران ١٣٣.

٣. بوژاندنەوە ٣/١٩٦ - ١٩٧ /٦/٣٣١.

٤. تأريخ مشاهير كورد ١/٢٩٧ - ٢٩٨.

## محەممەد گەردی (١٤٨٦)

مامۆستا مەلا محەممەد گەردی یەکە لە زانایە مەزنەکانی مەزهەبی شافیعی کورد، لە گەردییەکانی سەرەوەیە، پشت شاری (ئامێدی) لە نێوان سنووری عێراق و تورکیا، بیستوومە چوویتە (مەدینە)ی پیرۆز لەوێ نیشتەجێ بووە، کرایتە مامۆستا ڕێزی تایبەتی لێندراوە، کاروباری ئاینی ئەنجام داوە.

دانراوەکانی:

١. حاشية على تحفة ابن حجر: دانەکی کۆپیمان لەلایە وەرگیراوە لەسەر نوسخەی عبدالله کوڕی، لە گوندی (ماوەران) بۆ مەلا ئیسماعیل ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری

نووسیتەوە، سەرەتایەکەی، بە: (الحمد لله الذي جعلني من خدام علماء الشريعة..... فيقول المفتقر الى الله الغني محمد الكردی: ...) دەست پێ دەکا.

٢. حاشية علی الانوار: نوسخەکی لەلای مەلا ئەنوەر کەریم شەوەکی پێش نوێژی مزگەوتی بالیسانی لە هەولێر هەیە، سەرەتایەکەی نووسراوە: (هذه حاشية الأنوار للمحقق الكردي رحمه الله وإيانا، قوله: (المطهر للنجس والخبث)...، لە کۆتاییدا دەڵێ: {قد وقع الفراغ من تحرير الحاشية المسماة بالكردي الواقعة على الأنوار من يد الحقير يونس بن عمر المير باساكي حقيقة، الباومری السورچی شهرة، في يوم الخميس ثاني صفر المظفر سنة ١٢٢٧ك... تمت بقصبة الاشنی من أعمال تبريز}، نوسخەکی تری کۆپی لەلای مەلا نامیق مەلا ئیسماعیل گەزنەیی هەیە، لەسەر خەتی محەممەد ئەحمەد زێباری وەرگیراوە، ساڵی ١١٢٦ك لە گوندی (هەرنی) نووسیتەوە.

تێبینی من لێرەدا ئەوەیە: هەندێ لە مامۆستایان جیاوازی ناکەن لە نێوان ئەو دوو ناوە: (محەممەد سولێمان کوردی) و (محەممەد سولێمان گەردی)، لەبەر ئەوەی بە ڕێنووسی عەرەبی وەك یەك دەنوسرێن، لە راستیشدا دوو زاتی لەیەك جودان، وە بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەو راستیە ئەو نوسخە کۆپیەیە کە ئاماژەم پێکرد، لەو بەروارەی کە ئەو نوسخە نووسرایتەوە کە ساڵی ١١٢٦ك یە، مامۆستا محەممەد سولەیمانی کوردی مەدەنی لە (دیمشق) هاتەدنیا، ئەوە بەڵگەیێکی ڕاست و بەهێزە کە ئەو دوو زاتە جودان، هەردووکیان یەك کەس نینە، وە لە حاشیەی شێروانی سەر توحفەش ئاماژە بەوە کراوە، سەیری (٢/٢٨٣) بکە چاپی مصطەفا محەممەد، بۆ زانینی ئەو راستیە.

سەرچاوەکان:

١. حاشية الشروانی علی التحفه ٢/٢٨٣.
٢. حاشية گەردی علی التحفه
٣. حاشية گەردی علی الانوار.
٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/٩.

## محەممەد کوردی بە ڕۆژی ( ١٤٨٧ )

مامۆستای کوردی بەڕۆژی زانایەکی شەریعەت زان بووە، زۆر خەریکی کتێبی (ئەنوار) بووە، بە دین و لە خواترس بووە، لە دەست نوێژ و پاکژی خۆی ماندوو کردووە، ناسراوە بە (صائم الدهر)، لەبەر ئەوەی بەردەوام بەڕۆژوبووە، دەڵێ: سێ ڕۆژ جگە لە ئاوی زەمزەم هیچم نەخوارد خۆم ڕادەگرت، جارەك یەکەك پارچەك ئەستوکی پێدام، منیش لێم وەرگرت خواردم، دەگەڵ خواردنی ئەو ئەستوکە وەك جاران هێزم نەما، چیدی بێ خۆراك خۆم پێ ڕانەدەگیرا. چل ساڵ پتر لە (دیمشق) بوو، ڕۆژی سێ شەمەی، ٧ی جیمادی یەکەم، ساڵی ١٠١٤ك – ١٦٠٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. خلاصة الأثر٤/٢٨٧ – ٢٨٨.
٢. مشاهير الكورد ٣٦١.

## محەممەد کەریم بەحرکەیی ( ١٤٨٨ )

ناوی محەممەدە، کوڕی کەریمی کوڕی حەمەدی کوڕی پیرداودی کوڕی خدرە، عەشیرەتی (گەردی)یە، ساڵی ١٣٤٤ك – ١٩٢٥ز هاتەدنیا، لە گوندی (خۆران)ی خۆشناوەتی لای مەلا ڕەسول دەستی کرد بە خوێندن، پاشان ماوەك لای مەلا عبداللە ی مەلا سولەیمان (باوکم) بوو لە (بەحرکە)، ماوەك لای مەلا شەریفی دووشیوانی لە (بشیریان)، ماوەك لای مەلا عبدالعزیز مەلا سولەیمان (مامم) بوو، ماوەك لە خزمەت مەلا محەممەدئەمینی کونەفلوسە بوو لە مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لە هەولێر، ماوە لەوێ تا بەرواری ٧/٤/١٩٥٤ز ئیجازەی وەرگرت لە مەلا عبداللەی بێتواتەی.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (گردی ماوان) لە ناوچەی زراریان، پاشان چووە (بنەسراوەی گەورە)، دوایی گوندەکە وەك صەدان گوندانی کوردستان کەوتە بەر هێرشی دڕندەی ڕژێمی ئاوئاوچووی و سوتاندرا، خەڵکەکە ئاوارەبوون، مامۆستا ناچار لە

١١/١٢/١٩٦٣ز باری کرد هاتە هەولێر، بووە مەلا لە مزگەوتی حاجی قادر شنۆیی ئێستا دەناسرێت بە مزگەوتی سپی، لە ٢/٨/١٩٧١ز کرا (واعیز).

کۆچی دوایی: لە ١٢/٣/١٩٧٩ز لە نەخۆشخانەی کۆماری هەولێر کۆچی دوایی کرد، خەڵکی گەڕەکەکە بە (دارەبازە) لەسەر شانی خۆیان هەڵیان گرت، تا مزگەوتی (سپی)، لەوێ لەسەر وەسیەتی حاجی قادر شنۆیی خاوەنی مزگەوتەکە، لە گۆڕستانەکەی تایبەت بە مزگەوتەکە، بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچکردووەکان ٢١٢ - ٢١٤.

### محەممەد کستانی (١٤٨٩)

مامۆستا مەلا محەممەد کستانی، مەلایەکی چاك و سۆفییەکی دڵپاك بوو خەڵکی گوندی (کستانە)ی قەزای (پشدەر) بوو، دەوری ساڵی ١٢٩٠ك - ١٨٧٣ز هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی بڕین، ئەمجا لە قۆناغی موستەعیدی چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادری مودەرریس کۆتایی بە خوێندن هینا، تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عومەر (ضیاءالدین) وەرگرت، بە (خەلیفە) وەرگیرا، مامۆستا بەدین و پیرۆز بوو کەراماتی لێ دەگێڕنەوە، دەوری ساڵی ١٣٣٤ك - ١٩١٥ز کۆچی دوایی کرد لە (کستانە).

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٣٠.

### محەممەد کوانەدولی (١٤٩٠)

مامۆستا مەلا محەممەد، خەڵکی گوندی (کوانەدولە)ی سەر بە قزلجەیە، دەوری ساڵی ١٢٧٠ك - ١٨٥٣ز هاتەدنیا، لەو دەڤەری و لە شاری سلێمانی خوێند، پاشان چووە (بەغدا) لای مەلا محەممەد فەیزی زەهاوی کۆتایی بە خوێندن هینا، ئیجازەی وەرگرت، کرا (واعیز)ی گەڕیدە لە قەزای (خانەقین) ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد، تا دەوری ساڵی ١٣٢٠ك - ١٩٠٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٢٩.

## محەممەد (مارانی) (١٤٩١)

مامۆستا مەلا محەممەد خەڵکی (ماران)ە، لە دەشتی نێوان ئاکرە و موصل، زانایەکی مەزن بووە، لە زانستی (کەلام) زۆر شارەزا بووە، عبدالوەهاب ئەفەندی نائیبی مەلا چاکی (بەغدا) ئیجازەی لەو زاتە وەرگرتووە، لە مەدرەسەی (سلیمانیة)ی بەغدا، دەرسی داوە، چەند زانایان دەهاتن بۆ گوێ ڕاگرتن لە دەرسەکانی، بەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆز، تا ساڵی ١٣٠٨ك – ١٨٩٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: لب الألباب ١/١٠٦.

## محەممەد مەجد هەولێری (١٤٩٢)

ناوی محەممەدە، کوڕی مەجدی هەولێرییە، نازناوی (شەهابەدین)ە، مەزهەبی شافیعی بووە، سەرۆکی قازییەکانی (دیمشق) بووە، شەرع زان و بە توانا بووە، لە زانستەکانی ئەقلی و نەقلی شارەزا بووە، سێ ساڵان دادوەر بووە، لە تەمەنی شێست و شەش ساڵیدا لە مانگی جیمادی دووەم، ساڵی ٧٣٨ك – ١٣٣٨ز ئێسترەکەی خۆی لەقەکی لە سەریدا کوشتی، کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/١١٨.

٢. معجم أعلام الكورد ٦٢٣.

## محەممەد محەممەد ئامێدی (١٤٩٣)

ناوی محەممەدە، کوڕی محەممەد محەممەد (ئەبو سعود)ە، خەڵکی ئامێدییە، نازناوی (مەیلی)یە، ساڵی ٩٣١ك – ١٥٢٤ز هاتەدنیا، لە قوتابخانەی (ئەستەمبۆڵ) دەرسی داوە، دوایی کرا قازی (شام)، دوایی کرا قازی (حەلەب)، بە عەرەبی و فارسی و تورکی شیعری هەیە، ساڵی ٩٧١ك – ١٥٦٣ز لە ژیانی باوکیدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الكورد ٣٥١ – ٣٥٢.

٢. شذرات الذهب ٨/٣٦٥.
٣. معجم أعلام الكورد ٣٤ – ٣٤٩ – ٦٣٢.
٤. الأعلام ٣/١٤١ /٧/٢٨٨.

**محەممەد محەممەد (ئیبن تەیمییە) (١٤٩٤)**

ناوی محەممەدە، کوڕی محەممەدی کوڕی عبداللە ی کوڕی عبدالحلیمی کوڕی عبدالسلامی ئیبن تەیمییەیە، ساڵی ٧٥٧ك – ١٣٥٦ز هاتەدنیا، یەکەم جار خەریکی بازرگانی بوو، پاشان دەستی کرد بە خوێندن، شارەزابوو لە دکتۆری و لە شەریعەت، کرا قازی (ئەسکەندەرییە) لەگەڵ کوڕی نیدی زۆر برادەربوون، وا ڕێککەوت هەردووك ڕۆژی یەك شەمە، ٧ی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، ساڵی ٨٣٧ك – ١٤٣٤ز کۆچی دوایی یان کرد.

سەرچاوە: الضوء اللامع ٩/١١٠.

**محەممەد محەممەد (ئەبوسعود) (١٤٩٥)**

ناوی محەممەدە، کوڕی محەممەدی کوڕی مصطەفایە، خەڵکی (ئامێدی)یە، مەزهەبی حەنەفی بووە، ناسراوە بە: (شێخ الإسلام)، ساڵی ٨٩٦ك – ١٤٩٠ز هاتەدنیا، لە گوندێك نزیك (قوسطەنطینییە)، چەند کتێبی لە خزمەت باوکی خوێند، لەوانە: حاشیەی سەید شەریف لەسەر (تەجوید)، شەرحی مفتاح العلوم، شرح المواقف، دوایی چووە لای مەلا سەعدی چەلەبی، دوایی کرا قازی (بروسە)، دوایی کرا قازی (قوسطەنطینییە)، دواتر کرا قازی لەشکر، پاشان کرا موفتی ساڵی ٩٥٢ك، مامۆستا ئەبوسعود زۆربەی کاتی خۆی لە دەرسدانەوە خەرج دەکرد، بەڵام نووسین و دانراویشی هەیە، (١٠) کتێبی پتر داناوە، لەوانە: تەفسیری قورئانی پیرۆز بەناوی (إرشاد العقل السليم الى مزايا الكتاب الكريم) ساڵی ٩٧٣ك – ١٥٦٥ز تەواوی کرد، پێشکەشی بە سوڵتان سولەیمان خان کرد، کە تەفسیرەکەی بۆ ناردرا، تا دەرگای دیوانی پێشوازی کرد، خەڵاتەکی زۆری بۆ دانەرەکە هەنارد.

کۆچی دوایی: ساڵی ٩٨٢ك – ١٥٧٤ز کۆچی دوایی کرد، لە تەك گۆڕی ئەبو ئەییوبی ئەنصاری بە خاك سپێردرا.

کوڕەکانی: (محەممەد): بەناو باوکی کرابوو، وە ئەحمەد (مصطەفا).

سەرچاوەکان:


١. شذرات الذهب ٣٩٨/٨ – ٤٠٠.

٢. الأعلام ٣/١٤١ /٧/٢٨٨.

٣. مشاهير الكورد ٨٤.

٤. الأكراد في بهدينان ١٨٩.

٥. معجم المؤلفين ١١/٣٠ – ٣٠٢.

٦. كشف الظنون ١/٦٥.

٧. هدية العارفين ٦/٢٥٣ – ٢٥٤.

٨. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٨ – ٤٠ – ٤٩٠.

٩. البدر الطالع ١/٢٦١.

١٠. معجم أعلام الكورد ٣٤ – ٣٥ – ٣٤٩ – ٦٣٢.


## محەممەد محەممەد (ئەخلاطی) (١٤٩٦)

ناوی محەممەدە، کوڕی محەممەدە، نازناوی (محیەدینە) خەڵکی (ئەخلاط)ە، زانایەکی ئەهلی تەصەووفە، لەو بابەتە کتێبی: (مطهر القلوب من أصناف الذنوب)ی داناوە، ساڵی ٨٣١ك – ١٤٢٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. معجم المؤلفين ١١/٢١٣.

٢. علماؤنا في خدمة العم والدين ٤٨٦ – ٤٨٧.

٣. هدية العارفين ٢/١٨٧.

**محەممەد محەممەد بەرزنجی (١٤٩٧)**

ناوی محەممەدە، کوڕی محەممەد (مظفرالدین) کوڕی عبدالله (حەمیدالدین)ە، ناسراوە بە (مەکی) خەڵکی (بەرزنجە)یە، زانایەکی تەصەووف بووە، کتێبی (الجانب الغربي بحل مشكلات ابن العربي) بە زمانی فارسی بۆ سوڵتان سەلیم دانا، پاشان محەممەد عبدالرسول بەرزنجی تەرجومەی کرد وەلای زمانی عەرەبی.

سەرچاوەکان:

١. إيضاح المكنون ١/٣٥٩.

٢. تأريخ السليمانية ٢٨٠.

٣. مشاهير الكورد ٣٨١.

٤. كشف الظنون ٢/١٢٦٤.

**محەممەد محەممەد (تاج العارفين) (١٤٩٨)**

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدە، ناسراوە بە (تاج العارفين) نازناوی (ئەبولوەفایە)، دەوری ساڵی ٤٢٠ك – ١٠٢٩ز هاتەدنیا، خەڵکی (زەهاو)ە، زانایەکی خواناس و لە خواترس و خواپەرست بووە، زانیاری تەصەووفی لە شێخ محەممەدی شەبەنکی وەرگرتووە، شێخ عبدالقادری گەیلانی (خ) فەرمویتی: {لە کوردان کەس وەك شێخ ئەبولوەفا هەڵنەکەوتووە}، ساڵی ٥٠١ك – ١١٠٧ز کۆچی دوایی کرد، لە گوندی (پوشین) نزیك (بەرزنجە) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٥٧ – ٤٥٨.

٢. جامع كرامات الأولياء ١/١٧٩ – ١٨٠.

**محەممەد محەممەد جزیری (١٤٩٩)**

ناوی محەممەدە، کوڕی محەممەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی مامۆستای مێژووناس شەمسەدینی جزیریە، ساڵی ٧١٣ك – ١٣١٣ز هاتوتەدنیا، دەرسی

فەرموودەی داوە، خەریکی شەریعەت بووە، زانایەکی ڕەوشت چاك بووە، سەرپەرشتی بێ باوکانی کردووە، لە مانگی جیمادی دووەم، ساڵی ٧٧٨ك – ١٣٧٦ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٢٥٨ – ٢٥٩.

٢. الدرر الكامنة ٤/١٥٧.

٣. معجم أعلام الكورد ٦٢٥.

## محەممەد محەممەد جزیری (١٥٠٠)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی عەططافە، لە مانگی ذیالقعدەی ساڵی ٤٦٤ك – ١٠٧٤ز لە جزیرەی ئیبن عومەر هاتووتەدنیا، زانایەکی فەرموودەناس بووە، مامۆستا عبدالکریم سەمعانی، دەڵێ: {منیش لە (بەغدا) لە خزمەتم خوێندووە}، لە مانگی شەووالی ساڵی ٥٣٤ك – ١١٤٠ز لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ٢/٨١.

٢. اللباب ١/٢٧٧.

## محەممەد محەممەد جزیری (ابن الجزري) (١٥٠١)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی یوسفی جزیرییە، نازناوی (ئەبولخەیر)ە، هەرچەندە خۆی لە (دیمشق) لە دایك بووە، بەڵام باپیری لە (جزیرە) بووە، بۆیە بەو ناوە هەڵدراوە، باوکی تەمەنی چل ساڵ بوو هیچ منداڵی نەبوو، چووە حەج ئاوی زەمزەمی خواردەوە، بەو نیازە خوای گەورە کوڕەکی پێ ببەخشی ببێتە زانای ئاین، ئەوەبوو دوعاکەی قەبوڵ بوو لە (٢٥)ی ڕەمەزانی پیرۆز، ساڵی ٧٥١ك – ١٣٥٠ز لە (دیمشق) خوای گەورە ئەو کوڕەی پێدا، ئەویش هەر بەناوی خۆی و باوکی کرد (محەممەد).

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن، لەلایەن ئەو زانایە بەرزانـە کۆتـایی پـێ هینـا: عبدالوەهاب سالار، ئەحمەد ڕەجەب، ئەسـنەوی، محەمـەد صـالح ووتـارخوێن، سـعداللهی قەزوینی.

مەلایەتی: مامۆستا سەرکەوت لە پلەکانی خوێنـدن، پلـەی بـەرزی زانیـاری بـە دەست هینا، بووە مامۆستای فەرموودەناسەکانی ئەو سەردەمی، پاشـان لـە (قـودس) کـرا مامۆستا، چەند جار سەردانی (میصر)ی کرد، گـەڕاوە (دیمشـق) کـرا مامۆسـتای قورئـان خوێنـەکان، سـالّی ٧٩٣ك – ١٣٩١ز کـرا قـازی (شـام)، سـالّی ٨٠٥ك – ١٤٠٢ز لەلایەن تەیمورلەنگ کرا قازی (شیراز).

ڕووداوەك: جارەك تەیموری لەنگ کۆڕەکی لۆ زانایان بەستا، هەموو کۆبوونەوە، مامۆستا جزیری لەلای ڕاستەی خۆی دانـا، سـەید شـەریفی جورجـانی – کـە زانایـەکی بەناوبانگی ئەو ولاّتە بوو – لەلای چەپەی دانا، پرسیاریان لێ کرد: بۆ ئەوەندە ڕێزی ئـەو کەسەت گرت کە خەلّکی ولاّتی ئێمەش نیە؟ وەلاّمی داوە چۆن دەتـوانم ڕێـزی کەسـێك نەگرم کە زانایەکە، شارەزایە لە زانیاری قورئانی پیرۆز و فـەرمودەکانی پێغەمبـەر (درودی خوای لێ بی)؟

سەفەرەکانی: سالّی ٨٠٧ك چووە (هەرات)، لەوێ چووە (ئەصـفەهان) لـەوێ چووە (شیراز) لەوێ چووە (بەصرە)، سالّی ٨٢٢ك چووە (مەککـە) و (مەدینـە) سـالّەك ماوە، گـەڕاوە (عێـراق) سـالّی ٨٢٦ك دووبـارە چـۆوە حـەج، سـالّی ٨٢٧ك گـەڕاوە (دیمشق)، لەوی چووە (قاهیرە)، گەڕاوە (مەککە)، چـووە (یەمـەن)، گـەڕاوە (مەککـە)، گەڕاوە (قاهیرە)، گەڕاوە (بەصرە)، گەڕاوە (شیراز).

خووڕەوشتی: خەریکی چاکە و خێربوو، کاتی خۆی بەفیڕۆ نەدەدا، لە مالّـەوە و لەسەفەر وازی لە شەونوێژ نـەدەینا، هـەموو دووشـەم و پێـنج شـەمان، بـەڕۆژی دەبـوو، لەگەلّ سێ ڕۆژ لە هەموو مانگەکان.

جگە لە مەلایەتی ئەدیب و شاعیر بوو، لە مەتحی پێغەمبەر (درودی خوای لیّ بی) دەڵیّ:

لِطَيْبَةَ بِتُّ طُولَ الليلِ أَسرِي ... لَعَلَّ بها يكونُ فكاكُ أَسرِي

إلهِي سَوَّدَ الوجهَ الخطايا ... وبَيَّضَتِ السنونُ سوادَ شَعري

کۆچی دوایی: لە ڕۆژی هەینی ١٥ی مانگی مەولود، ساڵی ٨٣٣ك – ١٤٣٠ز لە (شیراز) کۆچی دوایی کرد، سێ کوڕی زانای هەبوو:

١. ئەحمەد: لە پێشدا باسمان کرد.
٢. محەممەد: ساڵی ٧٧٧ك – ١٣٧٥ز لە دیمشق هاتەدنیا، لە (میصر) خوێندی، کرا موفتی و مودەرریس، گەڕاوە (شام)، لە ٨١٤ك – ١٤١١ز کۆچی دوایی کرد.
٣. محەممەد: ساڵی ٧٨٩ك – ١٣٨٧ز هاتەدنیا، لە (دیمشق) خوێندی، چووە (میصر)، پاشان لە (شیراز) کۆتایی بە خوێندن هینا.

دانراوەکانی: مامۆستا دەوری پەنجا دانراوی هەیە، لەوانە: النشر في القراءات العشر، التقريب، تحبير التيسير، طبقات القراء، شرح المصابيح، غاية المهرة في الزيادات على العشرة، طيبة النشر في القراءات العشر، الجوهرة، المقدمة فيما على القارىء أن يعلمه، المقدمة الجزرية، التذكار في رواية أبان العطار، مختصر تأريخ الإسلام للذهبي، ذات الشفا في سيرة النبي والخلفا.

سەرچاوەکان:


١. طبقات المفسرين ٢/٥٩.
٢. البدر الطالع ٢/٢٥٧ – ٢٥٩.
٣. هدية العارفين ٦/١٨٧ – ١٨٨.
٤. كشف الظنون ١/٧٤٣ /٢/١٩٥٢.
٥. إيضاح المكنون ٣/٨.
٦. مشاهير الكورد ٢/١٣٢ – ١٣٤.

٧. شذرات الذهب ٧/٢٠٤.
٨. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٥١.
٩. معجم المؤلفين ١١/٢٩١ – ٢٩٢.
١٠. الضوء اللامع ٩/٢٥٣.
١١. الأعلام ٢/١١٢ /٧/٢٧٤.
١٢. معجم أعلام الكورد ٦٢٥ – ٦٢٨.

## محەممەد محەممەد حەڕانی (١٥٠٢)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالغنی (حەڕانی)یە، لە کۆتایی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٦٧٨ك – ١٢٨٠ز هاتەدنیا، لەلای زانایانی ئەو سەردەمی خوێند، پلەی قازییاتی پێدرا، دەرسی فەرموودەی دەداوە، زانای فەرموودەناس – حافیزی عێراقی – یەکە لە فەقێیانی ئەو زاتە، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٧٥٦ك – ١٣٥٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٤/١٨٨.

## محەممەد محەممەد حصکەفی (١٥٠٣)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی ئەبولوتفی (حصن کیفا)یە، ساڵی ٨٥٩ك – ١٤٥٥ز باوکی کۆچی دوایی کرد، ئەو لەوکاتە لە زگی دایکی بوو، پاش فامکردنی لەبەر خوێندنیان دانا لە (قودس)ی شەریف، لای کەمالی ئەبو شەریف و چەند زانایانی خوێند، دوایی چووە (قاهیرە) زانستەکانی لەوێ تەواوکرد، ئیجازەی وەرگرت، مامۆستا زاتەکی بەدین وبێ فیز و دڵپاك و دڵنەرم و بەرێز و چاو بڵند و سەخی بوو، بۆیە خەڵکان خۆشیان دەویست، شەوی شەممەی ١٣ی ذی‌القعدەی، ساڵی ٩٢٨ك – ١٥٢٢ز لە (قودس) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٨/١٦١.

٢. الضوء اللامع ٩/١٤٥.
٣. معجم أعلام الكورد ٦٣٠.

## محەممەد محەممەد حصکەفی (١٥٠٤)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی ئەبولوتفی (حصن کیفا)یە، مەزهەبی شافیعی بووە، وەك باب و باپیرانی خانەدانی زانیاری بووە، زاتەکی بەڕێز و بە حورمەت بووە، لە خزمەت باوکی فێرە شەریعەت بووە، چوویتە (میصر) لای شێخ قازی زەکەریای خوێندووە، چوویتە (دیمشق) ساڵی ٩٣٤ك – ١٥٢٧ز لە مزگەوتی (ئەمەوی) دەرسی داوە، چوویتە (قودس) لە مزگەوتی گەورە ووتاری داوە، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٩٧١ك – ١٥٦٤ز لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٨/٣٦٦.

## محەممەد محەممەد خاوەرانی (١٥٠٥)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدە، نازناوی ئەبولحەسەنە، خەڵکی (خاوەران)ی ناوچەی (خلاط)ی کوردستانی تورکیایە، دەرسی لەلایەن چەند زانایان خوێندووە، لەوانە عبدالجبار بەیهەقی لە (نیسابۆر)، خاوەرانی دەڵێ: {تەمەنم چوار ساڵان بوو ئیمامی عەزالیم دیت}، (کشاف) و (مفصل)ی لەلای سەرۆکی زانایان مەحمودی زەمخشەری خوێند، دەرسی بە عبدالغفاری فارسی و محەممەدی فەزاری و ئەحمەدی و میدانی و سەعیدی کوڕی داوە، ئیجازەی بە ئەبوبەکری محەممەد یوسف هەولێری داوە، ساڵی ٥٧١ك – ١١٧٥ز کۆچی دوایی کرد.

ئەم کتێبانەی داناون: (التلويح في شرح المصابيح) و (الشرح والبيان) و (سير الملوك) و (الأربعين) و (شرح حصار الإيمان) و (النقاوة في الفرائض) و (قصة إبليس مع النبي صلى الله عليه وسلم) و (النخب والنكت في الفرائض) و (القواعد والفوائد في النحو) و (نخبة الإعراب) و (الأدوات) و (التصريف).

سەرچاوەکان:
١. معجم البلدان ٢/٣٤١ – ٣٤٢.
٢. معجم المؤلفين ١١/٢١٢ – ٢١٣.
٣. إيضاح المكنون ٢/٢٦٤.
٤. كشف الظنون ٢/١٩٣٥ – ١٩٣٦.
٥. مشاهير الكورد ١٩١.

**محەممەد محەممەد دیاربەکری (١٥٠٦)**

ناوی محەممەدە، کوڕی محەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدی کوڕی سەعدە، نازناوی (ئەبو عبدالله)یە، ساڵی ٥٣٧ك – ١١٤٢ز لە (دیاربەکر) هاتەدنیا، زانایەکی نەحوزان و شاعیر و شەریعەت زان بووە، لە مەزهەبی حەنەفی زۆر شارەزا بووە، پێشەوا بووە، چەند جار هاتووتە هەولێر، سەفەری (خوراسان)ی کردووە، لە (دیمشق) دانیشتووە، خەریکی فەرموودەی پێغەمبەربوو (درودی خوای لێ بێ)، لەسەر ڕێبازی زانایانی تەصەووف بوو، ساڵی ٦١٧ك – ١٢٢٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأريخ أربيل ١/٢٨٥ – ٢٨٦.

**محەممەد محەممەد دیاربەکری (١٥٠٧)**

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی عوسمانی کوڕی موسای (دیاربەکر)ییە، دەرسی فەرموودەی لە خزمەت باوکی خوێند، پاشان لە شوێنی باوکی، کرا مامۆستای حەنبەلییەکان، ماوە سی ساڵان لە (مەککە)ی پیرۆز، لەسەر ئەو کارە بەردەوام بوو، ساڵی ٧٥٩ك – ١٣٥٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:
١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٤.
٢. معجم أعلام الكورد ٦٣٠.
٣. الدرر الكامنة ٤/١٩٨.

٤. شذرات الذهب ٦/٨٨.

## محەممەد محەممەد دیاربەکری (١٥٠٨)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی، کوڕی محەممەدە، نازناوی عیمادەدینە، مەزهەبی حەنەفی یە، خەڵکی (ئامەد – دیاربەکر)ە، لە (دیمشق) دانیشتووە، بەشداری زۆر زانیاریانی کردووە، کتێبی (عشرة أبحاث من عشرة علوم)ی داناوە، ساڵی ٩٨٦ك – ١٥٧٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم المؤلفين ١١/٢٧٨.

## محەممەد محەممەد سعێرتی (١٥٠٩)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالعزیزی کوڕی عبدالصمدی کوڕی ڕۆستەمی (ئەسعردی)یە، نازناوی (نورەدین) بووە، ساڵی ٦١٩ك – ١٢٢٢ز هاتەدنیا، زانایەکی زیرەك و شاعیر و نووسەر و بووە، سوڵتان صەلاحەدین خۆشی ویستووە خەلاتی کردووە، ساڵی ٦٥٦ك – ١٢٥٨ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (سلافة الزرجون في الخلاعة والمجون)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٦٢٨ – ٦٢٩.
٢. الأعلام ١/٢٩٥ /٧/٢٥٧.
٣. كشف الظنون ٢/٩٩٥.
٤. فوات الوفيات ٣/٢٧١ – ٢٧٦.
٥. شذرات الذهب ٥/٢٨٤.
٦. معجم المؤلفين ١١/٢٣٤.
٧. إيضاح المكنون ١/٤٩٠.

## محەممەد محەممەدئەمین سەلماسی (١٥١٠)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدئەمینی کوڕی مەولودی کوڕی عبداللە ی کوڕی حوسێنە، عەشیرەتی (ئاکۆ)یە، ساڵی ١٩١٠ز لە گوندی (سەلماس) هاتەدنیا، لەو گوندە دەستی کرد بە خوێندن، پاش تەواوکردنی قۆناغی سوختەیی چووە (مام خاران) لە ناوچەی زرارەتی لای مەلا عبداللە مەلا سولەیمان (باوکم)، ماوەکیش لەلای مەلا ئەحمەدی (ڕەش) بوو، ماوەك چووە لای مەلا محەممەدئەمین سوێری، ماوەك لای مەلا ڕەسول، ماوەك لای مەلا عوسمان، دوایی چووە (دیبەگە) لای مەلا صاڵحی کۆزەپانکە کۆتایی بە خوێندن هینا، لەسەر فەرموودەی مامۆستای ساڵی ١٩٣٤ز بووە مەلا لە (چل هەوێزە)، ماوەی چل ساڵ لەوێ کاروباری مەلایەتی ئەنجام دەدا، پاشان باری کرد، هاتە مزگەوتی حاجی عەزیز، لە گەڕەکی کوران، لە هەولێر، لە ١٩/١١/١٩٩٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## محەممەد محەممەد سیفا (١٥١١)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی یوسفی کوڕی محەممەدی کوڕی ڕەجەبی کوڕی سەعدەدین پاشایە، بەرەبابی (سیفا)یە، لە کوردەکانی (طەرابلس)ی (شام)ە، ساڵی ١٢٨٥ك – ١٨٦٨ز هاتەدنیا، لەلای مەلا شێخ حوسێن – مەلا چاکی ئەو سەردەمی – خوێندنی تەواوکرد، کرا مودەرریس لە قوتابخانەی (کفتین) لە (طەرابلس)، پاشان سەفەری (ئەستانە)ی کرد، گەڕاوە خەریکی نووسین و دانانی کتێبان بوو، تا ساڵی ١٣٣٦ك – ١٩١٧ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (تفسیر القرآن الکریم) و (رسالة الفلك) و (الحریر وتربیته) و (کیفیة استخراج الزیوت من النباتات) و (مختصر علم المعاني والبیان).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ١١/٢٥٣.

٢. معجم أعلام الکورد ٦٣٢.

## محەممەد محەممەد شارەزوری (١٥١٢)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالله ی کوڕی قاسمی کوڕی مظفری کوڕی عەلی (شارەزوری)یە، نازناوی (محیەدین) بووە، ساڵی ٥١٩ك – ١١٢٥ز هاتەدنیا، لە (بەغدا) شەریعەتی خوێند، فەرموودەی لەلای محەممەد قاسمی مامی باوکی خوێند، کرا سەرۆکی قازییان، پاشان چووە (شام) لەوی کرا قازی (حەلەب)، دوایی هاتە (موصل) لەوێ کرا قازی و مودەرریس، مامۆستا دەستی شیعری هەبوو، ساڵی ٥٨٦ك – ١١٩٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. وفيات الأعيان ٣/٣٧٩ – ٣٨٠.
٢. كشف الظنون ٢/١٧٨٤.
٣. معجم أعلام الكورد ٦٣١.
٤. أربيل في العهد الاتابكي ٣٥ – ٧١ – ٧٥.
٥. مشاهير الكورد ١/٢٦٣ – ٢٦٤.
٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٦٠ – ٤٦٢.
٧. شذرات الذهب ٤/٢٨٧.
٨. سير أعلام النبلاء ١٢/٣٥٦.
٩. تأريخ السليمانية ٢٥٩.
١٠. طبقات الشافعية الكبرى ٣/٤١٢.
١١. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ٢/١٠١ – ١٠٢.
١٢. الأعلام ٣/٢٦٠ /٧/٢٥٢.

## محەممەد محەممەد فارقی (ابن نباتة) (١٥١٣)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی حەسەنی (میافارقین)ە، ناسراوە بە (ئیبن نەباتە) ساڵی ٦٨٦ك – ١٢٨٧ز مانگی مەولود لە قاهیرە هاتەدنیا،

دوایی چووە (شام)، لە (قودس) پلەی پێدرا، گەڕاوە قاهیرە هەر لەوێ لە ٨ی مانگی صەفەری، ساڵی ٧٦٨ك – ١٣٦٦ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (سجع المطوق) و (دیوان شعر) و (سلوك دول الملوك) و (سرح العیون في شرح رسالة ابن زیدون) و (مطلع الفوائد).

سەرچاوەکان:

١. کشف الظنون ١/٨٤١.

٢. البدر الطالع ٢/٢٥٢ – ٢٥٤.

٣. هدیة العارفین ٢/١٦٤.

٤. معجم المؤلفین ١١/٢٧٣ – ٢٧٤.

٥. معجم أعلام الکورد ٦٢٩ – ٦٣٠.

## محەممەد محەممەد کاکی (١٥١٤)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی ئەحمەدە، نازناوی (قوامەدینە)، خەڵکی (ژەنگارە)، مەزهەبی حەنەفی بووە، زانای ئوصول و شەریعەت بووە، چوویتە (قاهیرە) پاشان لە مزگەوتی (ماردین) دەرس و فەتوای داوە، ساڵی ٧٤٩ك – ١٣٤٨ز کۆچی دوایی کردووە.

ئەو کتێبانەی داناون: (معراج الدرایة في شرح الهدایة) و (بنیان الوصول في شرح الأصول) و (عیون المذهب) و (جامع الأسرار في شرح المنار).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ١١/١٨٢.

٢. الأعلام ٦/٦٨ /٧/٢٦٥.

٣. کشف الظنون ٢/١١٨٧.

٤. هدیة العارفین ٢/١٥٥.

## محەممەد محەممەد گۆرانی ( ١٥١٥ )

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی بەهرامی کوڕی حوسێنی گۆرانە، نازناوی شەمسەدینە، ساڵی ٦٢٥ك – ١٢٢٨ز هاتەدنیا، زانایەکی شەرع زان و زمان ڕەوان بووە، لە زانیارییەکانی قورئانی پیرۆز شارەزابووە، کرایتە موفتی و مودەرریس، ماوەکی زۆر قازی (حەلەب) بوو، لە (دیمشق) جێگری قازی بوو، زاتەکی بە دین و پیرۆز بوو، دانراوی خۆی هەیە، ساڵی ٧٠٥ك – ١٣٠٥ز لە (حەلەب) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١١/٢٠١.

٢. شذرات الذهب ٦/١٣.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٤.

٤. الدرر الكامنة ٤/١٧١ – ١٧٢.

٥. معجم أعلام الكورد ٦٢٩.

٦. مشاهير الكورد ٣٦٢.

## محەممەد محەممەد کوردی ( ١٥١٦ )

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی ئیبراهیمە، پاش ساڵی ٧٤٠ك – ١٣٣٩ز هاتەدنیا، لە (دیمشق) نیشتەجێ بوو، لەلای مامۆستا ئیبن خەببازی خوێند، خەریکی زانیاری قورئانی پیرۆز و ڕێزمانی عەرەبی بوو لە شوێنی باب و باپیری کرا پێش نوێژ، زانایەکی زیرەك بوو، شیعری هەیە، خەڵکان خۆشیان دەویست، ساڵی ٧٧٢ك – ١٣٧٠ز جوانەمەرگ بوو.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٤/١٥٩.

## محەممەد محەممەد ماردینی (١٥١٧)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی ئەبوعیززی حەنەفییە، نازناوی (بەدرەدینە) ساڵی ٧٠٢ك – ١٣٠٢ز هاتەدنیا، زانایەکی مەزن بوو، لە ئوصول و شەریعەت و فەرائیز دەستی باڵا بوو، ساڵی ٧٨٠ك – ١٣٧٨ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (أرجوزة في الخلاف بين الشافعية والحنفية) و (أرجوزة في الفرائض) و (مختصر في أصول الفقه).

سەرچاوەکان:

١. الكفاية في المواريث/ الملحق ١٩٩.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٥.
٣. معجم المؤلفين ١١/٢٤٣.
٤. الدرر الكامنة ٤/٢٤٦.
٥. معجم أعلام الكورد ٦٢٩.

## محەممەد محەممەد ماردینی (١٥١٨)

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدی (ماردینی)یە، ساڵی ٨٢٦ك – ١٤٢٣ز لە (قاهیرە) هاتەدنیا، زانایەکی بەرز و بەتوانا بوو، سەفەری کرد بۆ (شام) و (قودس) و (حەما)، چووە حەج، ماوەك لەوێ ماوە، لە فەرائیز و حیساب و فەلەك دەستی باڵا بوو، ساڵی ٩٠٢ك – ١٤٩٦ز کۆچی دوایی کرد.

چەند دانراوی هەیە، لەوانە: (شرح الرحبية) و (إرشاد الفارض الى شرح كشف الغوامض) و (إرشاد الطلاب إلى معرفة الحساب) و (الإشارات في العمل بربع المقنطرات) و (إظهار السر المودوع في العمل بالربع المقطوع) و (تحفة المختصرات في معرفة القبلة وأوقات الصلاة)، لەگەڵ بیست کتێب پتر.

سەرچاوەکان:

١. كشف الظنون ١/٩٧.

٢. معجم المؤلفين ١١/١٨٨.

٣. البدر الطالع ٢/٢٤٢.

٤. هدية العارفين ٦/٢١٨ – ٢١٩.

٥. إيضاح المكنون ١/٢٣٨.

٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٥٠.

٧. بوژاندنەوە ١/٣٨٠ – ٣٨٣.

**محەممەد محەممەد هەولێری (١٥١٩)**

ناوی محەممەدە کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەدی، کوڕی مەلکانی (هەولێری)یە، ساڵی ٧١٧ك – ١٣١٧ز هاتەدنیا، بۆ خوێندن چووە (دیمشق)، بوو بە مامۆستا دەرسی دەداوە، لە مانگی ڕەبیعی دووەم، ساڵی ٧٧٩ك – ١٣٧٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٢٦٣ – ٢٦٤.

٢. معجم أعلام الكورد ٦٢٨.

**محەممەد مەحمود دیاربەکری (١٥٢٠)**

ناوی محەممەدە کوڕی مەحمودی کوڕی نەصری (دیاربەکر)یە، زانایەکی شەرع زان بووە، دەرسی فەرموودەی داوە، لە ٢٢ی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، ساڵی ٧٩٦ك – ١٣٩٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٤/٢٥٣.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٥.

## محەممەد مەحمودی زەرکەلی (١٥٢١)

ناوی محەممەدە، کوڕی مەحمودی کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی فارسی (زەرکەلی)یە، نازناوی (خەیرەدینە)، لە کوردەکانی دیمشقە، باپیری خەڵکی (ئەرزڕۆمە) لە کوردستانی تورکیا، ساڵی ١٣١٠ك – ١٨٩٢ز لە (بێروت) هاتەدنیا، لە (دیمشق) پەروەردەبوو، زانایەکی مێژووناس و زمان زان و شاعیر و ڕۆشنبیر بوو، بە سەفەر چووە (فەڵەستین)، لەوێ چووە (میصر)، لە ١٩٢١ز چووە (حیجاز)، لەوێ چەند پلە و پایەی پێدرا، گەڕاوە (میصر) لە قاهیرە چاپخانەی (عەرەبییە)ی دانا، گەڕاوە (حیجاز)، لەوێ چووە (قودس)، پاشان بە نوێنەری حکومەت ناردرا (مەغریب)، دوایی گەڕاوە (بێروت)، لەوێ کرا ئەندامی هاتووچوی کۆمەڵەی ڕێزمان، لە نێوان (دیمشق) و (قاهیرە) و (بەغدا)، چەند دانراوی بەنرخی هەیە، لەوانە: (الأعلام)ە: مێژووی زانایانە لە هەشت بەرگ، ساڵی ١٣٦٩ك – ١٩٧٦ز لە قاهیرە کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٢٦٤ – ٢٦٥.

## محەممەد مەحمود شارەزوری (١٥٢٢)

ناوی محەممەدە کوڕی مەحمودە، ناسراوە بە (شەمسەدین حەکیم)، خەڵکی شارەزورە، ساڵی ٦٨٧ك – ١٢٨٨ز لە ژیاندا بوو.

دانراوەکانی: (الرموز والأمثال اللاهوتية) و (الشجرة الالهية) و (نزهة الأرواح، وروضة الأفراح) و (التنقيحات شرح التلويحات في الحكمة).

سەرچاوەکان:

١. كشف الظنون ١/٩١٣.
٢. معجم المؤلفين ١١/٣٢٠.
٣. هدية العارفين ٢/١٣٦.
٤. معجم أعلام الكورد ٦٣٤.

## محەممەد محیەدین تەوێڵەیی (١٥٢٣)

ناوی محەممەدە کوڕی محیەدینی کوڕی شێخ عومەری کوڕی شێخ عوسمانی (تەوێڵە)یە، دەوری ساڵی ١٣٠٠ك - ١٨٨٢ز هاتەدنیا، دوای خەتمی قورئانی پیرۆز و تەواوکردنی کتێبەکانی فەقێیەتی، تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ نەجمەدینی مامی وەرگرت، پلەی خەلیفایەتی وەرگرت، باری کرد لە (بیارە) بۆ ناوچەی مەریوان، لەوێ خەریکی جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی و ئامۆژگاری خەڵکان بوو، بە یارمەتی شێخ عارف و شێخ صەدیق و شێخ خالید دەستەڵاتی خزمەتی ئاینی پتر بوو، لە ناوچەکە ناوبانگی چاکە و چاکەخوازی زیاتر ڕۆیشت، ساڵی ١٣٨٥ك - ١٩٦٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. یادی مەردان ٢/١٥٤.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٢٦ - ٥٢٧.

## محەممەد مەسعود دیاربەکری (١٥٢٤)

ناوی محەممەد مەسعودە کوڕی سەید (ضیف‌الله)یە خەڵکی (دیاربەکر)ە، مەزهەبی حەنەفی بووە، ساڵانی ١٣٢٦ تا ١٣٢٨ك - ١٩٠٨ تا ١٩١٠ز لە (مەدینە)ی پیرۆز قازی بووە.

سەرچاوە: قضاة المدينة المنورة ٢/٥١١ - ٥١٤.

## محەممەد مصطەفا ئامێدی (١٥٢٥)

ناوی محەممەدە کوڕی مصطەفای کوڕی محەممەدی (ئامێدی)یە، خەڵکی (ئەسکلیبی) ناوچەی (قەسطمونی)یە، لە ئامێدی ئاوارەی ئەو جێگایە بووە، مامۆستا باوکی محەممەد ئەبوسعودی خاوەنی تەفسیری قورئانی پیرۆزە، ماوەك لای مەلا عەلی محەممەد قۆشەجی خوێند، دوایی چووە لای (مصلح الدین) قۆجەوی، پاشان چووە لای شێخ ئیبراهیم قەیسەری ئیجازەی خەلیفایەتی وەرگرت، سولتان بایەزیدخان خۆشی دەویست،

لە (قوسطەنطینییە) قوتابخانەی بۆ دانا، خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوو، تا ساڵی ٩٢٠ك – ١٥١٤ز لە (ئەسکەلیب) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٨ – ٤٨٩.
٢. معجم أعلام الكورد ٦٧٤.
٣. مشاهير الكورد ٢/١٧٥ – ١٧٧.

## محەممەد مصطەفا ئەرضرۆمی (١٥٢٦)

ناوی محەممەدە کوڕی مصطەفایە، خەڵکی (ئەرزڕۆمە) زانایەکی مەنتیق زان بووە، کتێبی (شرح قياسية موسا)ی داناوە، لە چواری صەفەری ساڵی ١٢٤٠ك – ١٨٢٤ز تەواوی کردووە، دوای ئەو بەروارە کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم المؤلفين ١٢/٢٤.

## محەممەد مصطەفا قیرژەیی (١٥٢٧)

ناوی محەممەدە کوڕی فەقێ مصطەفایە، ساڵی ١٩١٧ز لە گوندی (قیرژە) هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، چووە (قەراسنج) لای مەلا محەممەدئەمین، دوایی چووە (سکتان) لای مەلا عبداللە، چووە (باتاس) لای مەلا شەریف، پاشان چووە مزگەوتی شێخ مصطەفا، لە هەولێر ماوە لە خزمەت شێخ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

بووە مەلا لە (قیرژە)، ماوەکی زۆر لەوێ ماوە، دوایی باری کرد، بۆ (سێیرانی گەورە)، چەند ساڵ لەوێ دەرسی داوە، کاروباری مەلایەتی ئەنجام دەدا، پاشان هاتە هەولێر، تووشی نەخۆشییەکی کوشندەبوو چەند ساڵ لەناو جێ بوو، لە ٢٠٠٧/١٠/٧ز کۆچی دوایی کرد، مەلا مصطەفای کوڕی مەلای مزگەوتی (گوڵستانە) لە هەولێر.

سەرچاوە: النجم الزاهر ٦٨.

**محەممەد مصطەفا نۆدەیی (شێخ مەعروفی نۆدێ) (١٥٢٨)**

ناوی محەممەدە، ناسراوە بە: (شێخ مەعروف)، کوڕی شێخ مصطەفای کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدە، نەتەوەی شێخ عیسای بەرزنجەیە، مامۆستا ئالووسی لە تەفسیری روح المعانی، لە ئایەتی: ﴿ستدعون إلى قوم أولي بأس شديد﴾ (الفتح / ١٦) دەڵێ: {سەیدە کوردەکانی بەرزنجە نەوەی ئیمامی حوسێنن، گۆمان لە سەیدایەتیان نیە، ماقووڵ و ڕێزدارن}. ئەو زاتە ساڵی ١١٦٦ك – ١٧٥٢ز لە گوندی (نۆدێ) لە قەزای (چوارتا) هاتەدنیا.

خوێندنی: لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی نەحو و صەرفی تەواوکرد، باوکی ناردیە (قەڵاچوڵان) پایتەختی بابانیان، لە قوتابخانەی (غەزائییە) دەستی کرد بە (شەرحی موغنی) ماوە لەوێ تا ساڵی ١١٧٨ك – ١٧٦٤ز، لەوکاتە کارەساتێکی دڵتەزێن ڕوویدا، ئەوەبوو: میر سولەیمانی بابان، لە قەسری خۆی لە (قەلاچوالان) بە دەستی فەقێ برایم شێخ بزێنی کوژرا، بۆیە فەقێیەکان بەلاوبوون، (شێخ مەعروف) چووە (هەزارمەرد) لای مەلا محەممەدی ئیبنولحاج کتێبانی سیوطی و حیسامکاتی و عبدالله یەزدی و مختصر و شەرحی عەقائیدی خوێند، ماوە لەوێ، تا ساڵی ١١٨٠ك – ١٧٦٦ز مەلا عبدالله ی بیتووشی لە (ئەحسا) هاتەوە بۆ (هەزارمەرد) شێخ مەعروف چەند ئەدەبیاتی لەلای خوێند، بە ئاماژەی ئەو مامۆستایە هۆنراوەی (شامل) و (تەصریفی زەنجانی) دانا، پاشان شێخ مەعروف گەڕاوە (قەڵاچوڵان)، ماوەك لەلای مەلا محەممەدی غەزائی شەریعەتی خوێند کۆتایی بە خوێندن هینا.

مەلایەتی: کرا (مودەرریس) لە مزگەوتی (قەڵاچوڵان)، ساڵی ١٢٠٠ك – ١٧٨٥ز ئیبراهیم پاشای ئەحمەد پاشا، شاری سلێمانی دروست کرد، مزگەوت و قوتابخانەی لێ دانا، پایتەختی بابانی لە قەڵاچوڵان گواستەوە وێندەر، شێخ مەعروفی کردە مەلای مزگەوت، پەرتوکخانە گەورەکەی قەڵاچوڵانی بۆ هینا، خستیە ژێردەستی ئەو،

ئـەویش دەسـتی کـرد بـە دەرسـدانەوە، دەنگوباسـی مـەلا چـاکی بـەلاوبۆوە، چـینەك دەردەچوون دەبوونە مەلا، چـینەکی دی دەهـاتن سـەریان دەگـرت، سـاڵی ١٢٤٣ك – ١٨٢٧ز ئیجازەی بە مەلا عومەری کوڕی حەیدەری عەسکەری دا.

تەریقەتی: (شێخ مەعروف) تەریقەتی قادری لە شێخ عەلی (دۆڵ پەموو) کە مـامی باوکیتی وەرگرت، ئەویش تەریقەتی لە شێخ ئیسماعیلی ولیانی وەرگرت بوو.

سیفەتەکانی: تۆزەك بەژن کورت بووە، دەم و چاوی سۆروسپی بووە، چـاوەکانی گەش و گەورە بووە، مووی ڕەش بـووە، ڕیشـی بۆربـووە، قـەد و بـەژنی ڕاسـت بـووە، چارشانە بووە، ڕووجوان بووە، بە سام و هەیبەت بووە.

خووڕەوشتی: زانایەکی بە توانا بووە، لە زانستەکان دەستی بـاڵا بـووە، زۆربـەی کتێبەکانی خوێندنی کردە هۆنراوە، بگرە لە ئەحمەدی تـا (جمـع الجوامـع)، لـە کـوردی و عەرەبی و وفارسی زمان ڕەوان بووە، کاتی خـۆی بەفیڕۆنـەداوە، خـەریکی خواپەرسـتی و دەرس و نووسین بووە، خەت خۆش و خۆشنووس بووە، بایەخی بە دنیا نەداوە، حەزی لـە تێکەڵایەتی لـەگەڵ کاربەدەستان نەکردووە، شـانازی بـە ژیـانی دەسـت کـورتی فـەقێیاتی کردووە، پارچە نانەڕەقەکەی (ڕاتبە)ی لـەلای بەرزتربو لـە هەموو پلەوپایـەك، بـەو هـەموو ڕەنج و ئەزیەتە، ئەو هـەموو ئـەرك و مەینەتـە، زانسـت و زانیاریـان کـۆکردەوە، دنیـا و قیامەتیان لۆخۆ بردەوە، ئەو ڕەوشەتە پیرۆزانەیان هـەتا هـەتایێ بـە مەرەکـەبی زێـر و زیـو دەنوسرێتەوە، تا ببیتە بەرنامە لۆ ئەوانەی لـە دوادێـن، ئێسـتاکەش ئاخەکـەم و داخەکـەم، دەوری پارە و سەیارە و تەیارەیە، دەوری حاسیبە و کۆمپیوتـەر و چـاپخانەیە، سـتەلایت و ئەنتەرنێتە، تەلەفۆن و مۆبایل و سوڕەییایە، ئەو کتێبانـەی هەنـدەزۆر، ئـەو خەڵکانـەی بـێ زەین و زلۆر ﴿ربنا ظلمنا أنفسنا وإن لم تغفر لنا وترحمنا لنكونن من الخاسرين﴾ (ئـەعراف/ ٢٣).

کۆچی دوایی: ساڵی ١٢٥٤ك – ١٨٣٨ز کۆچی دوایی کـرد، لـە گۆڕسـتانی سەیوان نزیك گومبەتی سولـەیمان پاشای بابان بە خاك سپێردرا.

کوڕەکانی:

١. سەید محەممەد: لە زووەوە جوانەمەرگ بوو.

٢. ئەحمەد: ناسراوە بە (کاك ئەحمەدی شێخ) لە پێشدا باسمان کرد.

دانراوەکانی:

١. ئەحمەدی: ساڵی ١٢١٠ك – ١٧٩٥ز بۆ کاك ئەحمەدی کوڕی داناوە.

٢. أزهار الخمائل في الصلوات المشتملة على الشمائل.

٣. الإغراب في نظم قواعد الإعراب: مەلا محەممەد مەحمود قەرەداغی شەرحی لەسەر نووسیوە، ناوی ناوە (منهج الطلاب في حل عقود الإعراب).

٤. أوثق العرى في الصلاة على خير الوري: ساڵی ١٢٣٠ك – ١٨١٥ز دایناوە.

٥. إيضاح المحجة واقامة الحجة على الطاعن في نسب السادة البرزنجة.

٦. البرهان الجلي في مناقب شيخي السيد علي.

٧. تحرير الخطاب.

٨. ترصيف المباني في نظم تصريف الزنجاني: ساڵی ١٢٠٠ك تەواوی کردووە، دەستنووسێکی ساڵی ١٢٨٨ك – ١٨٧١ز محەممەد مەلا عبدالقادرمان لەلایە.

٩. التعريف بأبواب التصريف.

١٠. تنقيح العبارات في توضيح الإستعارات: ساڵی ١١٨٣ك– ١٧٦٩ز تەواوی کردووە، دوایی شەرحی کردووە، ساڵی ١٣٥٥ك – ١٩٣٦ز لە (بەغدا) چاپ کرا.

١١. تخميس قصيدة البردة.

١٢. تخميس قصيدة أءنعم عَيشاً.

١٣. تخميس قصيدة المضرية.

١٤. تخميس قصيدة الهمزية.

١٥. تخميس لامية العجم.

١٦. تخميس قصيدة بانت سعاد.
١٧. تخميس قصيدة يا مَن يَرى....
١٨. تنوير البصائر في التحذير عن الكبار.
١٩. زاد المعاد في الإعتقاد.
٢٠. تنوير القلوب في مديح حبيب علام الغيوب.
٢١. تنوير الضمير في الصلاة على البشير النذير.
٢٢. تنوير العقول في مولد الرسول.
٢٣. الجوهر الأسنى في الصلاة المشتملة على الأسماء الحسنى.
٢٤. الجوهر النضيد في التجويد: ساڵی ١١٩٩ك- ١٧٨٤ز دایناوە.
٢٥. راحة الأرواح في الصلاة علي حبيب الملك الفتاح.
٢٦. روض الزهر في مناقب آل سيد البشر.
٢٧. الروضة الغناء في الدعاء باسماء الله الحسنى.
٢٨. السراج الوهاج في مديح صاحب المعراج.
٢٩. سلم الوصول الى علم الأصول: کاك ئەحمەدی شێخ شەرحی کردووە ناوی ناوە (فك القفول في شرح سلم الاصول).
٣٠. الشامل في العوامل: ساڵی ١١٨٩ك – ١٧٧٥ز تەواوی کردووە، دانەکی کۆپیمان لەلایە لەسەر خەتی مصطەفا پایلانی وەرگیراوە، لە ١٢٩٢ك – ١٨٧٥ز نووسراوە
٣١. عقد الجوهر في الصلاة على شافع المحشر.
٣٢. الدرر في مصطلح أهل الأثر.
٣٣. غيث الربيع في علم البديع.
٣٤. فتح الرحمن في المعاني والبيان: سەید ئەحمەد فائیز شەرحی کردووە، ناوی ناوە (تحفة الإخوان شرح فتح الرحمن)، ساڵی ١٢٨٣ك – ١٨٦٦ز تەواوی کردووە.

٣٥. فتح الرزاق في أذكار دفع الإملاق.

٣٦. فتح المجيد في علم التجويد (فارسي).

٣٧. فتح الموفق في علم المنطق.

٣٨. فتح الرؤوف في معاني الحروف.

٣٩. القطوف الداني في حروف المعاني.

٤٠. كشف الأسف في الصلاة على سيد أهل الشرف.

٤١. البأساء بأذكار الصباح والمساء.

٤٢. كفاية الطالب في نظم كافية ابن الحاجب: مامۆستا محەمەد (ئیبن ئادەم) شەرحی کردووە، ساڵی ١٢٣٢ك – ١٨١٧ز تەواوی کردووە، ناوی ناوە (مصباح الخافية في شرح نظم الكافية)

٤٣. وسيلة الوصول الى علم الأصول.

٤٤. الفتح الالهي في الصلوات المشتملة على المناهي.

٤٥. هۆنراوەی (ئەی شودە) فارسي، ساڵی ١٣٥٥ك لە بەغدا چاپ کرا.

٤٦. قطر العارض في الفرائض.

٤٧. كشف الغامض في شرح قطر العارض: لەگەڵ حاشیەی مەلا عەلی قزلجی، ساڵی ١٣٥٧ك – ١٩٣٨ز لە بەغدا چاپ کرا، نووسخەکی دەستنووسی ڕەسول مەنگوڕ، ساڵی ١٣١٩ك – ١٩٠١ز لەلامانە.

٤٨. منظومة العروض.

٤٩. منظومة الظرف.

٥٠. لباب أداب البحث.

٥١. نظم الرسالة العضدية في علم الوضع.

٥٢. تنوير العقول في أحاديث الرسول.

٥٣. قصيدة في نسبه الشريف.

٥٤. قصيدة: ساڵی ١٢٠٥ك – ١٧٩٠ز پێشکەشی بە سوڵتان سەلیم کردووە.

٥٥. عمل الصياغة: شەرحی (تحرير البلاغة)ی ئیبن ئادەمە.

٥٦. أشرف المقاصد في نظم العقائد: لە ١١٨٨ك – ١٧٧٤ز تەواوی کردووە.

٥٧. الدرة الغريدة لطالب العقيدة: هۆنراوەی (نقاية)ی سیوطي يە.

٥٨. الفرائد في علم العقائد: لە ١٢٢٥ك – ١٨١٠ز تەواوی کردووە، سەید ئەحمەد فائیز شەرحی کردووە، بەناوی (أبهى القلائد) ساڵی ١٣١٥ك – ١٨٩٧ز لە (موصل) چاپ کرا.

٥٩. البرهان الجلي، في مناقب الإمام علي (خ).

سەرچاوەکان:

١. روح المعاني ٢٦/١٠٣.

٢. الشيخ معروف النودهي البرزنجي ١٥.

٣. الأعمال الكاملة للشيخ معروف النودهي/ القسم الاول ٩ – ٣٢.

٤. ژیناوەری زانایانی کورد ٦٨٨ – ٦٩٥.

٥. كشف الغامض شرح قطر العارض ٣ – ٥.

٦. هدية العارفين ٦/٣٦٩.

٧. مشاهير الكورد ٤١١ – ٤١٢.

٨. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٧٢ – ٥٨٧.

٩. معجم المؤلفين ١٢/٤١.

١٠. جامع كرامات الأولياء ١/٥٨١ – ٥٨٢.

١١. مێژووی ئەدەبی کوردی ٥/٣٩ – ٤٥ – ٩٧ – ٢٠١ – ٢٠٢ – ٢١٥ – ٢٧٤ – ٢٩٢ – ٢٩٧ – ٣٠٠ – ٣٥٠ /٦/١٧٣ – ١٨٣.

١٢. بنەماڵەی زانیاران ٣٤٥ – ٣٥٤.

١٣. الأعلام ٢/١٧ /٧/٣٢٦.

١٤. تأريخ مشاهير كورد / فارسى ٣/٥٩٧ – ٦١٥.
١٥. نوربەخش ٩ – ١٠.
١٦. معجم أعلام الكورد ٦٤ – ٥٥٨ – ٦٧٧ – ٧١٩ – ٧٢٠.
١٧. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٧/٢١٧ – ٢١٨.
١٨. أعلام كورد العراق ٥٩٤ – ٥٩٥ – ٧٩٣ – ٨٠٢.
١٩. شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ٥٨ – ١٦٠.
٢٠. إيضاح المكنون ٢/٣٩.
٢١. الأكراد في بهدينان ٧٩.
٢٢. تأريخ السليمانية ٢١٩ – ٢٢٤.
٢٣. البيتوشي ٣٧.

**محەممەد مەعالی حەڕانی (١٥٢٩)**

ناوی محەممەدە، کوڕی مەعالی کوڕی عومەری کـوڕی عبـدالعزیزی (حەڕانی)یـە، دەوری ساڵی ٧٤٢ك – ١٣٤١ز هاتەدنیا، لە خزمەت چەند زانایانی خوێند، مـاوەك لـە (قاهیرە) بو، ماوەك لە (مەدینە)ی پیرۆز، پاشان چووە (مەككە)ی پیرۆز، دە ساڵان لـەوێ ماوە، هاتە (حەلەب) لەوێ ماوە، ساڵی ٨٠٩ك – ١٤٠٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الضوء اللامع ١٠/٤٨.

**محەممەد موسا سعێرتی (١٥٣٠)**

ناوی محەمـەدە، کـوڕی موسـای کـوڕی ئەبونەصـری (ئەسـعەردی)یە، نازنـاوی (شەهابەدینە) لە زانیاری قورئانی پیرۆز شارەزا بوو، لە (میصر) دابەزیوە، ساڵی ٧٠٦ك – ١٣٠٦ز کت و پڕ کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدر الكامنة ٤/٢٧١ – ٢٧٢.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٥.

## محەممەد موسا هۆزبانی ( ١٥٣١ )

ناوی محەممەدە، کوڕی موسای کوڕی محەممەدی کوڕی عوسمانە، ناسراوە بە (ناصیرەدین)، ساڵی ٧٧٧ك – ١٣٧٥ز لە (دیمشق) هاتەدنیا، لە (موصل) دانیشتووە زانایەکی خاوەن تەریقەت بووە، شاعیر بووە، ساڵی ٨٥٨ك – ١٤٥٤ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (فتوح الوهاب ودلائل الطلاب إلى منازل الاحباب)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٢/٦٨.

٢. هدية العارفين ٦/٢٠٠.

## محەممەد مەولود بەحرکەیی ( ١٥٣٢ )

ناوی محەممەدە کوڕی حاجی مەولودی کوڕی حاجی محەممەدئەمینە، عەشیرەتی (گەردی)یە، ساڵی ١٩٢٩ز لە گوندی (بەحرکە)ی بەرانەتی هاتەدنیا.

خوێندنی: لەلایەن فەقێیەکانی قوتابخانەی بەحرکە دەستی کرد بە قورئانی پیرۆز، دوای خەتم کردنی و خوێندنی چەند کتێبە سەرەتاییەکان هەر لەو شوێنە چووە لای مەلا جەمیلی کاوانی، پاشان ماوەك چووە (دیبەگە)، دوایی چووە (خەتە)ی خۆشناوەتی لای مەلا جەمیل، پاشان چووە (سێبیرانی گەورە) لای مەلا کەریم، دوایی چووە (میرەدێ)ی دەشتی هەولێر، لای مەلا عبدالفتاحی جدیدەی، پاشان چووە (یارمجە) لای مەلا محەممەد ئەمینی سوێری، پاشان گەڕاوە لای مامۆستای مەلا عبداللە ی (باوکم)، ماوەکی زۆر لەوێ ماوە لەلایەك دەرسی دەخوێند، لەلایەك دەرسی فەقێیانی دەداوە و سەرپەرشتی مەدرەسەکەی دەکرد، تا کۆتایی بە خوێندن هینا.

مەلایەتی: ئەمجا باوکم لەگەری چووە گوندی (گردەچار) لای حەسەن ئاغا، کرا مەلا، ماوەك لەوێ دەرسی دەداوە وکاروباری مەلایەتی ئەنجام دەدا، پاشان ناکۆکی لەنێوان خەڵکەکە پەیدابوو، باری کرد گەڕاوە (بەحرکە) ناوەناوە دەرسی فەقێیانی دەدا،

منیش لە دوای باسی (مەبنی) لە کتێبی (جامی) چەند دەرسم لە خزمەت خوێند، ساڵی ١٩٦٣ز چووە هەولێر، ساڵی ١٩٦٩ز لەلایەن ئەوقاف کرا (واعیز)ی گەڕیدە.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٧٣ز لە کاتی ڕۆیشتنی لە جادەی سی مەتری گەڕەکی (تەیراوە) لە هەولێر سوار پایسکلەك خۆی لێدا، بەربۆوە سەری بە لێوی جادە کەت، بێ هۆش کەوت، هەڵیان گرت بۆ نەخۆشخانەی کۆماری، ماوەکی کەم پێ چوو کۆچی دوایی کرد، سێ کوڕی هەیە: ئیبراهیم و ئەییوب و ئیدریس.

سەرچاوە: نامەی ئیبراهیم کوڕی مامۆستا

## محەممەد مەهدی جەوانرودی (١٥٣٣)

ناوی محەممەدە، کوڕی سەید مەهدییە، خەڵکی (جەوانرودە)، دەوری ساڵی ١٢٨٥ك - ١٨٦٨ز هاتەدنیا، قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، لە قۆناغی موستەعیدی چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادر، لە کانیاوی زانیاری ئەو زاتە هەلیدێنجا تا پێ گەیشت، هەروەها بۆ ئارەزووی تەریقەتی نەقشبەندی چووە لای شێخ عومەر، لەو بابەتەش وەرگیرا.

مەلایەتی: چووە لای حەسەن بەگی جاف، لە قەزای (کفری) بووە مەلا و مودەرریس و ڕێ نیشاندەر، میر حەسەن زۆر ڕێزی لێنا، دوایی باری کرد بۆ (خانەقین) لە خانەقای شێخ عومەر خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆز بوو. مامۆستا بەڵێنی دا بوو بە درێژایی ژیانی هەموو ڕۆژ دە جزوی لە قورئانی پیرۆز دەخوێند، تا ساڵی ١٣٦٧ك - ١٩٤٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٣١.

## محەممەد ناهض کوردی (١٥٣٤)

ناوی محەممەدە کوڕی ناهیضی کوڕی محەممەدی کوڕی حەسەنی کوردییە، دەوری ساڵی ٧٥٧ك - ١٣٥٦ز هاتەدنیا، لە (حەلەب) دانیشتووە، زانایەکی زیرەك و نووسەر

و شاعیر بووە، ساڵی ٨١٩ك چووە (قاهیرە) دوایی چووە (دیمشق)، کتێبی (بستان الناظر وأنس الخاطر)ی داناوە، لە ١١ی شەعبانی، ساڵی ٨٤١ك – ١٤٣٨ز کۆچی کرد.

نمونەی شیعری:

کم دولةً بفنونِ الظلمِ قد فنيتْ — وراحَ آثارُهم في عكسهم ومُحوا

وجاء مِن بعدهم مَن يفرحون بها — وقال سبحانه: {حتّى إذا فَرِحوا}

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٦٢/١٠.

٢. تأريخ مشاهير کورد ١/١٢٦.

٣. معجم أعلام الکورد ٦٣٦.

٤. مشاهير الکورد ٣٨١.

٥. کشف الظنون ١/٢٤٤.

٦. هدية العارفين ٢/١٤٧ – ١٤٨.

٧. معجم المؤلفين ١٢/٧٣. لەگەڵ جیاوازی لە مێژووی کۆچی دوایی.

**محەممەد نەجمەدین کوردی (١٥٣٥)**

ناوی محەممەد نەجمەدینە، کوڕی شێخ محەممەدئەمینی کوردی نەقشبەندییە، خاوەنی کتێبی (تنوير القلوب)ە، ساڵی ١٣٢٩ك – ١٩١١ز لە (قاهیرە) هاتەدنیا، منداڵ بوو باوکی کۆچی دوایی کرد، لە خزمەت شێخ سەلام عەزام پەروەردە بوو، دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە زانکۆی (ئەزهەر)، پاش دەرچوونی دەستی کرد بە خزمەتی ئایینی پیرۆز لەسەر ڕێگای باوکی، قوتابی و مریدانی باوکی لە (قاهیرە) و دەوروبەری لەلای کۆبوونەوە بۆ ئامۆژگاری و فێربوونی زانیاری، مامۆستا ساڵی ١٤٠٦ك – ١٩٨٥ز کۆچی دوایی کرد، لێکۆڵینەوەی کتێبی (الفتن والملاحم)ی ئبن کەثیری هەیە.

سەرچاوەکان:

١. عقد الجوهر ٢١٤٣.

٢. معجم أعلام الكورد ٦٧٩.

## محەممەد نەجیب ئەخلاطی (١٥٣٦)

ناوی محەممەدە کوڕی نەجیبی کوڕی محەممەدی کوڕی یوسفی (ئەخلاطي یە)، ساڵی ٦٦٠ك – ١٢٦١ز هاتەدنیا، نووسەر و خۆشنووس بووە، لە (دیمشق) دەرسی داوە، پێش نوێژی کردووە، زاتەکی ڕێك و دیمەن جوان بووە لە مانگی ذیالقعدەی، ساڵی ٧١٧ك – ١٣١٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨٦.

## محەممەد نصرالله جزیری (ابن الأثیر) (١٥٣٧)

ناوی محەممەدە کوڕی نصرالله ی کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالکریمی جزیریە، ناسراوە بە (ئیبن ئەثیر)، ساڵی ٥٨٥ك – ١١٨٩ز هاتەدنیا، لە (موصل) نیشتەجێ بووە، کتێبی (نزهة الأبصار في نعت الفواكه والثمار)ی داناوە، ساڵی ٦٦٢ك – ١٢٦٣ز کۆچی دوایی کردوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ١٢/٧٩.

٢. إیضاح المکنون ٢/٦٣٤.

٣. الأعلام ٧/٣٤٧.

٤. وفیات الأعیان ٥/٣٢.

٥. معجم أعلام الكورد ٦٣٧.

## محەممەد نەصر هەولێری (١٥٣٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی نەصری کوڕی عەقیلی هەولێریە، نازناوی (شەرەفەدینە)، لە خزمەت باوکی و لەلای عیمادەدین محەممەدی خزمی خۆیان خوێندنی تەواوکرد، ساڵی ٦٣٣ك – ١٢٣٥ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: أربیل في مختلف العصور ٧٤.

## محەممەد وەسیم مەردۆخی (١٥٣٩)

ناوی محەممەد وەسیمە، کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ مصطەفای تەختی مەردۆخییە، ساڵی ١١١٨ك – ١٧٠٦ز لە گوندی (تەختە) هاتووتەدنیا، ماوەك لە کوردستانی ئێران خەریکی خوێندن بوو، پاشان هاتە (عێراق)، ماوەك لە کوردستان و ماوەك لە (موصل) و ماوەك لە (بەغدا)، کۆتایی بەخوێندن هینا، گەڕاوە ولاتەکەی خۆی دەستی کرد بە دەرسدانەوە، پاشان هاتە (قەلاچۆلان) پایتەختی بابانیەکان، لەوێ ناوبانگی بەلاوبۆوە بە عەللامەی قەلاچۆلان، خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوو، تا ساڵی ١١٧١ك – ١٧٥٧ز کۆچی دوایی کرد، لە قەلاچۆلان بە خاك سپێردرا.

دانراوەکانی: (بیان أسامي علوم الآخرين) و (بیان علوم شەرعییە) و (بیان علوم ئەووەلین) و (أصول الأخلاق) و (نامەی ئەخلاق) و (هۆنراوەی ئوسطرلاب): بە کوردی و (سنن الصلاة): بە عەرەبی و هۆنراوەی (فيء الزوال) و هۆنراوەی (وەصیەتنامە): لە کاتی (تاعوون) بە زمانی فارسی نووسیێ و (دەولەتنامە): مامۆستا عبدالکریم مودەڕریس، لە هەورامی هێنایتە سەر زاراوەی (سۆرانی) ناویناوە (ئیقبال نامە).

سەرچاوەکان:


١. بوژاندنەوە ٢/١٦٥ /٦/٣٥٣ – ٣٦٨.

٢. مشاهير الكورد ٢/٢١٩.

٣. بنەماڵەی زانیاران ١٣٠ – ١٣١.

٤. سلك الدرر ٤/١٧.

٥. معجم أعلام الكورد ٥٩٧.

٦. علماؤنا ٥٠٦ – ٥٠٧.


## محەممەد وەسیم مەردۆخی (١٥٤٠)

ناوی محەممەد وەسیمە، کوڕی شێخ محەممەد سەعیدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی مەحمودی مەردۆخی (سنە)یە، ساڵی ١٢١٩ك – ١٨٠٤ز هاتەدنیا، ئەو زاتە برا گچکە و

فەقێی شێخ قادری خاوەنی (تقریب المرام)ی شەرحی (تهذیب الکلام)ە، مامۆستا وەسیم: زانایەکی بە توانا بووە، بەتایبەت لە زانستی (کەلام) دەستی بالاّ بووە، حاشیەی هەیە لەسەر شەرحی تەهزیبی شێخ قادری برای، لەو حاشیە دەڵێ: {برا گەوە و مامۆستام، لەو کاتە تەهزیبی لە خزمەت باوکم دەخوێند، چەند حاشیەی لەسەر شەرحی مەقاصید هەڵدەبژارد، لەسەر کتێبەکەی دەنووسی، پاشان نووسراوەکانی کۆکردنەوە، کردییە شەرحەکی نایاب، کە باوکمان کۆچی دوایی کرد، برام بووە جێنیشی، دوبارە بە شەرحەکە داهاتەوە، گۆڕانکاری چەند وشەی کرد لە چەند شوێن، منیش زۆرجار بیرم لەوە دەکرد، حاشیەیەکی وا لەسەر ئەو شەرحە بنووسم، شوێنە زەحمەتەکان ئاسان بکا، گرێ کۆرە و داوە ئارۆزەکان بکاتەوە، بەڵام بەختم یاریکار نەبوو ولاّتمان پڕناخۆشی و ئاژاوە بوو، دوایی کاکم ئاوارە بوو بۆ سلێمانی منیش تەنیا مامەوە، دڵم سواربوو، ئایا بنووسم، دەست پێ بکەم ؟

لەوکاتە (والي) - خوا کاری ڕاست بینی - فەرمانی دەرسدانەوەی بۆ دەرکردم، چەند فەقێ لە دەورەم کۆبوونەوە، لەوانە زیرەکترەکەی هەردوو کوڕەکانم، گلێنەی هەردوو چاوەکانم، زێدە جەرگی دڵ و جانم، دەستی کرد بە خوێندنی ئەو شەرحە، ئەمجا دەستم کرد بە نووسینی ئەم حاشیە، کە بریتییە لە لێکدانەوەی ئەو شەرحە و بەرانبەرکردنی لەگەڵ سەرچاوەکەی کە شەرحی مەقاصیدە، پەسەندکردن و هەڵبژاردنی ڕای ڕاست، جار وایە شەرحەکەم پەسند کردووە، جاروایە سەرچاوەکەم پەسند کردووە، جاریش وایە نە ئەو و نە ئەم، ڕای سێیەمم هەڵگرتووە، خوای گەورە یارمەتی دام، ساڵی ١٢٧٣ك - ١٨٥٦ز تەواوم کرد، بەدڵی من بوو}.

جگە لەو حاشیە ئەو کتێبانەشی داناون: (إثبات الواجب) و (إثبات المعاد) و (الوجود والعدم).

مامۆستا شێخ وەسیم لە قوتابخانەی (دار الإحسان) لە (سنە) دەرسی دەدا، پاشان بەد بێژ و زمان درێژ زمانیان لێدا، ماوەك لادرا، دوایی گەڕاوە، لەو شوێنە خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆز بوو، تا ساڵی ١٢٧٥ك – ١٨٥٨ز کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی هەبوون:

١. شێخ ڕەزا: ساڵی ١٢٤٨ك – ١٨٣٢ز هاتەدنیا، ساڵی ١٣٢٦ك – ١٩٠٨ز کۆچی دوایی کرد.

٢. شێخ جەلالەدین: ساڵی ١٢٥١ك – ١٨٣٥ز هاتەدنیا، ساڵی ١٢٨٥ك – ١٨٦٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. بنەماڵەی زانیاران ١٤٥.

٢. تأریخ مشاهیر کورد ١/٤١٨.

٣. معجم أعلام الکورد ٥٥٧.

٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٣٦٩ – ٣٧٢.

٥. علماؤنا ٦١٣.

## محەممەد وەهبان دنبەلی (١٥٤١)

ناوی محەممەدە، کوڕی وەهبانە، عەشیرەتی دنبەلی زازایە، زانایەکی فەرموودەناس بووە، فەرمودەی پێغەمبەری (دروودی خوای لێ بێ) لە کومەیلی زیادی نەخعی گێڕایتەوە ئەویش لە ئیمامی عەلی (خ) بیستووە، کەواتە ئەو زانایە کوردە تابیعی تابیعینە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٣٨١.

٢. معجم أعلام الکورد ٦٣٧

## محەممەد وەهەب کفر جەدی (١٥٤٢)

ناوی محەممەدە، نازناوی (ئەبوالمعارف)ە، کوڕی وەهەبی کوڕی عومەری کوڕی ئەبوکەریمەیە، خەڵکی گوندی (کەفرجدیا)یە، نزیك روها و حەڕان، یەکە لەزانایەکانی گەورەی فەرمودە، لەمانگی ڕەمەزانی، ساڵی ٢٠٣ك – ٨١٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ٤/٦٣٦.
٢. اللباب ١٠٣/٣.
٣. معجم البلدان ٤/٤٦٩.

## محەمەد هیبة الله بەندەنیجی (١٥٤٣)

ناوی محەممەدە، کوڕی هەیبەتوالله ی کوڕی ثابیتی (بەندەنیجی)یە، ساڵی ٤٠٧ك – ١٠١٦ز لە (مەندەلی) هاتووتەدنیا، چل ساڵ لە (مەککە)ی پیرۆز خەریکی فەتواو دەرس و فەرمودەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) بووە، بۆیە ناسراوە بە (فقیە الحرم)، زۆر خەریکی خواپەرستی بووە، تەنیا لەمانگی ڕەمەزان سێ عومرەی کردووە، هەزار جار سورەتی (قل هو الله)ی خوێندووە، زانایەکی شەرع زانی مەزهەبی شافیعی بووە، کتێبانی (الجامع) و (المعتمد)ی داناون، ساڵی ٤٩٥ك – ١١٠١ز لە (یەمەن) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٢/١٧٦.
٢. كشف الظنون ١/٥٧٥.
٣. معجم المؤلفين ١٢/٨٩.
٤. هدية العارفين ٢/٧٨.
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٧٠.
٦. طبقات الشافعية الكبرى ٢/٤٧٥.

٧. طبقات الفقهاء ٦٥.
٨. سير أعلام النبلاء ١١/٤٣٢.
٩. طبقات الشافعية /ئەسنەوی ١/٢٠٤.
١٠. المنتظم ١٠/٦٤.
١١. الأعلام ٢/٥٤ /٧/٣٥٥.
١٢. الكامل / پەراوێز ٨/٢١٤.
١٣. تأريخ أربيل ٢/٤٣٨.
١٤. إيضاح المكنون ٢/١٧٣٣.
١٥. الأنساب ١/٤٢٢.

## محەممەد هبەاللە سەلماسی (١٥٤٤)

ناوی محەممەدە، نازناوی (سەدید)ە، کوڕی هبةالله ی کوڕی عبـداللە یـە، خـەڵکی (سەلماس)ە لە ڕۆژهەلاتی (وان)، زانایەکی زۆرزان و بـەتوانا بـووە، لـە فتـوادان شـارەزا بووە، لە ولاتان دەهاتنە لای بۆ وەرگرتنی زانیـاری، چـەند زانـای بـەرز لەسـەر دەسـتی دەرچوون، لەمانگی شەعبانی، ساڵی ٥٧٤ك – ١١٧٩ز لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. وفيات الأعيان ٣/٣٧٢.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٧٣.
٣. مشاهير الكورد وكوردستان ٣٦٠.
٤. معجم أعلام الكورد ٦٣٧.

## محەممەد یاسین ژەنگاری (١٥٤٥)

ناوی محەممەدە کوڕی یاسینی کوڕی عبداللە یـە، سـاڵی ١٣٣٤ك – ١٩١٥ز لـە (سنجار) هاتەدنیا، هەر لەوێ دەسـتی کـرد بەخوێنـدن، پاشـان چـووە لای مـەلا یونسـی بەکری، دوایی چووە (موصل) لای مەلا عبداللە نیعمـە و مـەلا عبـدالغنی جـەبار و مـەلا

عوسمانی جبوری خوێند، دوایی چوە لای مامۆستا بەشیر صەقڤال، ماوە لەخزمەتی تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، پاشان چووە (بەغدا)، کلیة الشریعەی تەواوکرد.

دانراوەکانی:

١. تەفسیری قورئانی پیرۆز.
٢. شەرحی (الفقه الاکبر)ی ئیمامی حەنەفی، ساڵی ١٩٨٩ز لە بەغدا چاپ کرا.
٣. علم أصول الفقة المقبول فی علم الأصول: ساڵی ١٩٨٩ز لە موصل چاپ کرا.
٤. نیل المرام، شرح بلوغ المرام من أدلـة الاحکام: پێنج بەرگە، ساڵی ١٩٨٥ز چاپ کرا.

سەرچاوە: اسهام علماء کوردستان العراق فی الثقافة الإسلامیة ٢٢٧.

## محەمەد یایی (١٥٤٦)

مامۆستا مەلا محەمەد (یایی)، زانایەکی شارەزا بووە لە زانستەکان، بەتایبەت لە حیکمەت و کەلام پسپۆر بووە، دەرسی لەلای مەلا عبدالرحمان ئەفەندی ڕۆژبیانی خوێندووە، هاوچەرخ بووە لەگەڵ محەمەد فەیزی زەهاوی بەغدا و مەلا محەمەد ئەفەندی خەتیّ و مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی کچك مەلای هەولێر، یایی لەمزگەوتی سۆری (مەهاباد) دەرسی دەدا، مەلا عەلی قزلجی یەك بوو لە فەقێیەکانی ئەو لەو کاتە، مامۆستا عبدالکریم (مودەرریس) دەڵێ: {ناوبراو دوایی حاشییان دەینوسی (یا محەمەد) پاشان کورتی کردەوە تەنیا دەینوسی (یا) بۆیە ناوبرا بە مەلا محەمەدی (یایی) چونکە پیتی (یاء)ی زۆر دەنوسی}، کەواتە: (یایی) نیسبەتە وەلای (یا) وەك دەڵێن: خوایی، وەفایی، دارایی، پاشایی.

سەرچاوە: ژیناوەری زانایانی کورد ٢١٩ – ٢٢١.

## محەمەد یەزید روهاوی (١٥٤٧)

ناوی محەمەدە، کوڕی یەزیدی کوڕی سەنانە، خەڵکی (ڕوها)یە، ساڵی ١٣٢ك – ٧٤٩ز هاتەدنیا، یەك بووە لە زانایە دیارەکانی سەردەمی خۆی، ئیمامی ئەحمەدی کوڕی

حەنبەل، حەزی کردووە ببینێ بەڵام ڕێکنەکەوتووە، فەرموودەی لە باوکی مامۆستا گێڕاوەتەوە، ساڵی ٢٢٠ ك – ٨٣٥ز کۆچی دوایی کردووە، دوو کوڕی هەبوو:

١. ئەبوفەروە: فەرموودەی لە باوکی گێڕایتەوە.
٢. ئەبو عەلی: فەرموودەی لە باپیری گێڕایتەوە.

سەرچاوەکان:

١. اللباب ٢/٤٥.
٢. الأنساب ٣/١٢٠ – ١٢١.

## محەممەد یەعقوب سعێرتی (١٥٤٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی یەعقوبی کوڕی عەلی کوڕی تەمیمە، خەڵکی (سعێرت)ە، لە (دیمشق) دانیشتووە، زانایەکی زمان ڕەوان و شاعیر بووە، لە جوانکاری (التضمین) دەستێ باڵا بووە، زاتەکی چاك و داوێن پاك و ڕووخۆش و ڕەشید بووە، ساڵی ٦٨٤ك – ١٢٨٥ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/٣٨٩.
٢. فوات الوفیات ٤/٥٤ – ٦٢.
٣. معجم أعلام الكورد ٦٣٩.

## محەممەد یوسف ئیبن دەواله (١٥٤٩)

ناوی محەممەدە، کوڕی یوسفی کوڕی ئەبولعزی کوڕی عەزیزە، نازناوی شەمسەدینە، ناسراوە بە ئیبن دەواله و ئیبن مورەحەل، خەریکی فەرموودە بووە، سەفەری (دیمشق) و (حەلەب)ی کردووە، لەوێ دەرسی داوە، زانایان مەتحیان کردووە و لێی ڕازی بووینە، ساڵی ٧٣٨ك – ١٣٣٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٤/٣١٦.

## محەممەد یوسف جزیری (١٥٥٠)

ناوی محەممەدە، کوڕی یوسفی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی هبةاللّٰەی جزیرییە، ساڵی ٦٣٦ك – ١٢٣٨ز هاتەدنیا، مەزهەبی شافیعی بووە، بۆ خوێندن چوویتە (میصر)، پاشان چوویتە (دیمشق)،گەڕایتەوە (میصر) لەوێ دەرسی داوە، زانیاری لە قورئانی پیرۆز و ئوصول و دکتۆری هەبووە، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٧١١ك – ١٣١١ز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٤/٣١٥ – ٣١٦.

٢. شذرات الذهب ٦/٤٢ – ٤٣.

٣. معجم أعلام الكورد ٦٤١.

## محەممەد یوسف جزیری (١٥٥١)

ناوی محەممەدە، کوڕی یوسفی کوڕی عبداللّٰەی کوڕی مەحمودە، ساڵی ٦٣٧ك – ١٢٣٩ز لە (جزیرە) هاتەدنیا، زانایەکی شەرع زان و نەحوزان و زمان ڕەوان و شاعیر و نووسەر بووە، بۆ خوێندن چووە (میصر)، دوایی لە (قاهیرە) کرا مودەرریس، ئیسلام و جولەکە و دیان بۆ خوێندن دەچوونەلای، لە مزگەوتی (طولون) وتاری هەینی دەدا، شێخ تەقیەدینی (سوبکی) فەقێی ئەو زاتەیە.

مامۆستا لە (أصول الفقه) و (بەیان) و (مەنتیق) و (طب – دکتۆری) دەستی باڵا بوو، ڕووخۆش و دیمەن جوان و قسەخۆش و ئەخلاق چاك بوو، بە ئیش و کاری خەڵکان زۆر ماندوو بوو.

دانراوەکانی: (شەرحی ئەلفیەی ئیبن مالیك) و (شەرحی التحصیل) و (شەرحی مینهاجی بەیزاوی) و (دیوانی شیعر).

کۆچی دوایی: لە ٦ی ذیالقعدەی ساڵی ٧١١ك – ١٣١٢ز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. طبقات المفسرين ٢/٢٨٣.

٢. طبقات الشافعية/ئەسنەوی ١/٣٨٣ – ٣٨٤.
٣. طبقات الشافعية الكبرى ٥/١٥٤.
٤. كشف الظنون ٢/١٨٧٩.
٥. مشاهير الكورد ٢/١٦٦.
٦. شذرات الذهب ٦/٤٢ – ٤٣.
٧. معجم المؤلفين ١٢/١٢٨.
٨. هدية العارفين ٢/١٤٢.
٩. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٧١ – ٤٧٣.
١٠. بغية الوعاة ١/٢٧٨.
١١. الأعلام ٢/١١٢ /٨/٢٥ /١٠/٢٣٢.
١٢. الدرر الكامنة ٤/٣٠٠.

## محەممەد یوسف حەڕانی (١٥٥٢)

ناوی محەممەدە، کوڕی یوسفی کوڕی عبداللطیفی حەڕانییە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، چوویتە (میصر) دەرسی لەلای عەلی حەسەنی کوردی و چەند زانایان خوێندووە، دەرسی فەرموودەی داوە، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٧٦٩ك – ١٣٦٨ز لە (قاهیرە) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٤/٢٩٨.
٢. شذرات الذهب ٦/٢١٦ – ٢١٧.
٣. معجم أعلام الكورد ٦٣٩.

## محەممەد یوسف ڕوهاوی (١٥٥٣)

ناوی محەممەدە، کوڕی یوسفە، خەڵکی (ڕوها)یە، لە (حەلەب) نیشتەجێ بووە، مەزهەبی حەنەفی بووە، لە (ئەستانە) دانیشتووە، مامۆستا ساڵی ١١٨٥ك – ١٧٧١ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (بيان ما حواه الوصاف من التراكيب العربية) و (شرح قلائد النحور) و (طراز المذهب في الدخيل المعرب) و (نثر الكواكب على نظم الميرزا صائب): تەرجومەیە لە فارسی وەلای عەرەبی.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٢/١٢٥.

٢. هدية العارفين ٢/٣٣٩.

٣. إيضاح المكنون ١/٢١٨.

## محەممەد یوسف گۆرانی (١٥٥٤)

ناوی محەممەدە، کوڕی یوسفی کوڕی عبدالله ی کوڕی عومەری کوڕی عەلی کوڕی خضری کوڕی جەمالی کوردی گۆرانی یە، باوکی هەر سێ خاتوونە زانایەکانە: (فاطیمة) و (ستیتة) و (ئوم حەسەن)، ساڵی ٨٠٠ك – ١٣٩٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الضوء اللامع ١٠/٨٦.

## محەممەد یوسف هەولێری (١٥٥٥)

ناوی محەممەدە، کوڕی یوسفی کوڕی محەممەدی کوڕی قائیدە، خەڵکی هەولێرە، بەڵام لەبەرئەوەی باوکی هاتووچووی (بەحرین)ی دەکرد، لەیەك لەو سەفەرانە خێزانی لەگەڵ بوو، ئەو کوڕە لەوێ خوایدا، بۆیە لەناو خەڵکان ناوبراوە بە (بەحرانی)، زانایەکی زیرەك و زمان ڕەوان و قەڵەم لە کاربووە، ئیبن مستەوفی یەکە لە فەقێیەکانی ئەو زاتە، مامۆستا سەفەری شارەزووری کرد، ماوەك لەوێ ماوە، پاشان چووە (دیمشق)، چەند شیعری لە مەتحی سوڵتان صەلاحەدین و سوڵتان مظفر داناوە.

چەند کتێبی داناون، لەوانە: (حل کتاب اقلیدس) و (دیوان شعر) و (الرسائل).

کۆچی دوایی: شەوی یەك شەممە، ١٣ی ڕەبیعی دووەم، ساڵی ٥٨٥ك – ١١٨٩ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی باشوور بەست لە هەولێر بە خاك سپێردرا، لەوانەیە گۆڕستانی پشت شێخەڵڵا بی، کە ساڵانی ٢٠٠٠ تا ٢٠٠٥ز ناودەبردرا بە بازاڕی لەنگەفرۆشان.

سەرچاوەکان:


١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٥٢ – ٤٦٧.

٢. وفيات الأعيان ٤/١٠٣.

٣. هدية العارفين ٦/١٠١ – ١٠٢.

٤. معجم المؤلفين ١٢/١٣٧.

٥. شذرات الذهب ٤/٢٨٤.

٦. كشف الظنون ١/٨١٥.

٧. غاية المرام ٢٧٥ – ٢٧٦.

٨. الأعلام ١/٢٧٥ – ٧ – ٢٣.

٩. معجم أعلام الكورد ٦٤٠.


**محەممەد یوسف هەولێری (١٥٥٦)**

ناوی محەممەدە، کوڕی یوسفی کوڕی یەعقوبی هەولێرییە، ساڵی ٦٢٤ك – ١٢٢٧ز هاتەدنیا، بۆ خوێندن چووە (دیمشق)، خەریکی خوێندنی فەرموودە بوو، پاشان بووە مامۆستا دەرسی دەداوە، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٧٠٤ك – ١٣٠٥ز لە قادرمەی خانووەکەی کەوتەخوارەوە دەم و دەست گیانی لە دەستدا.

سەرچاوەکان:


١. الدرر الكامنة ٤/٣١٥.

٢. شذرات الذهب ٦/١١.

٣. معجم أعلام الكرد ٦٤٠.

### محەممەد یونس هەولێری (١٥٥٧)

ناوی محەممەدە، کوڕی یونسی کوڕی هەمزەی کوڕی عەبباسی هەولێرییە، زانایەکی بە دین و فەرموودەناس و ڕوولەخوا بووە، دنیاداری نەکردووە، زۆر جۆرە بابەتی زانیوە، ساڵی ٧٤٦ك – ١٣٤٥ز لە تەمەنی هەشتا و چوار ساڵیدا کۆچی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٤/٣١٧.

### محەممەد یونس هەولێری (١٥٥٨)

ناوی محەممەدە، کوڕی یونسی کوڕی محەممەدی کوڕی مەنەعەی کوڕی مالیکی کوڕی محەممەدە، نازناوی (عیمادەدینە)، ساڵی ٥٣٥ك – ١١٤٠ز لە قەڵاتی هەولێر هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی لە (موصل) دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (بەغدا)، شارەزایی پەیداکرد، گەڕاوە (موصل)، لە چەند قوتابخانان دەرسی دەداوە، زانایەکی مەزهەب شافیعی بە توانابوو، لە دوورەوە دەهاتنە لای بۆ فێربوونی زانیاری، ووتارخوێن بوو لە مزگەوتی (المجاهدي)، نورەدین ئەرسەلانی شای (موصل) زۆر حورمەتی دەگرت، لە ٥٩٢ك کرا قازی (موصل)، ساڵی ٦٠٨ك – ١٢١١ز لە (موصل) کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. وفيات الأعيان ٣/٣٨٥.
٢. تأريخ أربيل ٢/٤١.
٣. أربيل في مختلف العصور ٩٤.
٤. أربيل في العهد الاتابكي ٢٨٣ – ٢٨٨.
٥. ژیناوەری زانایانی کورد ٧٣٠.
٦. هدية العارفين ٦/١٠٨.
٧. كشف الظنون ٢/١٦٢٠.
٨. مشاهير الكورد ٢/٩١.

٩. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٦٢ – ٤٦٤.
١٠. شذرات الذهب ٥/٣٤.
١١. معجم المؤلفين ١٢/١٤٣.
١٢. منهل الأولياء ١/٢٠٢.
١٣. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٣٠٠.
١٤. سير أعلام النبلاء ١٢/٥٨٩.
١٥. طبقات الشافعية /ئەسنەوی ٢/٥٦٩.
١٦. درة الحجال في أسماء الرجال ٢/٢٩٨.
١٧. الأعلام ٨/٣٤ – ٢٥٠.
١٨. معجم أعلام الكورد ٥٠٧ – ٦٤٢.
١٩. البداية والنهاية ١٣/٦٤.

## مەحمود ئەبوبەکر ئورمەوی (١٥٥٩)

ناوی مەحمودە، کوڕی ئەبوبەکری کوڕی حامیدی کوڕی ئەحمەدە، خەڵکی (ورمێ)یە، ساڵی ٥٩٤ك – ١١٩٧ز هاتەدنیا، بۆ خوێندن چووە (موصل) دوایی چووە (دیمشق) زانایەکی شافیعی مەزهەب و ئوصول زان و شەرع زان بووە، ناوبراو ساڵی ٦٨٢ك – ١٢٨٣ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (شرح وجيز الإمام الغزالي) و (لوامع الاسرار في المنطق) و (تلخيص الأربعين (لباب)) و (شرح الإشارات) و (التحصيل: مختصر المحصول).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٢/١٥٥.
٢. كشف الظنون ١/٢٦١.
٣. هدية العارفين ٢/٤٠٦.

## مەحمود ئەبوبەکر ئورمەوی (١٥٦٠)

ناوی مەحمودە، کوڕی ئەبوبەکری کوڕی محەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی حوسێنی خەڵکی (ورمێ)یە، ساڵی ٦٤٢ك – ١٢٤٤ز هاتەدنیا، لە چەند وڵاتان گەڕا تا فێری زانیاری بوو، لە تەصەووف شارەزابوو، ساڵی ٧٢٢ك – ١٣٢٢ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد، چەند کتێبی داناون، لەوانە: (ذيل النهاية لابن الأثير) و (مختصر شرح السنة للبغوي) و (تهذيب المحكم).

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٤/١١٤ – ١١٥.
٢. كشف الظنون ٢/١٩٨٩.
٣. معجم المؤلفين ١٢/١٥٦.

## مەحمود ئەبوبەکر جزیری (١٥٦١)

ناوی مەحمودە، کوڕی ئەبوبەکری کوڕی محەممەدی کوڕی عوسمانە، ساڵی ١٠٧٦ك – ١٦٦٥ز لە (جزيره) هاتەدنیا، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد و لەبەری کرد، پاشان چووە (قودس)ی پیرۆز، لەوێ بە خزمەت پیاوەکی خوایی گەیشت ناسرابوو بە (محەممەد زەمان سندی)، ماوەك لەگەڵی ژیا، چەند کەراماتی لێ دیت، لەگەڵی چووە سەفەری حەج، تەریقەتی نەقشبەندی لێ وەرگرت، پێی گۆت: بگەڕێوە وڵاتی خۆت، پێنج ساڵ خەلوە بکێشە، بەربەرەکانی ئارەزوی نەفس بکە ئەمجا وەرەوە، گەڕاوە فەرمانی شێخی جێبەجێ کرد، دووبارە چۆوە حەج بە خزمەتی گەیشتەوە، ئەمجارە ڕەوانی دیمشقی کرد، بۆ ئەوێ چوو، بە دوو مندالەکانی نارد، ئەوانیش چوونە لای، لەوێ دەستی کرد بە دەرسدانەوە و ئامۆژگاری خەڵکان.

مامۆستا لە زانستە عەرەبییەکان و زیج و حروف و ریازییات شارەزا بوو، زاتەکی بەدین و خواناس و خواپەرست بو، بەردەوام لە سودی گەل بوو.

سەرچاوە: سلك الدرر ٤/١٢٦ – ١٢٧.

## مەحمود ئەحمەد دێلژەیی (١٥٦٢)

ناوی مەحموده، کوڕی مەلا ئەحمەده، لە گوندی (دێلژە) لە جێگای باوکی مەلا بوو، دەرسی دەدا، ساڵی ١١٩٩ك – ١٧٨٤ز شاری سلێمانی دروست کرا، مامۆستا لەوکاتە باری کرد، هاتە مزگەوتی گەورەی سلێمانی، کرا مەلا، ساڵی ١٢٣٩ك – ١٨٢٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. تأريخ مشاهير كورد ١/٣٠٢ – ٣٠٣.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٤٦٠ – ٤٦١.

## مەحمود ئەحمەد شارەزوری (١٥٦٣)

ناوی مەحموده، کوڕی ئەحمەدی کوڕی حوسێنی شارەزوورییە، نازناوی (صاحيب)ە، زانایەکی فەرمودەناس و سۆفی بووە، برای مەولانا خالیدی نەقشبەندییە، کە مەولانا سەفەری حیجاز و هیندی کرد، ئەو زاتەی لە جێی خۆی دانا بۆ دەرسدانەوە و وسەرپەرشتی ماڵ و منداڵەکانی، پاشان ئیجازەی پێدا، دوای سەفەری مەولانا بۆ (دیمشق) سوڵتان عبدالمجیدی عوسمانی شێخاتی و خەنەقا و مزگەوتی سلێمانی پێ سپارد، مریدی زۆر بوون، سوودی زانیارییان لێ وەردەگرت، ساڵی ١٢٨٣ك – ١٨٦٦ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد، بەو بۆنەیە عبدالقادر نەبەهانی، دەڵێ:

عيون العلا تبكي على فقد محمود     هو (الصاحب) المعروف بالفضل والجود.

شقيق خيار الدين مولانا (خالد)     مجدد هذا العمر من غير ترديد

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٦٩٢ – ٦٩٣.

## مەحمود ئەحمەد عەینتابی (١٥٦٤)

ناوی مەحموده، کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەسەنی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسماعیل (مظفرالدين)ی حەنەفییە، خەڵکی (عەینتابی) کوردستانی تورکیایە، دەوری ساڵی ٨١٢ك – ١٤٠٩ز لە (قاهیرە) هاتووتەدنیا، باوکی دایکی (شە

– شانە) فرۆش بووە، بۆیە ناسراوە بە: (ابـن المشـاط)، دەسـتی کـرد بـە خوێنـدن، وردە کتێبەکانی لەبەرکردن، ماوەك خەریکی شەریعەت بوو، پاشان دەستی بە نەحو کرد، چووە (دیمشق) زۆرجار چووە (حـەج)، دەچـووە غـەزا، حـەزی لـە قۆشمـە و تیرەنـدازی بـوو، دواعەمری وازی لە هەموو شت هینا، تەنیا ڕوویدا دکتـۆری، لـە مـانگی مـەولود سـاڵی ٩٠٢ك – ١٤٩٦ز لە (قاهیرە) کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (شرح الوجیز) و (شرح اللمعة) و (شرح النقایة).

سەرچاوەکان:

١. البدر الطالع ٢/٢٩٢ – ٢٩٣.

٢. معجم المؤلفین ١٢/١٤٥.

٣. معجم أعلام الکورد ٦٩٢.

## مەحمود ئەحمەد کاکۆزەکەریا (١٥٦٥)

نـاوی مـەحمودە، کـوڕی شـێخ ئەحمـەدی کـوڕی شـێخ یەعقوبـە، لـە بنەماڵـەی شێخەکانی (کاکۆزەکەریا)یە، دەستی کرد بە خوێندن، گـەڕا لـە چـەند شـوێنان، پاشـان چووە (تورجان) لای مەلا عەلی، کۆتایی بە خوێندن هینا، لە گوندی (بێلوار) بـووە مـەلا دەرسی دەداوە، دوایی باری کرد بۆ (سنە) لە مزگەوتی (حبیـب الله) کـرا ووتـارخوێن و دەرس بێژ، لە ٢٩ی شەعبانی، ساڵی ١٣٢٤ك – ١٩٠٦ز لە (سنە) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (پیرغەریب) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: تأریخ مشاهیر کورد ٢/٩٨ – ٩٩.

## مەحمود ئەحمەد مەرعەشی (١٥٦٦)

ناوی مـەحمودە، کـوڕی ئەحمـەدی کـوڕی مـەحمودە، خـەڵکی (مەرعـەش)ە، لـە (حەلەب) دانیشتووە، ساڵی ١٢٥١ك – ١٨٣٥ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبـی: ڕسـتە و زنجیرەی بانگی داناوە تا دەچێتەوە سەر خۆشەویست (درودی خوای لێ بی).

سەرچاوە: معجم المؤلفین ١٢/١٤٩.

## مەحمود ئەحمەد نەقشبەندی (١٥٦٧)

ناوی مەحمودە، کوڕی ئەحمەدی نەقشبەندییە، دەوری ساڵی ١٢٩٠ك – ١٨٧٣ز هاتەدنیا، خەڵکی گوندی (قەرەکۆی) ڕۆژهەڵاتی کوردستانی تورکیایە، لە وڵاتی خۆی زانستە عەرەبییەکان و شەریعەت و مەنتیق و بەلاغە و ئوصول و ئادابی خوێند، پاشان لەبەر ستەمکاری مصطفا کەمال پاشای ئەتاتورك نەحەواوە، ئاوارەبوو بۆ (سوریا)، ماوەك لە (دیمشق) خەریکی خوێندن بوو، ئیجازەی لە شێخ بەدرەدین حەسەن وەرگرت، هەروەها تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ محەمەد (ضیاءالدین) وەرگرت، ئەویش لە شێخ فتح الله ی وەرقاسی، ئەویش لە شێخ عبدالرحمانی باوکی، ئەویش لە شێخ صبغةالله ئەرقاسی، ئەویش لە شێخ طاهای نەهری، ئەویش لە مەولانا خالیدی شارەزوری.

ناوبراو لە (دیمشق) دەستی کرد بە خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، مریدان کۆمەل کۆمەڵ لە تورکیا دەهاتنە خزمەتی، زاتەکی ڕووخۆش و ودڵپاك و خۆشەویستی خەڵکان بوو، ساڵی ١٣٧٢ك – ١٩٥٢ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: نثر الجواهر والدرر ٢/١٥٤٦.

## مەحمود ئەفەندی ئامێدی (١٥٦٨)

ئەو زاتە لە نەوەکانی مەلا یەحیای مزورییە، پاش تەواوکردنی قۆناغەکانی خوێندن چووە (کۆیە) لای جەنابی مەلا عبدالله ی جەلی زانستەکانی تەواوکردن، ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (ئامێدی) لە قوتابخانەی (جدیدە) کرا مودەرریس، لەو دەڤەری ناسرابوو بە مرۆڤەکی چاك و دڵپاك، بۆ چارەسەری کێشەکان تەنیا هانایان دەبردە بەر ئەو، بەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، تا لە بەرواری ١٣٢١ك – ١٩٠٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: أسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٣١.

## مەحمود ئەمین (بێخود) (١٥٦٩)

ناوی مەحمودە، کوڕی مەلا ئەمینی موفتی کوڕی مەلا ئەحمەدی چاوماری کوڕی مەلا مەحمودی کوڕی مەلا ئەحمەدی دێلێژەیی یە، ساڵی ١٢٩٦ ك - ١٨٧٩ز لە سلێمانی هاتەدنیا، بۆ خوێندن چووە حوجرەی فەقێیان، دوای کۆچی دوایی باوکی ساڵی ١٣١٥ك - ١٨٩٧ز لەگەڵ مەلا عبدالعزیزی برای بۆ خوێندن چووە (بیارە) لای مەلا قادری گەورە، هەر لەوێ پەیوەندی تەریقەتی نەقشبەندی لەگەڵ شێخ بەستا، لەگەڵ برای چوونە (پێنجوێن) لای مەلا عبدالرحمان، مەلا عبدالعزیزی برای ئیجازەی وەرگرت، لە جێگای باوکی لە سلێمانی دانیشت، بێخودیش خەریکی ئیش و کاری ماڵ بوو، ناوە ناوەش لەگەڵ مەلایەکان گفتوگۆی زانست و شەریعەتی دەکرد.

ساڵی ١٣٦٦ك - ١٩٤٦ز کاکی کۆچی دوایی کرد، (بێخود) کرا جێگری ئەو بۆ دەرسدانەوە و فەتوادان، ناوبراو جگە لە مەلایەتی و صۆفیاتی، شاعیرەکی چاك بوو نازناوی (بێخود)ە، شیعری کوردی و فارسی زۆرن، دیوانی شیعری ساڵی ١٩٧٠ز چاپ کرا، نمونەی شیعری:

لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە تۆراوە دڵی من
هەرچەند ئەگەڕێم بێ سەروشوێن ماوە دڵی من
ئاخۆ بە چ شاخێکەوە گیرساوە دڵێ من
یاخۆ بە چ داخێکەوە سوتاوە دڵی من

ئەو هەمدەمی غەمخوار و نەدیمی منە یارەب
ئەو مەحرەمی ئەسرار و قەدیمی منە یارەب
ئەو گەوهەری شەهوار و یەتیمی منە یارەب
کەوتووتە چ بەحرێکەوە خنکاوە دڵی من

ئەو سینە لە غەش خالییە ئەو بێ ڕق و کینە
ئەو خادیمی شەرعی نەبەوی میللەت و دینە

مەعلوم چووە بۆ خزمەتی سالاری مەدینە

وامزانی کە فەوتاوە، نەفەوتاوە دڵی من

زاتێکی وەهای گرتووە، ڕوحم بە فیدای ئەو

شاهان شەو و ڕۆژ دەبنە قەدەم بۆسی گەدای ئەو

(بێخود) مەبە ئیتر بە ئومێد و بە تەمای ئەو

نایێتەوە لات گەر سەری داناوە دڵی من

کۆچی دوایی: لە بەرواری ٢٥/٨/١٩٥٥ز لە شاری سلێمانی کۆچی دوایی کرد، مامۆستا عبدالکریم مودەڕریس کە برادەری خۆشەویستی بوو، بەوبۆنەیە هۆنراوەکی نووسیوە، دەڵێ:

بێ خودە، یا با خودە، بێ هۆشە یا هۆشیارە دڵ

نوستووە چاوی لە خەودایە، وەیا بێ دارە دڵ

ئەم سەعاتە ڕۆژە یا شەو، بۆچی بەرچاوم ڕەشە

یادەمی هیجرانە بۆیە، عاجز و غەمبارە دڵ

دوکەڵە هەستا لە سینەم، تاڵی کرد سەفحەی جیهان

یا گڕی ئاگری جەفای لێ بەربووە و پڕ نارە دڵ

یا وەکو بیستومە (بێخود) مەنبەعی عیلم و ئەدەب

ئەو عەزیزی میسری ڕوحە، لەو پڕ و سەرشارە دڵ

وەختێ کۆچی بەست و ڕووی کردە بیابانی بەقا

یانی لەو دارولفەنای خاوەن جەفا بێزارە دڵ

کۆچی بێ وادە لە زومرەی یاوەران و دۆستان

یانێ ناچاری قەزای فەرمانی بێ ئینزارە دڵ

ناوی (نامی) تۆیە وێردی دایمی (عبدالکریم)

وەقفی فیکری تۆیە خاتر خاوەنی ئەسرارە دڵ

سەرچاوەکان:

١. یادی مەردان ٢/٦٣٣ – ٦٣٨.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٦٣ – ٥٦٤.

٣. بنەماڵەی زانیاران ٤٦٤ – ٤٦٧.

٤. گوڵزاری کوردستان ١٧٨.

٥. معجم أعلام الكورد ٧٠٣.

٦. مێژووی ئەدەبی کوردی ٦/٧٣ – ٩٢.

٧. أعلام كورد العراق ٧٨٦ – ٧٨٨.

## مەحمود ئەمین ڕاجی (١٥٧٠)

ناوی مەحمودە، کوڕی ئەمینی کوڕی مەحمودە، ساڵی ١٨٩٤ز لە (کەرکوك) هاتەدنیا، لە مزگەوتی نائیب دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادر شارەزوری، دوایی چووە سلێمانی، پاشان چووە (کەرکوك) لای مەلا مەحمودی مەزناوەی، ماوە تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

بووە مەلا لە گوندی (سۆربەش)ی خدری پاشا، دوایی باری کرد چووە (هەڵەبجە)ی گەورە، سی ساڵان لەوێ مەلا بوو دەرسی دەداوە، پاشان گەڕاوە (کەرکوك)، هەر لەوێ ساڵی ١٩٦٢ز کۆچی دوایی کرد، لەسەر وەسیەتی خۆی لە هەڵەبجە لە تەك شێخ مەعروف شێخ عبدالکریم بەرزنجی - برادەری خۆی - بە خاك سپێردرا.

خووڕەوشتی: زاتەکی بەدین و بێفیزبوو، بە قەناعەت بوو، خەتی خۆش بوو، چوار زمانی دەزانی، کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی.

دانراوەکانی:

١. چەند حاشیە لەسەر (بورهانی گەلەنبەوی).

٢. نامیلکەی حەج بە کوردی: ساڵی ١٩٣٦ز بۆ باوکی مەلا ئەنوەری سعاتچی داناوە، لە کۆتاییدا بە عەرەبی دەڵێ: {تم و بالخیر عم، علی ید مؤلفه محمود الراجی من الله، لأجل قریبی وحبیبی: الملا عبدالله في ٢٤ شوال سنة ١٣٥٤هـ}.

دەقی ئەو نامیلکەیە لەلای مەلا ئەنوەرە، تا ئێستا دەستنووسە و چاپ نەکراوە خوابکا دەستێکی پیرۆزی خێرخوازی بگاتێ، چاپ بکرێ و بەلاوبکریتەوە خۆ بەرهەمی بەنرخمان زۆرە، بەڵام ئەگەر فریا نەکەوین (مشك) دەیانخوا، (مۆرانە) دەیانرزێنی، (تۆزوبا) دەیانفرێنێ، هەروەك چەندین دەستنووسی بەنرخ بەم شێوەیە فەوتاوە.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## مەحمود بادینی (١٥٧١)

مامۆستا مەلا مەحمود بادینی، یەك بووە لە مەلایە چاکەکانی سەردەمی خۆی دەرسی بە مەلا خەلیلی سعێرتی داوە، لە تەفسیری قورئانی پیرۆز دەستی باڵا بووە تەفسیری سورەتی (فاتیحە)ی کردووە بە پیتی بێ نوقتە، ئەوەش کارەکی ئاسان نیە، بەڵگەی چازانی و چالاکییە، لە ١٢٠٢ك – ١٧٨٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. أسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامیة ١٥٣.

٢. مشاهیر الکورد ٢/١٨٧.

٣. غایة المرام ١٠٨.

## مەحمود بایەزیدی (١٥٧٢)

مامۆستا مەلا مەحمود، ساڵی ١٢١٢ك – ١٧٩٧ز لە شاری (بایەزید)ی ئەحمەد خانێ هاتەدنیا، لە شارەکەی خۆی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (تەبرێز) فێری عەرەبی و فارسی و تورکی بوو، ساڵی ١٨٥٦ز چووە (ئەرضرۆم)، زانایەکی زمان رەوان و بە توانا بوو، لە وێژە و رێزمان و مێژوو شارەزابوو، زۆر مەراقی کتێبە دەستنووسەکان بوو، لێکۆڵینەوە و تەرجومەی دەکردن، بەلاوی دەکردنەوە.

چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. عادات و رسوماتنامەی ئەکرادییە: ساڵی ١٨٥٨ز لە (ئەرضرۆم) تەواوی کرد.

٢. لەیلا و مەجنون: ساڵی ١٨٥٨ز لە (ئەرضرۆم) تەواوی کرد.

٣. تحفة الخلان في ئەزمانی کوردان: ساڵی ١٨٦٦ز تەواوی کرد.

٤. نامیلکەی ڕێزمانی کوردی: ساڵی ١٨٦٧ز تەواوی کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الکورد ٦٨٦ – ٦٩٠.

## مەحمود بەربیانی (١٥٧٣)

مامۆستا مەلا مەحمود یەکە لە مەلایە چاکەکانی سەردەمی خۆی، خەڵکی گوندی (بەربیان)ە، ڕۆژئاوای کۆمەڵگای (بەستۆرە)، مەلا بوو لە گوندی (دێمەکار).

چەند فەقێی دەرسدەدا، لەوانە: مەلا صادقی فەرهادی، مەلا سەعیدی فەرهادی مەلا خضری مەلەکاغەی، مامۆستا شارەزایی تایبەتی هەبوو لە کتێبی (جامی)، پاشان لەگەڵ فەقێیەکان باری کرد، بۆ (قەشقە)، مامۆستا خەتێکی خۆشی هەبوو، چەند کورتە حاشیەی لەسەر شەرحی ئیستیعارە و کەمالی صەرف و چەند کتێبانی تر هەیە، کۆچی دوایی کرد، مەلا ئەبوبەکری کوڕی لە پاش بەجێما، ئەویش ساڵی ٢٠٠١ز لە گوندی (شێخەشل) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الإکلیل في محاسن أربیل ٣٣٥.

## مەحمود حەسەن بەردەری (١٥٧٤)

ناوی مەحمودە، کوڕی حەسەنی کوڕی خالیدی کوڕی حامیدی کوڕی عەلی کوڕی جەمالە، خەڵکی (بەردەر)ی ناوچەی (بێتواتە)یە، زانایەکی شەریعەت بووە، فەتاوای فارسی دانا، پێشکەشی کرد بە مەلیک (أسد الملك) زیرەك کوڕی هلاجونی کوڕی هۆلاکۆی تەتەر، ئەو هۆلاکۆیە بوو هێرشی دڕندانەی هینا سەر وڵاتانی ئیسلام، حکومەتی عەبباسی ڕوخاند، (بەغدا)ی داگیرکرد و تارانی کرد، کتێبەکانی ئاینی بەشێك سووتاند و

بەشێکی ئاوێتە ناو ڕوباری (دیجلە)، وە چەند ساڵ حوکمی موسولمانانیان کرد، پاشان منداڵەکانی خۆیان موسولمان بوون.

سەرچاوە: بوژاندنەوە ٥/١٨١ - ١٨٦.

## مەحمود حوسێن ژەنگاری (١٥٧٥)

ناوی مەحمودە، کوڕی حوسێنە، نازناوی (ئەبولقاسمە) ناسراوە بە (رکن الدین)، خەڵکی (ژەنگار)ە، ساڵی ٦٤٠ك - ١٢٤٢ز کۆچی دوایی کرد، کتێبی (نشر المثل السائر وطي الفلك الدائر)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. کشف الظنون ٢/١٥٨٦.

٢. هدية العارفين ٢/٤٠٥.

٣. معجم المؤلفين ١٢/١٥٩.

٤. تأريخ مشاهير كورد ١/٧٩.

٥. معجم أعلام الكورد ٦٩٣ - ٦٩٤.

## مەحمود حەمدی مەرعەشی (١٥٧٦)

ناوی مەحمودە، کوڕی داودە نازناوی (حەمدی)یە، خەڵکی (مەرعەش)ە، لە (دیمشق) دانیشتووە، چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. بلغة المريد في الفقه والتوحيد: ساڵی ١٣١٢ك لە دیمشق چاپ کرا.

٢. تحفة الإخوان على نصيحة الخلان.

٣. تحفة الناسك في المناسك.

٤. نيل الأرب في معرفة الأدب.

سەرچاوە: معجم المؤلفين ١٢/١٦٠.

## مەحمود خورتی ( ١٥٧٧ )

مامۆستا مەلا مەحمود، ناسراوە بە مەحمودی کوردی، خەڵکی گوندی (خورت)ە، سەر بە قەزای (عێن سفنیٚ)، پاش تەواوکردنی خوێندنی چووە (موصل)، لەویٚ نیشتەجیٚ بوو لە مزگەوتی (عومەری) دەرسی دەداوە، دەستی شیعری هەبوو، دوای ساڵی ١١٦٠ك – ١٧٤٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: منهل الأولیاء ٢/٢٧٦.

## مەحمود سەعید حەفید ( شێخ مەحمودی حەفید ) ( ١٥٧٨ )

ناوی مەحمودە، کوڕی شێخ سەعیدی کوڕی شێخ محەممەدی کوڕی کاك ئەحمەدی شێخی کوڕی شێخ محەممەد مەعروفی نۆدەیی یە، (مەلیکی کوردانە)، ناسراوە بە: (حەفید) لەبەر ئەوەی باوکی نەوەی کاك ئەحمەدی شێخە، ساڵی ١٢٩٨ك – ١٨٨١ز لە گەڕەکی (کانیسکان) لە سلێمانی هاتەدنیا.

خوێندنی: قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، چەند کتێبی سەرەتایی تەواوکردن، ماوەك چووە مزگەوتی گەورە لای مەلا عبدالله مەعروف مەریوانی خوێند، ساڵی ١٨٩٨ز لە خزمەت باوکی چووە (ئەستەمبۆڵ)، ماوەك ماوە لەویٚ، گەڕاوە سلێمانی فێری زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی بوو.

شۆڕشەکەی: لەبەرواری ١٩١٨/١٠/١ز شێخ مەحمود لەلایەن ئینگلیز کرا حاکمی کوردستان، چەند بەڵێنیان پێدا کە یارمەتی بدەن، پشتگیری بکەن، دوایی پاشەکشەیان کرد، پاشگەزبوونەوە، ویستیان لە کوردستانی دەربکەن، ئەویش سەری بۆ شۆڕنەکردن، بانگەوازی کوردانی کرد، بۆ سازدانی شۆڕش و ئازادکردنی کوردستان دژی ئینگلیزەکان.

لەلایەکی ترەوە (مەحمودخان دزلی) لەشکرێکی چەکداری چاپووکی هەورامی ناردە سلێمانی بۆ یارمەتی شێخ، بەناوی زیارەتی مەرقەدی کاك ئەحمەدی شێخ چوونە ناو شاری سلێمانی، ئینگلیزەکان کە وایان زانی لەشکریان ناردە سەر مەحمودخان، بەڵام

شکان و هیچیان پێ نەکرا، لە ٢١/٤/١٩١٩ز سلێمانی ئازادکرا، لەشکری ئینگلیز هەلاّتن، تا (دەربەندی بازیان) خۆیان نەگرتەوە، لەوێ چەقین یارمەتی زۆریان بۆهات: لەشکر و چەك و تەقەمەنی و تۆپ و تەیارە، شێخ تووشی جەنگێکی توند و تیژ هات، خۆی لەسەر (بەردەقارەمان) شەڕی دەکرد و سەنگەر و بۆسەی بۆیان دادەنا بەداخەوە، بە کەسەرەوە لە ٩/٦/١٩١٩ز لەسەر ئەو بەردە بە دەستی چەپەڵی ئەوان، بریندار کرا و دەستگیرکرا، لە ٢٥/٧/١٩١٩ز بڕیاری لەسەردانی دەرچوو، بەلاّم جێبەجێ نەکرا و دواخرا، لە ١٩٢٢ز دووریان خستەوە بۆ (کوێت)، لەوێ بۆ (هیندوستان)، پاشان گەڕاندیانەوە بۆ (کوێت)، ماوەك لەوێ ماوە، گەڕاندیانەوە بۆ (بەغدا) بەم بۆنەیە (بێخود) دەڵێ:

عومرێکە لە بۆ کوشتنی دەججاڵی حەسودان

هەر مونتەزیری عیسەیی دەورانی کووەیتم

عومرێکە دەناڵم بە غەمی تۆوە لە (کەرکوك)

دایم وەکو نەی سینە پڕ ئەفغانی کووەیتم

واتێمەگە دورم لەتۆ، ئەی ساحیبی خاتەم

هەر هودهودەکەی بەزمی سولەیمانی کووەیتم

خەڵقینە لەبەر گەوهەری تاجی سەری کوردە

قوربانی موحیتی عەرەبستانی کووەیتم

هەرچەند لە زیندانی فیراقا وەکو (بێژەن)

بیللا بە تەمای (ڕۆستەمی) داستانی کووەیتم

عاجز مەبە (بێخود) کە ئیشەڵڵا وەکو یەعقوب

نەزدیکە ویساڵی مەهی کەنعانی کووەیتم

پاشان ئازادکرا، بەرەو سلێمانی گەڕاوە، لە ٢١/٩/١٩٢٢ز لە شاری (کفری) دابەزی پێشوازییەکی چاکیان لێکرد، لە ٣٠/٩/١٩٢٢ز لە سلێمانی دابەزی دووبارە

کراوە (حاکم)، لە ٢٢/١٢/١٩٢٢ز ئینگلیز و حکومەتی (عێراق) بڕیاریان دەرکرد، بە دامەزراندنی حکومەتی کوردی لەناو سنوری (عێراق)، بەو مەرجە نوێنەری خۆیان بنێرنە (بەغدا) بۆ ڕێکخستنی کاروباری (ئابووری) بەڵام شێخ زۆری خەفەت لە زگی خۆی نابوو، بە فرسەتی زانی لەو کاتە کورد دەربهێنێ لەژێر چەپەڵۆکی بێگانە، بۆیە لە خۆیەوە لەیەك لاوە بانگەوازی حکومەتی کوردی کرد، ناوی خۆی نا (مەلیکی کوردان)، شاری (موصل)ی دانا بە خاکی کوردستان.

کابینەی یەکەمی حکومەتی کوردی بەم شێوەیە پێکهینا:

١. حوکمدار: شێخ مەحمود حەفید.
٢. سەرۆك وەزیران سوپاسالار: شێخ عبدالقادری برای.
٣. وەزیری ناوەخۆ: شێخ مەحمود غەریب.
٤. وەزیری زانستی: میر لیوا مصطەفا پاشا.
٥. وەزیری شەرع و عەدلی ئیسلامی: عەلی ئەفەندی قەرەداغی (ابن الخیاط)
٦. وەزیری باج: ئەحمەد بەگ فەتتاح بەگ.
٧. وەزیری ئاسایش: سەید ئەحمەد بەرزنجی.
٨. وەزیری دارایی: عبدالکریم ئەلەکە.
٩. وەزیری گومرگ: حەمدی صاحێب قڕان (شاعیر)
١٠. پشکێنەری گشتی: میر لیوا صەدیق پاشا.

جا لە هەموو لاوە دەنگی خۆشی و ئازادی بەلاوبۆوە، پیرۆزبایی لە حکومەتی نوێ دەکرا، قەڵەمی نووسەران کەوتەکار بۆ پێداهەڵگۆتن، بەو بۆنەیە، ئەحمەد (فەوزی) شاعیر، دەڵێ:

دەفعەیێ تر ئیستیلا نابێ، بەسەر ئەم مولکەدا

عەهدی شاهی نەوجەوانە و شا سەلاحەددینە دەی

وا لەسایەی ئاسەفی دەورانەوە ئیقبالی کورد

عالییە پرتەو فشانە، قادیرە بۆ کوللی شەی

بێ وەلی عەهدت تەماشاکە و مەلیك ئەم شاهە بێ

زوبدەیی ئالی حوسێن و نوتفەیی مەحبوبی حەی

گەر کەسێ بێتو خەیالی بەد بەدلیا تێپەڕێ

وەك ئەبوجەهلی ئەزانم، جێگەیی ئەو وێڵە وەی

تا ئەبەد یارەب بمێنێ ئەم جەلال و حیشمەتە

ئایەتی ﴿انا فتحنا...﴾[1] بێ موعینی شاهی کەی

هەروەها مەلا ئەحمەدی دێلژەیی دەڵێ:

ئەرشەدی ئەولادی حەیدەر شێری یەزدانە مەلیك

زومرەیی ساداتە نەجم و ماهی تابانە مەلیك

سەفحەیی تەئریخی قەومی کورد دەبێ ڕەنگین بـێ

چونکە ئەمڕۆ وەك سەلاحەددین حوکمڕانە مەلیك

تاجی کەیخوسرەو چ بوو، یا ئەفسەری قەیسەر چییە؟

تاجی فەخری عیززەتە ئەمڕۆ لە کەیوانە مەلیك

جەنابی شێخ مەحمود خۆی شاعیرەکی چاك بووە، نازناوی (نوربەخش)ە، دەڵێ:

دڵ لە بەندی سینەدا دووبارە واوەیلا ئەکا

(نوربەخشی) ناسرەوێ مەیلی شەڕ و غەوغا ئەکا

ئینتیقامی قەومی لێقەوماو بە حەق داوا ئەکا

ڕۆژ و شەو فیکرم لە دنیادا، عیلم بەرپا ئەکا

تیغی شیرم ئارەزوی صەیدی شکاری شا ئەکا

---

[1] انا فتحنا لك فتما مبينا....، سورەتی الفتح اية – ١ –.

سەیری دوشمن کەن بە فیکری خامەوە بۆتە تەرەف
بۆ شکاری شێری شەرزە، پیرە ڕێوی هاتە صەف
نیشتمانی پاکی بێ کەس دیوە بۆیە کەوتە کەف
وام لە مەیدانی شەجاعەتدا موباریز کوا ئەسەف
سەفدرِی ڕۆژی وەغای (تابین)ە، داوا ئەکا
دەست بە دەست بە یەکتر بدەن ئەی لاوەکانی مەرد و قۆز
تاکو کەی دوشمن لەناومانە، ئەبێتە گورگی هۆز
بێن ببینە پشتیوانی یەکتر و بیکەینە تۆز
دەست بە داوێنی خوداوە بگرین و بگرین بەسۆز
تاکو دوشمنمان لە جەنناتولئیرەم بەرپا ئەکا
نامەوێ ژینی ئەسارەت بەسمە عومری گومرەهی
نایخەمە سەر خۆم بە دەستی موددەعی تاجی شەهی
قەت بە ئەمری دوشمنانم نامەوێ فەرمانڕەهی
نامەوێ تەختی کەی و بەختی جەم و شاهەنشەهی
تیشنەیی خوێنی عەدووم و بۆ حقوقی وائەکا

ئینگلیزەکان کە ئازادی کورد یان بەچاوی خۆیان دیت، لە داخان چاویان چووە پشتی سەر، دڵتەنگ بوون، نارەحەت بوون، کێچیان کەتە کەوری، دەستیان کرد بە بۆمبارانی شاری سلێمانی هەروەها لە ٤/٣/١٩٢٣ز ١٨ تەیارەی جەنگییان ناردەسەر، شێخ لە ١٩/٧/١٩٢٣ز سلێمانی بەجێهێشت، شەڕ درێژەی پێدا، بەرەبەرە لەشکری شێخ زەعیف دەبوو، کوردەکان و سەرۆك هۆز و عەشیرەتەکان جودا دەبوونەوە، ئینگلیز بە پلە و پایە و بە پارە خەڵکی بۆ خۆی ڕاکێشا، شۆڕشەکە کزبۆوە، ساڵی ١٩٢٦ز کۆتایی بە حکومەتەکە هات، سلێمانی و کوردستان گەڕاوە ژێر دەستەڵاتی حکومەتی (عێراق)، شێخ لە گوندی (دارکەلی) سەر بە (بازیان) نیشتەجێ بوو.

کۆچی دوایی: شەوی ١٩٥٦/١٠/٩ز لــە نەخۆشــخانەی حەیدەرییــەی بەغـدا، ماڵئاوایی یەکجاری لە دۆست و برادەرانی کورد و کوردستان کرد، ئەو هــەموو خــەم و خەفەت و پەژارەی لەگــەڵ تەنــە پیرۆزەکــەی، بــردە ژێــر خاکەکــەی هــۆدەی مزگــەوتی گەورەی سلێمانی خزمەت کاك ئەحمەدی شێخی بــاپیری، کــوردیش لــەوێ ڕۆژێـوە هــەر فرمێسکان دەبارێنن وەکو باران، (کاوێس ئاغا)ش لاوکان و حەیران دەڵێ، گاز دەکـا بــە سێ دەنگان: هاوارە منۆ هاوارە منۆ کورد خائینۆ کورد خائینۆ....

حەمدی شاعیریش دەڵێ:

وەك (مەدینە) بێ نەبی بێ، یا (نەجەف) بێ، بێ عەلی
شاری (غەزنە)[1]ش ئێستە بێ مەحمودە وەك (داریکەلی)[2]

سەرچاوەکان:


١. ژیناوەری زانایانی کورد ٦٩٥.
٢. شۆڕشەکانی کورد ٧٨ – ١٤٧.
٣. تأریخ مشاهیر کورد / فارسی /٣/٥٩٧ – ٦١٥.
٤. الأعلام ٢/١٧ /٧/٣٢٦.
٥. بنەماڵەی زانیاران ٣٥٤.
٦. تأریخ السلیمانیة ٢١٩ – ٢٢٤.
٧. مێژووی ئەدەبی کوردی ٥/٣٩ تا ٣٠٥ /٦/١٧٣ – ١٨٣.
٨. الأکراد في بهدینان ٧٩.
٩. شۆڕشی ئیبراهیم خان دەلۆ ١٥٨ – ١٦٠.
١٠. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٧/٢١٧ – ٢١٨.


[1] غەزنە: شاری سولتان مەحمودە

[2] دوای بەرپابوونی شۆڕش، شێخ لەو شوێنە نیشتەجێ بووە.

١١. نوربەخش ٩ — ١٠.
١٢. معجم أعلام الكورد ٦٤ تا ٧٢٠.
١٣. أعلام كورد العراق ٥٩٤ تا ٨٠٢.

**مەحمود شەمسەدین کوردی (١٥٧٩)**

ناوی مەحمودە، نازناوی شەمسەدینە، مەزهەبی حەنەفی بووە، زانایەکی مەزن و بڕواچاك و دڵپاك و بێ گەرد بووە، زۆر هۆنراوەی زانستی لەبەربووینە لە قوتابخانەی (حەسەن) دەرسی داوە، کاربەدەستان ڕێزیان لێناوە، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٧٦٧ك — ١٣٦٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٤/٣٤٣.

**مەحمود عەبباس عەبدالانی (١٥٨٠)**

ناوی مەحمودە، کوڕی عەبباسی کوڕی سولەیمانە، لە گوندی (عەودالان) هاتەدنیا هەر لەوێ لە خزمەت باوکی پەروەردە بوو، بووە مەلا، دەرسی دەدا، پاشان کرا موفتی (کۆیە)، دوایی سەفەری کرد بۆ (حەلەب)، دوو مانگ ماوە چووە (دیمشق) لەوێ چووە (حەج) گەڕاوە (دیمشق)، ماوە لەوێ تا ساڵی ١١٧٣ك — ١٧٥٩ز کۆچی دوایی کرد، لە خوار چیای قاسیون بە خاك سپێردرا، کتێبی (زبدة الأنفاس في تفسير سورة الإخلاص)ی داناوە.

سەرچاوەکان:
١. سلك الدرر ٤/١٢٧.
٢. معجم المؤلفين ١٢/١٧٣.
٣. إيضاح المكنون ٣/٦٠٩.
٤. الأعلام ٨/٥٢ /١٠/١٤٠.
٥. معجم أعلام الكورد ٦٩٤.
٦. علماء ومدارس في أربيل ٨٦.

٧. هدية العارفين ٦/٤١٦ – ٤١٧.

## مەحمود عبدالرحمان (ڕاجی) (١٥٨١)

ناوی مەحمودە، کوڕی عبدالرحمانی کوڕی مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەحمودی کوڕی بەهرامە، عەشیرەتی (جاف)ە، ساڵی ١٩١٢ز لە گوندی (تۆبزاوە)ی دوکان هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (کۆیە)، لای مەلا ئەبوبەکر و مەلا صادیق و مەلا مەعصوم و مەلا تەوفیق قۆناغەکانی بردەسەر، لە کۆتاییدا چووە لای مەلا محەممەدی جەلی زادە ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی لەم شوێنانەکرد: (گلـنیر) (قورقـورە) (خرابـە) (سـابوراوە)، ساڵی ١٩٧٥ز کۆچی دوایی کرد، مامۆستا جگە لە کوردی، عەرەبی و فارسی و تورکی دەزانی.

دیوانی شیعری هەیە، نازناوی شیعری (ڕاجی)یە، نمونەی شیعری:

دڵم پڕ سۆزە دەردم بێ دەوایە سەرم سەرخۆشە (بیرەم) لێ قەزایە

خەیاڵم هەر خەیاڵە و خاڵە دائیم دڵم پڕ زیکر و هاواری خودایە

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## مەحمود عبداللە خەرپانی (١٥٨٢)

ناوی مەحمودە، کوڕی شێخ عبداللە ی تەکیەییە، ساڵی ١٢٥٠ك – ١٨٣٤ز لە گوندی (خەرپان) هاتەدنیا، منداڵ بوو باوکی کۆچی دوایی کرد، برایەکانی بەخێویان کرد، لەبەر خوێندنیان دانا، لە قوتابخانەی خۆیان قۆناغەکانی بردەسەر، لە کۆتاییدا چووە (کەرکوك) لەوێ ئیجازەی وەرگرت، لە مزگەوتی گەورەی (هەڵەبجە) کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن و دەرس بێژ، خەریکی کاروباری مەلایەتی بوو، تا ساڵی ١٣١٩ك – ١٩٠١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٥٩ – ٥٦٠.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٢٠٥ – ٢٠٧.

## مەحمود عبدالله دشەیی (١٥٨٣)

ناوی مەحمودە، کوڕی عبداللّٰهی کوڕی مەحمودی (دشە)یە، ساڵی ١٣١٦ک – ١٨٩٨ز هاتەدنیا، خوێندی تا شارەزا بوو لە زانستەکان، بە تایبەت لە شەریعەت و ئوصول و فەلسەفە دەستی باڵا بوو، دەرسی دەداوە، چەند کەسی پێگەیاند و کردنیە مەلا، پاش کۆچی دوایی باوکی لە جێگای ئەو کرا قازی و مودەرریس لە قوتابخانەی (دار الإحسان)ی (سنە).

مامۆستا زاتەکی بەڕێز و حورمەت بوو، لەناو خەڵکان قسەی وەردەگیرا بۆ پێکهینانەوە و ئاشت بوونەوەی هاوڵاتیان دەورێکی سەرەکی هەبوو، چەند دانراوی خۆی هەنە، خەریکی خزمەتی ئاین بوو تا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأریخ مشاهیر کورد ٢/٣٨٤.

## مەحمود عبدالله نەقشبەندی (١٥٨٤)

ناوی مەحمودە، کوڕی عبداللّٰهیە، خەڵکی (دیاربەکر)ە، تەریقەتی نەقشبەندی بووە، ساڵی ١٠٧٧ک – ١٦٦٦ز لە (بروسە) کۆچی دوایی کرد، کتێبانی (رسالة النور) و (شرح أوراد الفتحية)ی داناون.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٢/١٧٤ – ١٧٥.

٢. هدية العارفين ٢/٤١٧.

## مەحمود عبدالعزیز شۆڕیجە (١٥٨٥)

ناوی مەحمودە، کوڕی عبدالعزیزی کوڕی محیەدینی کوڕی شێخ حەسەنی گلەزەردەی کوڕی شێخ محەممەدی نۆدەیی بەرزنجی یە، لە گوندی (ونە لەکە)ی سەر بە (قەرەحەسەن) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، دوای خەتمی قورئانی پیرۆز چووە

مزگەوتی نائیب ئۆغلی لە (کەرکوك) لای مەلا محەمەدی (قرکەیی) دەخوێند، هەروەها تەریقەتی (قادری) لە کاك ئەحمەدی شێخ وەرگرت، لەلایەن شێخ کرا (خەلیفە).

ئەمجا چووە گوندی (شۆریجە)، لەوێ مزگەوتی دروست کرد، لە تەك مزگەوت تەکیەی بۆ مریدان دامەزراند، بەم شێوەیە لە خزمەتی ئایین بوو، تا ساڵی ١٣١٥ك – ١٨٩٧ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (الأشرفية): ناسراوە بە: (بحر الأنساب) بەتێر و تەسەلی باسی بنەماڵەکانی سەیدەکانی بەرزنجە دەکا، سەرچاوەکی بڕواپێکراوە، وە (عەقائید و تەصەووف) و (تەفسیری فارسی) و (هۆنراوەی فارسی).

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٥٨ – ٥٥٩.

## مەحمود عەلی حەڕانی (١٥٨٦)

ناوی مەحمودە، کوڕی عەلی کوڕی نەصری کوڕی مەنصوری کوڕی هبةالله ی (حەڕانی)یە، نازناوی ئەبوسەنایە، لە شەریعەت دەستی باڵا بووە، کتێبی (الأنبا عن تحريم الربا)ی داناوە.

سەرچاوە: الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٣٨.

## مەحمود عەلی داقوقی (١٥٨٧)

ناوی مەحمودە، کوڕی عەلی مەحمودی کوڕی موقبیلی کوڕی سولەیمانی کوڕی داودە، خەڵکی (داقوق)ە، لە ١٦ی جیمادی یەکەم ساڵی ٦٦٣ك – ١٢٦٥ز هاتەدنیا، لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (بەغدا) و (شام) بووە زانایەکی بەناوبانگ، لە فەرموودە و ئامۆژگاری بێ وێنە بوو، لە نووسین و شیعر و ووتارخوێنی لە چەرخی خۆی یەکەم بوو، زاتەکی بەڕێز و بەوێر و قسەخۆش بوو، ماقوڵان دەهاتنە زیارەتی، لە دیدەنی تێرنەدەبوون، چەند مامۆستای پێگەیاندن، لەسەر دەستی ئەو دەرچوون.

دانراوەکانی: (مطالع الأسرار) و (الکواکب الدریة).

ڕۆژی دوشـەمە دوای نوێـژی عەسـر، ٢٠ی مـانگی (محـرم) سـاڵی ٧٣٣ك – ١٣٣٢ز لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی ئیمامی ئەحمەد بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. الذیل علی طبقات الحنابلة ٤/٤٢١ – ٤٢٣.
٢. معجم المؤلفین ١٢/١٨٣ – ١٨٤.
٣. شذرات الذهب ٦/١٠٦ – ١٠٧.
٤. هدیة العارفین ٢/٤٠٨.

## مەحمود عەلی هەولێری (١٥٨٨)

ناوی مەحمودە، کوڕی عەلی کوڕی محەممەدی کوڕی بەکری هەولێری زێڕینگـرە، زاتەکی چاك و بەدین و لەسەرەخۆ بووە، شەریعەت زان بووە، لە مەزهەبی شافیعی شارەزا بووە، ماوەك خەریکی نەحو بوو، دوای نوێژی هەینی ١٣ی ڕەبیعی دووەم، ساڵی ٦١٩ك – ١٢٢٢ز کۆچی دوایی کرد، شاعیر بووە، بە عەرەبی دەڵێ:

فکنْ معَ اللهِ في سرٍّ و في عَلَنْ      واللهُ یعطیكَ لا السلطانُ والبشرْ

سەرچاوەکان:

١. تأریخ أربیل ١/١٨٤ /٢/٣٠٦.
٢. معجم أعلام الکورد ٦٩٤ – ٦٩٥.

## مەحمود عومەر هانی (١٥٨٩)

ناوی مەحمودە، کوڕی عومەری کوڕی محەممەدی کوڕی ئیبراهیمـی کـوڕی شـوجاعە، ساڵی ٥٦٤ك – ١١٦٨ز لە شاری (هانی) سەر بە (دیاربەکر) هاتەدنیا، زانایەکی شـاعیر و دکتۆرەکی چاك بوو، چەند کتێبـی دەربارەی داودەرمان دانـاوە، لەوانـە: (المسـائل) و (قانون الحکم) و (الغرض المطلوب في تدبیر المأکول والمشروب)، جگە لە دیوانی شیعر.

مامۆستا لای خاوەنی (دیاربەکر) زۆر بەڕێز بوو، پاشان چووە (حەما) لای مەلیك مەنصور، هەروەها مەلیکەکانی (شام) خۆشیان دەویست، بە تایبەت مەلیك ئەشرەفی خاوەنی (دیمشق)، ساڵی ٦٣٥ك – ١٢٣٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. کشف الظنون ٢/١٢٠٢.

٢. شذرات الذهب ٥/١٧٧.

٣. إیضاح المکنون ٢/١٤٦.

٤. معجم أعلام الکورد ٦٩٥.

٥. معجم المؤلفین ١٢/١٨٥.

٦. هدیة العارفین ٢/٤٠٥.

## مەحمود فەقیراللە (١٥٩٠)

ناوی مەحمودە، کوڕی عبدالرحمانی کوڕی عبدالقادری کوڕی ئیسماعیلی دیاربەکرییە، ناسراوە بە: (فەقیراللە)ی تلوی، ساڵی ١١٧٤ك – ١٧٦٠ز هاتەدنیا، زانایەکی ئەهلی تەصەووف بوو، هەروەها شاعیر بووە لە مانگی ذی القعدەی ساڵی ١٢٦٣ك – ١٨٤٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ١٢/١٧٤.

٢. هدیة العارفین ٢/٤١٨.

## مەحمود کۆکۆیی (١٥٩١)

مامۆستا مەلا مەحمود، دەوری ساڵی ١٢٧٠ك – ١٨٥٣ز هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، هاتووچووی قوتابخانەکانی (هەڵەبجە)ی دەکرد، پاشان چووە خزمەت مەلا سەید عبدالرحیمی مەولەوی، ماوە لەوێ تا چاك شارەزابوو لە زانستەکان، بەتایبەت لە هۆنراوەکانی مامۆستای.

کۆتایی بە خوێندن هێنا، بووە مودەڕریس لەلایەن شێخ عەلی حوسامەدین، پاشان چووە گوندی (ئەبوعوبەیدە)، لەوێش باری کرد بۆ شاری سلێمانی، بووە مەلای مزگەوتی مەلا ئەمین مام ڕۆستەم، لەوێش چووە مزگەوتی مەحمود پاشای جاف لە (قزلبات)، دوایی چووە گوندی (باوەکۆچك) لای خزمەکانی، زۆری پێ نەچوو لە ١٣٣٤ك – ١٩١٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٦٢.

### مەحمود محەممەد ئورمەوی (١٥٩٢)

ناوی مەحمودە، کوڕی محەممەدی کوڕی حامیدە، خەڵکی (ورمێ)یە، پاشان چوویتە (قەرافا)، زانایەکی صۆفی و فەرموودەناس و ڕێزمان زان بووە، بۆ وەرگرتنی زانیاری ئایین هاتووچۆی زۆرکردووە، مەزهەبی شافیعی بووە، کتێبی (التنبیه)ی هەموو لەبەربووە، زاتەکی بە دین و شارەزا و ئاگاداربووە، ساڵی ٦٤٧ك – ١٢٤٩ز هاتەدنیا، لە مانگی جیمادی دووەم، ساڵی ٧٢٣ك – ١٣٢٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٤/١١٤ – ١١٥.

٢. شذرات الذهب ٦/٦٢.

### مەحمود محەممەد ئۆمەرگومبەتی (١٥٩٣)

ناوی مەحمودە، کوڕی محەممەدە، خەڵکی گوندی (ئۆمەرگومبەت)ە، شێخ ئیبراهیم فەسیح دەڵێ: {ئەوەش یەکە لە زانایەکانی تەریقەتی نەقشبەندی، موفتی (کۆیە) بوو، لە ئەستێرەناسی دەستی باڵابوو، (تشريح الأفلاك) و سەرەتای حاشیەی خەیالی و عبدالحکیم سەیلەکوتیم لە خزمەت خوێند، ئەویش لەلای باوکی خوێندووە، ئەویش لەلای ئەحمەدی تەبەقچەلی، ئەویش لەلای باپیرم و لەلای مەلا عبدالرحمان ڕۆژبیانی}.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٤٢.

٢. أربيل في مختلف العصور ١٠٧ – ١٣٤.

٣. علماء ومدارس في أربيل ٨٤.

## مەحمود محەممەد بێتوشی (١٥٩٤)

ناوی مەحمودە، کوڕی شێخ محەممەدی کوڕی شێخ ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عێزەدینی ئالانی بێتوشی یە، برای مەلا عبدالله ی بێتوشی یە، زانایەکی زیرەك و زەین تیژ بووە، لە بارەی زیرەکی دەگێڕنەوە: {لەو کاتی لەگەڵ مەلا عبداللەی برای بەرێ کەتن لە کوردستان بۆ (ئەحسا)ی سعودیە، پارە و خەرجییان لێ بڕا، (قاموس)[1] و (توحفە)یان لابوو، هەریەك چوار بەرگی گەورەیە، مامۆستا مەحمود توحفەکەی لەبەرکرد، مەلا عبدالله قاموسی لەبەرکرد، هەردوو کتێبیان فرۆشت بۆ خەرجی ڕێگە}.

وادیارە خوای گەورە بەهرەیێکی ئەوتۆی بەو دوو زانایە بەخشیوەو زەینیان هەروەکو شریتی (کاسێت) بووە، شتیان خوێندووتەوە و تۆماربووە و هاتیتەبەریان، دەنا ئەو دوو کتێبی وا گەورە و قورس و پڕ کێشە، لە کاتی سەفەر و ماندووبوون و برسیتی چۆن لەبەرکران ؟ ﴿ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء والله ذو الفضل العظيم﴾، (ئەلجوموعە/٤).

مامۆستا مەحمود نامیلکەی تەراویحی ڕەمەزانی هەیە، سەرەتا دەڵێ: {بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله الذي بيَّنَ الفروض والسنن، والصلاة والسلام على من سلك أكمل السنن،...} لە کۆتایی دەڵێ: {الحمد لله على ظهور الصواب، والصلاة والسلام على خير من أوتي الكتاب، واستخرجه واستنبطه الفقير الى الله الغني الصمد، خادم طلبة العلم، محمود البيتوشي بن محمد}.

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٥/٣٥٤ تا ٣٥٦.

---

[1] مەبەست کتێبی: (القاموس المحيط)ی فەیرۆز ئابادی یە..

## مەحمود محەممەد دشەیی (١٥٩٥)

ناوی مەحمودە، کوڕی مەلا محەممەدە، ساڵی ١٢٢٧ك - ١٨١٢ز لە گوندی (دشە) ناوچەی (جەوانڕۆ) هاتەدنیا، منداڵ بوو باوك و دایکی کۆچی دواییان کرد، بەڵام کۆڵی نەدا و وازی لە خوێندن نەهینا، ماوەك چووە (سنە) لای مەلا فتح الله، پاشان چووە لای مامۆستا (ابن الحاج)، دوایی گەڕاوە لای مەلا فتح الله ئیجازەی وەرگرت، هەروەها تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عوسمانی تەوێڵە وەرگرت، لەلایەن شێخ کرا (خەلیفە)، دەستی کرد بە کاروباری مەلایەتی و دەرسدانەوەی فەقێیان، مامۆستا خەتی خۆش بوو، لە هەموو جۆرە نووسینەکان زانیاری بەهێزبوو، بە تایبەت لە (نسخ)، بە دەستی خۆی هەژدە جار قورئانی پیرۆزی نووسیتەوە، ساڵی ١٢٨١ك - ١٨٦٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأریخ مشاهیر کورد ١/٤٣٣.

## مەحمود محەممەد شێخانی (١٥٩٦)

ناوی مەحمودە، کوڕی سەید محەممەدی کوڕی سەید عەلی یە، مەزهەبی شافیعی بووە، تەریقەتی قادری بووە، (شێخانی)یە، شێخان: عەشیرەتە، هەروەها چەند گوند هەنە لە عیراق و ئێران بەو ناوە، لەوانە شێخان گوندێکە نزیك (شنۆ) دانەری تەصریفی مەلا عەلی خەڵکی ئەم شوێنەیە.

مامۆستا شێخانی: لە مەدینەی پیرۆز نیشتەجێ بووە، مامۆستا شێخ عبدالغنی نابلسی دەڵێ: {ساڵی ١٢٠٥ك - ١٧٩٠ز لە مەدینەی پیرۆز لەگەڵ مەلا مەحمودی کوردی شێخانی کۆبومەوە}.

مامۆستا نووسین و دانراوی هەنە لەوانە: (کفایة المؤمنین): هەروەها بە: (عروة الوثقی) و (ختام المسك) ناودەبردرێ، وە (حسن الخاتمة وأدل الخیرات وأحسن التوسلات): ئەم کتێبەی لەسەر داوای شێخ ئیبن حەجەر لە خەودا داناوە، لە (ڕەوضە)ی پیرۆز مزگەوتی گەورەی خۆشەویست (درودی خوای لێ بی) تەواوی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوە ٢/١٤٦ – ١٥٠ – ٣٤٢ – ٣٤٥.
٢. جامع کرامات الأولیاء ٢/٤٥٢.

## مەحمود محەممەد عەینتابی (١٥٩٧)

ناوی مەحمودە، کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالله یە، نازنـاوی بەدرەدینـە، خـەلکی (عەینتاب)ە، مەزهەبی حەنەفی بووە، سەفەری کرد بۆ ولاتـی (ڕۆم)، گـەڕاوە (عـەینتاب) لەمزگەوتی (مۆمن) کۆڕی ئامۆژگاری بەسـتا، خـەلکان زۆر لەسـەر دەسـتی گەڕانـەوە، دوایی چووە (قودس)، چووە (حەلەب) سالّی ٨٠٥ك – ١٤٠٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٧/٥٤.

## مەحمود محەممەد گۆرانی (١٥٩٨)

نـاوی مـەحمودە، کـوڕی محەمـەدی کـوڕی یەزیـدی گـۆرانی یـە، لـە (سـەقز) هاتووتەدنیا، لەتەمەنی هەژدە سالّیدا لەخـەودا پێیـان ووت: {شـێخ محەمـەدی حـەفناوی، شێخی تووە}، کە لە خەو هەستا پرسیاری کرد: ئەو شێخە لە کێ یە؟ وەلامیان داوە: ئەو شێخە لە (میصر)ە، چووە خزمەت شێخ، تەریقەتی خەلوەتی لێ وەرگرت.

مامۆستا زاتـەکی بـەدین و دلپـاك بـووە، کـەراماتی لێ دەگێڕنـەوە، چـەند جـار لەخەودا بەخزمەت پێغەمبەر (درودی خـوای لـێ بـی) گەیشـتووە، هـەروەها زۆرجـاران بەخزمەت حەزرەتی خدر گەیشتووە، سـالّی ١١٩٥ك – ١٧٨١ز لـە (قـاهیرە) کۆچـی دوایی کرد.

چەند دانراوی هەنە، لەوانە: (الأنوار اللائحة والأسرار الناجحة) و (السلوك لأبناء الملوك) و (نصیحة الأحباب) و (رسالة الحکم – الحکم الکردیـة): عبـدالقادر عبـداللطیف بیساری طەرابلسی شەرحی کردوە بەناوی (إحیاء القلـوب) سـالّی ٢٠٠٤ز لـە هـەولێر چاپ کرا.

سەرچاوەکان:

١. جامع كرامات الأولياء ٢/٤٥٢ – ٤٥٥.

٢. الأعلام ٨/٦٢.

٣. هدية العارفين ٦/٤١٧.

٤. إيضاح المكنون ٣/١٤٦.

٥. معجم أعلام الكورد ٦٩٥.

٦. إحياء القلوب ٥ – ١٠.

٧. معجم المؤلفين ١٢/٩٢ – ٢٠١.

## مەحمود محەممەد واوانی (١٥٩٩)

ناوی مەحمودە، کوڕی مەلا محەممەدە، لە مەلا زادەکانی (واوان)ی (سەردەشت)ە، ساڵی ١٩٣٩ز لە گوندی (بناوێ) سەردەشت هاتەدنیا.

دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغەکانی لەو شوێنانە بردنەسەر: (ئالواتانی) سەردەشت، (خەلیفەلیانی) نەغەدە، (نەڵاس)، (گەناو)ی عێراق، ساڵی ١٩٦٣ز چووە (گەلالە) لای مەلا محەممەدی بۆکانی ڕەئیس کۆتایی بە خوێندن هێنا، ئیجازەی وەرگرت.

دەستی کرد بە مەلایەتی و دەرسدانەوە، ساڵی ١٩٧٩ز چووە (نەڵاس) ساڵی ١٩٩٤ز چووە (حەج)، لەوێ لەگەڵ (بن باز) و بەرپرسانی (دار التوجيه) و (دار الإفتاء) کۆبۆوە، مامۆستا زانایەکی زیرەکی وردبین و بیرتیژ بوو، لە شەریعەت و مێژوو شارەزا بوو.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٣١٦.

## مەحمود مەحمود هەولێری (١٦٠٠)

ناوی مەحمودە، کوڕی مەلا مەحمودە، لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، ساڵی ١١٩٠ك – ١٧٧٦ز چووە (موصل) لای مەلا عبدالرحمان دەباغ و چەند زانایانی خوێند، لە ١٢١٧ك – ١٨٠٢ز ئیجازەی لە مەلا یەحیای مزوری وەرگرت، پاشان کرا مەلای

شافیعییەکان لە مزگەوتی ئەمین پاشای جەلیلی، مامۆستا زاتەکی بە دین و چاك ر کردەوە ڕێك بوو، لە شەریعەت ئاگادار بوو، کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی چاك دەزانی، یاسین عومەری مێژووناس دەڵێ: {خۆم دیتم دەرسی فارسی دەداوە}.

ناوبراو خەتی خۆش بوو، لە خۆشنووسی بەناوبانگ بوو، مێژووی لە دایکبوون و کۆچی دوایی لەلام دیار نیە، ئەوەی دیارە ئەوەیە: یەکە لەو زانایە مەزنانەی کۆتایی صەدەی ١٢و سەرەتای صەدەی ١٣.

سەرچاوەکان:

١. غاية المرام ٨١.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ٢٣٣ – ٢٣٤.

## مەحمود مەزناوی (١٦٠١)

مامۆستا مەلا مەحمود خەڵکی گوندی (مەزناوە)ی (پشدەر)ە، دەوری ساڵی ١٨٥٨ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، گەڕا لە چەند شوێنان و حوجرەی فەقێیان قۆناغەکانی بڕین، تا ساڵی ١٢٩٤ك – ١٨٧٧ز چووە شاری سلێمانی لای شێخ عبدالقادری موهاجیر (تقريب المرام) و (تميم المرام)ی خوێند، لە خزمەت ئەو کۆتایی بە خوێندن هینا، لەبەر ئەوەی مامۆستا مریدی شێخ عەلی خالیصی کەرکوك بوو، گەڕاوە لای ئەو بووە مەلا، شێخ مەدرەسەی بۆ دروست کرد، لەوێ دەستی کرد بە دەرسدانەوە و نووسین و حاشیە دانان، ساڵی ١٢٨٨ك (عبدالله یەزدی) لە مزگەوتی (سورخ – سۆر) نووسیوە.

هەروەها چەند دانراوی شێخ قادری نووسینەوە، لەوانە: (شرح النموذج في العقائد) و (شرح الزوراء والحوراء) و (حاشية على اللاري).

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٣٤ز کۆچی دوایی کرد.

ڕوداوێك: جەنابی شێخ مصطفەای نەقشبەندی دەیفەرموو: {مەلا مەحمودی مەزناوەی زۆر دەست کورت بوو، نەیدەتوانی کرێی خانووەکەی بدا، ڕۆژەکی (زستان) و

باران، لەماڵەوە دێ بۆ مزگەوت، کۆڵانە و ڕێگایەکە قوڕدەبێ، ئەویش سەرمایێ و شەکی تەڕ دەبێ، هەناوی بەتاڵە و برسی دەبێ، چاو بلند دەکا، قەسرێکی خۆش و ڕازاوە دیارە، خاوەنەکەشی پیاوێکی خراپە، ناوی (حەماو)، لە دڵی خۆی دەڵێ: {خوایە بە قوربانت بم ئەمن بەخۆ و بەو هەموو عیلمە دەبینی وەزعم چۆنە، ئەو حەماوە خۆڕییەش چ ساڵتەنێکت پێداوە؟}.

لە ناکاو دەنگەك لەسەرەوە گازی دەکا: {مەلا مەحمود ڕازی قەسرەکت پێ ببەخشین، وەکو حەماوت لێ بکەین؟} مامۆستا سەرسام دەبێ، توانای ڕۆیشتنی نامینێ، بەردەبیتەوە، دەکەویتە ناو ئاو و قوڕەکە، هاوار دەکا بە دەنگی بەرز، چەند جار: {ناوێتم قەسر نابم بە حەماو، ناوێتم قەسر نابم بە حەماو....} خەڵکان دێن هەڵی دەگرن، پاکی دەکەنەوە، وادەزانن گۆڕاوە، تا ڕووداوەکەیان بۆ دەگێڕیتەوە.

(مەزناوی) شیعری و فارسی و عەرەبی هەیە، نازناوی (هجری)یە، حاشیەی لەسەر زۆربەی کتێبانی خوێندن هەنە، بەتایبەت (جمع الجوامع) و شەرحی (تهذیب الكلام)، لە مەتحی کتێبی مامۆستای خۆی کە (شەرحی تەهزیب)ە، دەڵێ:

جزاكَ اللهُ يا تاجَ الكرامِ ... بما وشَّحْتَ تهذيبَ الكلامِ

سقَيْتَ الدين رحراح اليقين ... سقاكَ اللهُ في دارِ السلامِ

جزاكَ الحقُ في الدنيا بعفوٍ ... وفي العُقبَى بحُورٍ في الخيامِ

أعبدَ القادرِ التختيِّ بُشرَى ... لَكُم بالفوزِ مِن هولِ القيامِ

شربْتَ الراح من كأسِ النبيِّ ... بفضلِ الربِّ مِن حُسْنِ الختامِ

سەرچاوەکان:

١. معالم الطريق ٢٢.

٢. علماؤنا ٥٦٠ – ٥٦١.

٣. بوژاندنەوە ٢/٩٧ – ١٠٠.

## مەحمود مەهدی جەوانرۆ (١٦٠٢)

ناوی مەحمودە، کوڕی مەهدییە، لـە سـەیدەکانی پیرخدرییـە، سـاڵی ١٣٠٠ک – ١٨٨٢ز هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە قۆنـاغی کۆتـایی چـووە لای مـەلا عـەلی حیکمەت ئەفەندی لـە (کـەرکوك)، هـەر لـەوێ سـاڵی ١٣٣٠ک – ١٩١٢ز ئیجـازەی وەرگرت، چووە (بیارە) ئیجازەی دووەمی لە مەلا عبدالقادر وەرگـرت، بـووە مـەلا لـە ناوچەی گەرمیان لای حەسەن بەگی سولەیمان بەگ، دوایی چـووە (بالـك) دوایـی چـوە (درەتفی) ناوچەی (مەریوان)، پاشان چووە (خانەقین) لـەوێ سەرپەرشـتی خانـەقای شـێخ عومەری دەکرد، پاشان چووە (حەج) لەوێ لەگەڵ مەلیك سعود کۆبـۆوە و ئامۆژگـاری کرد، دوایی لەگەڵ مەلیك فەیصەڵی یەکەم کۆبۆوە.

مامۆستا عبدالکریم (مدرس) دەڵێ: {مامۆستا ساڵی ١٣٥٦ک – ١٩٣٧ز هاتـە (بیارە) منیش بۆ بەرەکەت ئیجازەی دووەمم لێ وەرگرت، چونکە ئەو ئیجازەی لـە مـەلا قادر وەرگرتووە، ئەویش لە مەلا ئەحمەدی نۆدشەی ئـەویش لـە مـەلا محەمـەدی خـەتێ}، مامۆستا جەوانرۆیی ساڵی ١٣٦٣ک – ١٩٤٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. یادی مەردان ٢/٥٧٤.

٢. علماؤنا في خدمة العم والدين ٥٦٣.

## مەحمود یوسف طاڵەبانی (١٦٠٣)

ناوی مەحمودە، کـوڕی یوسـف ئاغـای حـاکمی قەرەداغـە، سـاڵی ١٧١٧ز لـە (قەرەداغ) هاتەدنیا، دەستی کرد بـە خوێنـدن، لەلایـەن مـەلا چـاکەکانی ئـەو سـەردەمی تەواوی کرد، تەریقەتی قادری لە شێخ ئەحمەدی لاهـوری وەرگـرت سـاڵی ١٧٤٧ز لـە گوندی (ڕەمەزان مامکە) تەکیەی دروست کرد، ئێستا ئەو شوێنە ناودەبردرێ بە (تەکیە)، ساڵی ١٨٠٠ز کۆچی دوایی کرد، لەسەر وەسیەتی خۆی لەو جێگایـەی ئێسـتا تەکیـەی طاڵەبانیە بە خاك سپێردراوە، (شێخ مەحمود) شـەرحی هـەژدە بـەیتی مەسـنەوی دەربـارەی

تەصەووف بە زمانی فارسی کردووە، شێخ ئەحمەدی کوڕی بووە جێگری، ئـەویش سـاڵی ١٨٤١ز کۆچی دوایی کرد، لـە تەك باوکی بە خاك سپێردرا، یازدە کوڕی هەبوو، لەوانە: شێخ عبدالرحمان لە پێشدا باسمان کرد.

سەرچاوەکان:


١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٥٥ -٥٥٨.

٢. ژیناوەری زانایانی کورد ٦٠٧ – ٦١٢.

٣. تأريخ مشاهير كورد ٢/١٦٩.

٤. معجم أعلام الكورد ٢٩١ – ٤١٤.

٥. بنەماڵەی زانیاران ٥٦٧–٥٧١–٥٧٤–٥٨٥–٥٩٢–٥٩٦–٦٠٢.

٦. مێژووی ئەدەبی کوردی ٤/٢٧٩ – ٣٤٤.


## محیەدین حەسەن کوردی (١٦٠٤)

ناوی محیەدینە، کوڕی حەسەنی کوڕی مـەرعی دیاربەکرییـە، سـاڵی ١٣٣٠ك – ١٩١٢ز لـە گەڕەکی (حیواطیة) لـە (دیمشق) هاتەدنیا، لەلایەن بـاوك و دایکـی پـەروەردە بوو، دایکی لەلای ژنێکی قورئان خوێن لەبەر خوێندنی دانا، قورئانی پیرۆزی خـەتم کـرد، ساڵی ١٩٢٤ز ناردیانە لای مەلا عیزەدینی (قسوسی)، دوایی بۆ خوێندن چووە (عـەممان)، گەڕاوە (دیمشق) ماوەی پێنج ساڵان خەریکی زانستەکانی قورئانی پیرۆز بوو، تا شـارەزایی تەواوی لـە هەر حەوت جۆرە خوێندنەوەکان پەیدا کرد، پاشـان کتێبـانی (قطـر النـدى) و (شذور الذهب) و (أزهرية) و (ابن عقيل)ی خوێندن، لەبابەتی شەریعەت (عمدة السـالك) و (ابن قاسم) و (التحرير) و (مغني المحتاج)ی خوێند، لە ئوصول (ورقات)ی خوێنـد، کـرا پێش نوێژ و ووتارخوێن لـە مزگەوتی (الذهبية)، لـە ٧/٧/٢٠٠٩ کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: پێگەی ئەنتەرنێت.( http://ar.wikipedia.org/wik)

## محیەدین قزلباخی (١٦٠٥)

مامۆستا شێخ محیەدین قزلباخی، لە شێخەکانی ناوچەی (سەقز)ە، بۆ خوێندن چووە (بیارە)، تەریقەتی لە شێخ نەجمەدین وەرگرت، کۆتایی بە خوێندن هینا، ئیجازەی وەرگرت، چووە (هەڵەبجە) لەوێ کرا مەلای مزگەوتی (خانم) کە بەناوی خێزانی عوسمان پاشای جاف دروست کرا، پاشان کرا مودەرریس ساڵی ١٣٣٢ك - ١٩١٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: یادی مەردان ٢/٥٨٩ - ٥٩٠.

## موخەللەد یەزید حەڕانی (١٦٠٦)

ناوی موخەللەدە کوڕی یەزیدە، خەڵکی (حەڕان)ە، یەکە لە زنایە بڕواپێکراوەکان لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بی)، مامۆستای ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەمبەل بووە، مامۆستا زەهەبی فەرموودەناس دەڵێ: { (موخەللەد) بەڵگەیە بۆ فەرموودەکانی ڕاست و دروست}، ساڵی ١٩٣ك - ٨٠٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. سیر أعلام النبلاء ٦/٤٢٩.
٢. الأنساب ٢/٢٣٢.
٣. اللباب ١/٣٥٣.

## موراد وەیسی زەنگەنە (١٦٠٧)

ناوی مورادە کوڕی وەیسی کوڕی مرادە، عەشیرەتی (زەنگەنە)یە، ساڵی ١٨٧٠ز هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (نەجەف) تەواوی کرد، بڕوانامەی وەرگرت، هاتە مزگەوتی (کاظمیة) لە بەغدا، دەرسی دەدا، دوایی چووە (کەرکوك)، پاشان کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن لە (خانەقین)، زانایەکی بێ فیز و خێرخواز و ڕوو لە چاکە بوو، دۆستی هەژاران بوو، هەوڵی برایەتی نێوان سوننە و شیعەی دەدا،

حەزی لە نووسین و شیعر بوو، شیعری کوردی و عەرەبی هەیە، ساڵی ١٩٧٥ز کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی کوردی: (گوڵزاری عیشق): دوو بەرگە، هۆنراوەیە، چاپ کراوە، وە (گوڵزاری حیکمەت).

دانراوەکانی عەرەبی: (روضة الإيمان) و (رسالة الأحكام) و (أثمار الهداية).

سەرچاوە: أعلام كورد العراق ٧٧٥ – ٧٧٧.

## مورتەضا مصطەفا کوردی (١٦٠٨)

ناوی مورتەضایە کوڕی مصطەفای کوڕی حەسەنی کوردییە، ناسراوە بە (الأمير الكردي)، لە (دیمشق) هاتەدنیا، لەلای عبدالغنی نابلسی خوێندووە، مەزهەبی حەنەفی بووە، ئەهلی تەصەووف بووە، شاعیر بووە، ساڵی ١١٥٥ك – ١٧٤٢ز کۆچی کرد.

چەند دنراوی هەیە، لەوانە: (تهذيب الأطوار في عجائب الأمصار) و (عقود الجمان في صحبة أبناء الزمان) و (شرح السلوك في رضاء الحق الغني في شرح قصيدة النابلسي عبدالغني).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٢/٢١٦ – ٢١٧.
٢. معجم أعلام الكورد ٧٠٣.
٣. إيضاح المكنون ٤٤/٤.
٤. هدية العارفين ٤٢٥/٦.

## مەروان شوجاع جزیری (١٦٠٩)

مامۆستای فەرموودەناس ناوی مەروانە کوڕی شوجاعی جزیرییە، خەڵکی (حەڕان)ە، لە (بەغدا) فەرموودەی خوێندووە، مامۆستای ئیمامی ئەحمەدی حەنبەل و چەند کەسانی تر بووە، مامۆستا زەهەبی فەرموودەناس دەڵێ: {ئەو فەرموودانەی مەروان دەیان گێڕێتەوە لە پلەی (جوان – حەسەن) دانە}، ساڵی ١٨٤ك – ٨٠٠ز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. سیر أعلام النبلاء ٦/٣٢٠.
٢. شذرات الذهب ١/٣٠٦.
٣. الأنساب ٢/٤٣١.

## مەسعود ئەحمەد ئاشۆکانی (١٦١٠)

ناوی مەسعودە، کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی فەقێ محەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەزیزی کوڕی ڕەسولە، عەشیرەتی (گەردی)یە، ساڵی ١٩٢٤ز لە گوندی (بنەسراوەی گەورە) هاتەدنیا.

خوێندنی: لە خزمەت بابی دەستی کرد بە خوێندن، دوای خەتم کردنی قورئانی پیرۆز و تەواوکردنی کتێبە سەرەتاییەکان چووە (بەحرکە) لای مەلا عبداللە ی ئامۆزای (بابم)، ماوەك لەوێ ماوە، پاشان چووە گوندی (خەتە) لای مەلا ئیبراهیم، گەڕاوە (بەحرکە) چەند ساڵ ماوە، گەڕاوە خزمەت بابی لە گوندی (باقرت)ی قەراج ئەوەی مابوو تەواوی کرد، ساڵی ١٩٥٣ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، حەفت ڕۆژ ئاهەنگی ئاینی گێڕدرا بەوبۆنە پیرۆزە، زۆربەی مەلا و فەقێیانی قەراج و کەندێناوە و هەولێر و بەرانەتی ئامادەبوون، ئەرکی مێوانداری لەسەر شانی حاجی مەعروف حاجی پیرداود ئاغا بوو، سەرپەرشتی کاریش مەلا محەممەدی عەلیاوە بوو.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (گردارەق)، پاشان باری کرد، گەڕاوە (باقرت) لەوێ چووە (پێمەڕەبڕ) کەمەك لەوێ ماوە چووە (سەید عوبێد)، لەو هەموو شوێنانە فەقێی هەبوون.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبداللە ی گردەشێری، مەلا عبدالکریمی خۆشاوی، مەلا عوسمانی گەزنەیی، مەلا طەیبی بەحرکەی (کاکم)، مەلا ئیسماعیل گردارەقی، مەلا محەممەد بەحرکەیی.

ئەمجا چووە (ئاشۆکانی عەبباس ئاغا)، پاشان چووە (پەرپیتان)، لەوێ باری کرد بۆ (شەوزار)، لەوێ چووە هەولێر مزگەوتی حاجی حەیدەر ئاغا لە گەڕەکی ئازادی، لەو ماوەیە ئەو کارانەی پێ سپێردرا:

١. دەرس بێژی لە مزگەوتی قەڵا.
٢. دەرس بێژی لە مزگەوتی گەورەی ناو بازاڕ.
٣. ئەندامی ئەنجومەنی زانستی ئەوقاف.

بەرهەمەکانی:

١. نامیلکەی سەرف.
٢. پارچە شیعرەکی کوردی، ئەوە دەقەکەیتی:

ئەفکاری دڵم جەمعە لەبۆ ڕیحلەتی ئەملا
ساعەت بە سعات داعیمە بۆ جێگە و مەئوا
یا ڕەببی خودا بەسسە لە پاش عوسری یوسر بێ
غەم لابچی با بادەیی سەبر و هەوەسم بێ
جومعان و ڕەمەزان و لەیلەتوقەدر و هەمو جومعە
شادم کە خودایە، دەلەبەر ئەو هەموو جەمعە
گەر بێتوو، دەم بێتوو، هەوەس بێتەوە ئەمجار
شەرتبی چ نەکەم، غەیری عبودییەتی جەببار
خوایە دەبەسە، ئاهو نزەم، گەشتە سەماوات
گەر ڕوو ڕەشیشم، ئەمما ئەوە هاتیمە دەخالات
بۆ خاتری (محەممەد)، کە شەفیعە لە جەزایێ
(موسا) کە نەجاتی بوو لەوێ بەحر و بەلایێ
(عیسا) کە ڕەفع بوو لە ئەرز چوو بۆ سەمایێ
کەشتیت کەلە بۆ (نوح)ی دروست کرد لەسەراوێ

(مەسعود)ی دە ڕزگارکە، لەوێ دەرد و بەلایێ

ئەمسالی ئەوی (مسّني) گۆ نێو دەرد و بەلایی[١]

خوڕەوشتی: ڕوخۆش بوو، مەجلیس ئاوەدن بوو، بە ڕوحم بوو، بە ئیشی دۆست و برادەران ماندوو بوو، چاوبلند و سەربلند و سەخی بوو، حەقگۆ بوو نەفس بەرزبوو، ڕەشید بوو، خوازۆك نەبوو، بڕوایەکی بتوونی هەبوو، ئەهلی تەصەووف خۆش دەویست، تایبەت شێخ مصطەفا و تەریقەتی نەقشبەندی، چەند ڕۆژ پێش کۆچی دوایی دەیگوت غەمی منتان نەبی، ئەمن جێگای خۆم دیتووە لە بەهەشت، قەسرەکی بلند و زۆر خۆشە.

کۆچی دوایی: لە ٢٥/٧/١٩٩١ز لە مالی خۆی لە گەڕەکی ئازادی لە هەولێر کۆچی دوایی کرد، پێش ماوەکی کەم لەم ڕووداوە عەرد لەرزی، لە گۆڕستانی شێخ وەیس لە (بەحرکە) بە خاك سپێردرا، بەم بۆنەیە مامۆستا مەلا عبدالله فەرهادی دەلێ:

کە زەنگی ڕیحلەتی لێدا فەلەك ئینسان لە لەرزینە

هەموو دنیا سەراسەر وا بەبێ ئارام و تەسکینە

تەمی ماتەم بە هەوری میحنەتی وت غەم ببارێنە

سوپایی حەسرەت و ئەندۆ ژمارەی دوور لە تەخمینە

کە هات و غارەتی کردم، ڕفاندی بیر و ئیدراکم

وەکو سەرسەرِ کە نەسفی کرد سەفینی عیزز و تەمکینە

کە (مەسعود) چوو سعودم چوو ئیتر واسووك و هەرزانم

نیشانە و بەلگەیە قوربان کە سۆرە ئەشکی خوێنینە

قەلاتی عیزز و ویقار بوو سەخاوەت حاتەمی مەشهور

ڕەزین و جوان بوو هەندامی ڕەوشتی جوان و شیرینە

---

[١] ئاماژەیە بە پاڕانەوەی حەزرەتی ئەییوب پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) لە کاتی نەخۆشی وەك خوای گەورە بۆمان باس دەکات، لەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿وأيوب اذ نادي ربه، اني مسني الضر، وأنت أرحم الراحمين﴾، (ئەنبیاء/٨٣).

ئەگەر هەر کەس بپۆشی بەرگی ماتەم ناحەقی مەگرە
کە کەس ناگاتە ئەم پایە لە خزمەت شەرع و ئایینە
بەخێر چی ئەی برا خواتان لەگەڵدا بێ بە ڕەحمی خۆی
لە کانگای دڵ دوعاتان بۆ دەکەین مەقرون بە ئامینە
خودا گۆڕی بکا باخی بەهەشت و مێرخوزاری خۆت
وەکو ڕەفتار و گوفتاری گوڵ و گوڵزار و نەسرینە
سوپاسی بێ قیاس بۆ خوا کە جێگەی چۆڵ نەبوو هەرگیز
کە (سەعد)ی دین و دنیا وا لە جێگەی بابی نۆشینە
بە ڕەسمی بەندەگی هاتم، لە گۆڕستانی (باحرکە)
مرازم هەر دوعایە وا کە پەند و وەعز و تەلقینە
لە پێشتە کاکی (فەرهادی) وەکو ئەم کۆچی بێ پایان
وەچاکە توشەیی بۆ خۆت بنێری بەر لە ئەم حینە
لە بەحری ئەبجەدی سوڕام لەبۆ مێژوویی کۆچی تۆ
دەنووسی (حوزنی) (غیبت) چونکە غائیبە لە ئەم چینە
١٤١٢ك

هەروەها عوسمان ئەفەندی ڕەشاد ئەفەندی لە هۆنراوەکی عەرەبی دەڵێ:

ذهب الذي أفنى السنين عبادةً وفعالُه لذوي التُقى محمودُ
والصالحونَ إذا أتاهم وعدُهم حسناتُهم يومَ الحساب شهودُ
فؤاده بأسم الاله مسبِّحٌ ولنوره في وجهه مرصودُ
والله يرحمُ بالعبادة وعنده للمتقين مثابةٌ وعهودُ
تحفو الملائكُ حولَه في فرحةٍ مَن يا تُرى هذا الفتى الموعود
فلطيباتُ تفوح مِن أنفاسه وكأنها مسكٌ يضوعُ وَ عودُ
هذا جزاءُ المتقينَ فإنهم في برزخٍ أرواحُهم مردودُ

فاهنأ بها قد صرتَ في دار الهنا ومكانُكَ الفردوس يا (مسعودُ)
لم ينقطع عنك الثوابُ من الدنا و (لسعد)ِ ابْنِكَ للسماك صعودُ
يارَبِّ بارِكْ في البنينَ فأنهم في حفظ دينِك قادةٌ وجنودُ
لم ينقطع نسلُ الكريمِ وعندَه ابنٌ (كسعدٍ) بعدَه موجودُ

کوڕەکانی:

١. مەلا سەعدەدین: پێش نوێـژ و ووتارخوێنـە لـە مزگـەوتی (خدیجة الکـبری) لـە هەولێر.
٢. عبدالباسط: دادوەرە لە قەزای سۆران.
٣. عبدالخالق: مامۆستایە لە وەزارەتی پەروەردە.

سەرچاوەکان:

١. الإكليل في محاسن أربيل ٣٠٥.
٢. گۆڤاری هەولێر ١٥٧ – ١٥٩.

## مەسعود ئیسماعیل سەلماسی (١٦١١)

نـاوی مەسـعودە، کـوڕی ئیسـماعیل کـوڕی عـەلی کـوڕی موسـایە، نازنـاوی (ئەبولفەتحە)، خەڵکی (سەلماس)ە، شەرع زان و شاعیر بووە، شەرحی مەقامات و جومـەلی کردووە، دیوانی ووتاری هەیێ و چەند شیعری جوانی هەیـە، سـاڵی ٦٢٩ك – ١٢٣١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: البداية والنهاية ١٣/١٣٥.

## مەسعود عوسمان حەڕانی (١٦١٢)

ناوی مەسعودە، کوڕی عوسمانی کوڕی مەسعودی کوڕی عوسمانی کـوڕی عـەلی کـوڕی صـەلاحەدینە، خـەڵکی (حـەڕان)ە، پـاش سـاڵی ٦٥٠ك – ١٢٥٢ز هاتـەدنیا، خەریکی خوێندنی فەرموودە بوو، ئیجازەی وەرگرت، دەرسی دەداوە.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٤/٣٤٩.

## مسكين بوكەير حەڕانی (١٦١٣)

ناوی مسکینە، کوڕی بوکەیرە، نازناوی ئەبو عبدالرحمانە، خەڵکی (حەڕان)ە، فەرموودەناس بووە، ئیمامی ئەحمەد فەرموودەی لیٚ وەرگرتووە، ساڵی ١٩٨ك – ٨١٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: سير أعلام النبلاء ٦/٤١٤.

## مسلم سەلامە ژەنگاری (١٦١٤)

ناوی موسلیمە، کوڕی سەلامەی کوڕی شەبیبە، خەڵکی گوندی (نەقیعە)ی نزیك ژەنگارە، نازناوی (نەجم)ە، شەرع زان و شاعیر بووە، دانراوی هەیە، پێش ساڵی ٦٠٠ك – ١٢٠٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تاج التراجم ٣٠٣ – ٣٠٤.

## مصطەفا ئەبوبەکر تاجەدین (١٦١٥)

ناوی مصطەفایە، کوڕی ئەبوبەکری کوڕی تاجەدینی گۆرانی یە، ساڵی ١١٤٧ك – ١٧٣٤ز لە (حەلەب) هاتەدنیا، زانایەکی بە توانا و نووسەر و شاعیر بووە، ساڵی ١١٩٨ك – ١٧٨٣ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٤٠٦.

٢. معجم أعلام الكورد ٧٠٩.

## مصطەفا ئەبوبەکر گۆران (١٦١٦)

ناوی مصطەفایە، کوڕی ئەبوبەکری گۆرانی یە، زانایەکی زیرەك بووە، ساڵی ١٢٦٥ك – ١٨٤٨ز لە (حەلەب) کۆچی دوایی کرد، دو قەصیدەی پوختەی هەیە: یەکەم: ستایشی پێغەمبەرە (درودی خوای لیٚ بی). دووەم: باسی چاوە، بۆ نمونە دەڵیٚ:

احفظ اخي صفات العين والبصر     وكن بحفظهما في العلم ذا بصر

فالواسع العين من حسن يقوم بها     يدعى به انجل الالحاظ والنظر

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٤٠٧.
٢. معجم أعلام الکورد ٧٠٩.

## مصطەفا ئەبوبەکر هەرشەمی (١٦١٧)

ئەستێرەی پڕشنگداری ئاسمانی سەردەم، ناوی مصطەفایە، کوڕی شێخ ئەبوبەکری کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی عبداللە ی کوڕی مصطەفایە، نازناوی کەمالەدینە، ناسراوە بە: (نەقشبەندی)، ساڵی ١٨٨٧ز لە وەرزی (هاوین) لە گوندی (هەرشەم)، بناری چیای (پیرمەم) هاتەدنیا، لە خانەقای باوکی لە هەولێر دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانی لەلایەن برایەکان و موستەعیدەکان تەواوکرد، ماوەك لەلای باوکی ماوە، ماوەك چووە مزگەوتی قەڵات، لای مەلا ئیبراهیمی دۆغرەمەچی، دوایی لەسەر فەرمانی باوکی چووە (کەرکوك)، لای مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی سییاە مەنصوری، بەشێکی مەنتیق و کەلام و ریازییاتی خوێند، ماوەکیش چووە (بالیسان) لای مەلا شێخ طاها، ماوەك چووە (خەتە) لای مەلا عبدالفتاح، ماوەکیش لای مەلا عبداللە ی گراوی بوو، پاشان گەڕاوە خزمەت باوکی کۆتایی بە خوێندن هینا، ئیجازەی گشتی مەلایەتی و ئیجازەتی تایبەت تەریقەتی نەقشبەندی لە باوکی وەرگرت، ساڵی ١٩١٠ز باوکی کۆچی دوایی کرد، دووبارە (شێخ مصطەفا) دەستی بەخوێندن کردەوە لەلایەن مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی کچك مەلا، بەشێکی تری فەلەکیات خوێند، ئیجازەی تری وەرگرت.

دانیشتنی لە خانەقا: ساڵی ١٣٣٣ك – ١٩١٥ز کە شێخ محەممەدئەمینی برا گەورە و جێنیشی باوکی کۆچی دوایی کرد، شێخ کەمالەدین لە جێگای باوکی دانیشت، دەستی کرد بە دەرسدانەوەی فەقێیان، ئامۆژگاری خەڵکان، ڕێ نیشاندانی سۆفی و مریدان، فەقێیان لە دوورەوە بە مەراق دەهاتن بۆ ئەم شوێنە، بۆ فێربوون و وەرگرتنی زانیاری، بە تایبەت موستەعیدەکانی قۆناغی کۆتایی، بۆ پەرەپێدانی شەریعەت و ئایین، ئیجازەی پێ دەبەخشین، دای دامەزراندن بە مەلا لە شوێنی گونجاو لە دەشت، یا لە شار.

بەشێك لەوانە بەهۆی جێبەجێ کردنی دەستووری سۆفییەتی، شایان بوون بکرێن بە جێگر و سەرخەتم، جەنابی ئیجازەی تایبەتی تەریقەتی نەقشبەندی پێدان، وەك ئەو بەڕێزانە: (شێخ دەروێش بەغدایی): نەوەی ئالوسی خاوەنی تەفسیری (روح المعانی) و (شێخ موشەڕڕەفی تورکیا) و (شێخ محەممەد نەمری فەلەستین) و (سەید عبداللە ی نۆغەرانێ) و (مەلا ئیسماعیلی ناقیص) و (مەلا عبداللە ی سەران) و (مەلا عبداللە ی تەرجانی) و (مەلا عبداللە ی خەلیفە) و (مەلا خەلیلی موخلیص) و (مەلا شەریفی زمارەی) و (مەلا مصطەفای خۆران) و (مەلا جوبرائیلی گاینجی) و (مەلا محەممەدی باقرتی) و (مەلا مەحمودی ڕەش) و (مەلا ئەحمەدی عەلیاوەی) و (مەلا ئەحمەدی خەلیفەی) و (مەلا طاهای گاینجی).

بەشێکی تر لە فەقێیەکانی شێخ کە بەشدارییان لە خەتم و وێردەکان دەکرد، بەڵام پتر خەریکی خوێندن بوون، لەلایەك خۆیان دەرسییان لە خزمەت شێخ دەخوێند، لەلایەك دەرسی فەقێیانیان دەداوە، لە کۆتایی ئیجازەی گشتی مەلایەتی پێدان، ناوەکانیان و مێژووی ئیجازەی وەرگرتنیان بەم شێوەیە:

١. مەلا ئیسماعیلی کۆیی.
٢. مەلا عبدالرحمانی بەگزادە (لارە).
٣. مەلا عبداللە ی تەرجانی.
٤. مەلا شەریفی دووشیوانی ١٩٢٦ز.
٥. مەلا عبداللە ی سکتانی ١٩٣١ز.
٦. مەلا ئیسماعیلی سوسەیی ١٩٣٢ز.
٧. مەلا مصطەفای ئاشۆکانی (مامم) ١٩٣٢ز.
٨. مەلا عبداللە ی بەحرکەیی (باوکم) ١٩٣٢ز.
٩. مەلا عبدالمجید گڕاوی ١٩٤٠ز.
١٠. مەلا عەلی لەیلانی.

١١. دکتۆر عبداللە ی کوڕی.

١٢. مەلا ئەبوبەکری شەرکان

١٣. مەلا محەممەدی قیرژەی ١٩٤٣ز.

١٤. مەلا عەلی گۆمەگراوی ١٩٤٣ز.

١٥. مەلا خضری شەمامەری ١٩٤٣ز.

١٦. مەلا عبدالعزیز ئاشۆکانی (مامم) ١٩٤٣ز.

١٧. مەلا سەید عبداللە گردەسۆری ١٩٤٣ز.

١٨. مەلا عبداللە نۆغەرانی.

١٩. مەلا محەممەد تەرجانی.

٢٠. مەلا طەییب بەحرکەیی(کاکم) ١٩٦٦ز.

٢١. مەلا طاهیر بەحرکەیی: دانەری ئەم مێژووە، ١٩٧٢ز.

خانەقای شێخ وەکو دیتمان: بە ڕاستی مەڵبەندی خواناسین بوو، کۆگای خواپەرستن بوو، بۆ هەموو زانیاری زانکۆیەکی گشتی بوو، بۆ هەموو کەس دەروازەی کراوە بوو، شەوان و ڕۆژان، لە کوردستان و دەرەوەی کوردستان، مریدان و میوانان لێ دادەبەزین، هەرچەندی مابانەوە قەدەغە نەبوو، پێشوازییان دەکرا، لە ماڵی خۆیان چاکتر خزمەت دەکران، هەر کەس وای دەزانی کەوا ماڵی تایبەتی خۆیێتی، خەڵکان دەهاتن بۆ پرسیارانی شەریعەت، وەڵامی ڕاستیان دەدراوە، مەلایان لە شتێك گومانیان هەبا، دەچوونە خزمەت شێخ، بەبێ کتێب بە ئاسانی بۆی ڕۆن دەکردنەوە، کە سەردانی مزگەوتت دەکرد، چەند کۆمەڵت دەدیتن: خواپەرستی یا دەرس بوو، قورئان خوێندن یا سەلاوات لێدان بوو، یادی خواکردن یا ئامۆژگاری خەڵکان بوو، لەو جێگایە پیرۆزە چەند مابایەوە دڵت دەکراوە، کە دەگەڕایەوە لە دڵت دا بوو زوو بێیەوە، ئێستاش – سوپاس بۆ خودا – ئەو مزگەوت و خانەقایە، خەتم و وێردی لێ سازدەدرێ، خزمەتی میوانانی لێ دەکرێ، بە یارمەتی خوای گەورە لە مەودواش هەر دەمینێ.

مەجلیسی شێخ: هەموو ڕۆژان، کاتی چێشتان و دوای نوێژی عەسران، تەشریفی لە خانەقا دادەنیشت، جار وابوو دەماوە تا پاش نوێژی عیشا، ئەگەر نەیتوانیبا بێتە خانەقا لە هۆدەکی تایبەت، لە قاتی سەرەوە دادەنیشت، خەڵکان دەچوونە خزمەتی، بۆ ڕێگا وەرگرتن شێخ چەند کەسانێکی دانابوون، لەوانە: حاجی تاهیر بێرکۆتی، مەلا عبدالله مەلا ئەحمەد، حاجی محەممەد...، صالّح مەلا محەممەد، یەحیا حاجی محەممەدئەمین.

کە دەچووی بۆ ژوورەکە، لە نزیك خۆی دادەنای، مێوانداری دەکردی، قسەی خۆشی بۆ دەکردی، وات دەزانی کەوا ئەتووی لە هەموو کەس خۆشتر دەوێ، ڕێگای چاکەی دین و دنیای بۆ دادەنای، باس هەر باسی ئاین بوو، باسی خوناسین بوو، باسی زانایان بوو، باسی خوێندنی مەلایان بوو، شێخ دەریای زانست بوو، هەرچەندە زانا بای بەرانبەر ئەو زاتە خۆت نەدەهاتە پێش چاو، دەتویست قسە نەکەی بەس گوێ ڕابگری، ئەو ماوەی لە خزمەت ئەو ڕاتدەبوارد خۆت لەبیر دەکرد، واتدەزانی لەناو ئەو چەرخە دەرچووی، فەرموودەکانی ئاسان و ڕەوان بوو، خەڵك زوو فێردەبوون، جار وابوو شتێکت لە دڵدا بوو، دەچووی پرسیاری لێ بکەی، پێش پرسیارەکە وەڵامی دەدایەوە، واتدەزانی کەوا لەناو دڵی تۆدایە، خۆم بەسەرم هاتووە، شێخ لە هەموو جۆرە زانیارییەك شارەزا بوو، باسی قورئانی کردبا دەتگۆت تەنیا تەفسیر زانە، لە فەرموودەی خۆشەویست (درودی خوای لێ بی) فەرموودەناس بوو، لە شەریعەت موجتەهید بوو، لە مەنتیق و حیکمەت فەیلەسوف بوو، لە ئەندازە و ژمێریاری و زانستی ئاسمان و زەوی دەستی باڵا بوو، تەمەنی صەد ساڵ بوو، بیستن و دیتن و ئەندامی زەعیف ببوون، بەڵام بیر و هەست و زانیاری، زیرەکی و هۆشیاری، ڕۆژ بە ڕۆژ لە زێدەبوون دا بوون، وادەزانم ئەو شێخە یەکە لەو زاتانە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بی) دەربارەیان فەرموویتی: {لەسەر هەر

سەد ساڵێك خوای گەورە یەكێك دەنێری بۆ ئوممەتی من كاروباری ئاینیان بۆ نوێ بكاتەوە}،[1] سەلامی خوای لەسەر بی لە ڕۆژی هات و لە ڕۆژ چوو تا ڕۆژی دوایی.

نووسینەكانی: شێخ كەمالەدین هەروەك باوكی خەریكی دەرس و ئامۆژگاری ویردی تەریقەت بوو، كاتی ئەوەی نەبوو خۆی خەریك بكا بە دانانی كتێب، یا حاشیەی سەراسەر، بەڵام ئەو فتوایانەی دەیدا، وەڵامی پرسیارانی دەداوە، زۆرجار دەیفەرموو بنووسن، ئەوانە بەشێكیان بەلاوكراینەوە لە هەردوو چاپەكەی (النجم الزاهر)، هەروەها تاكە تاكە حاشیەی لەسەر (جمع الجوامع) و (تحفه) و (إیضاح)ی حەج هەیە، لە كۆتاییدا دەنووسی (مصطفی الغیاثي).

كۆچی دوایی: لە ٦ی جیمادی دووەم ساڵی ١٤٠٦ك ١٩٨٦/٢/١٥ز لە شەوێكی باران و سەختی زستان وەڵامی بانگەوازی خوای گەورەی داوە: ﴿یا أیتها النفس الطمئنة ارجعي إلی ربك راضیة مرضیة فادخلي في عبادي وادخلي جنتي﴾ (فەجر ٢٧-٣٠)، دوایی خۆی شێخ عبدالله ی كوڕی جێگری بوو، لە پێشدا باسمان كرد.

سەرچاوەكان:

١. النجم الزاهر ٦٨ – ٨٧ – ١٥١ – ١٥٨ – ١٥٩ – ١٧٧.

٢. علماء ومدارس في أربیل ٧٦ – ٧٨.

٣. محمد بن عبدالله الجلي ٥٥ – ١٥٤.

٤. أسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامیة ٣١٢.

٥. دەنگی زانا، ژمارە ٥٥ / ٥٦، ٢٠٠١ز علماء هەرشەم

٦. هەولێرم وادیوە ١٤٨.

---

[1] ﴿ان الله یبعث لهذه الامة علی رأس كل ماة سنة من یجدد لها دینها﴾، رواه أبو داود، عون المعبود ٤/١٧٨.

## مصطەفا ئەحمەد بێسارانی (١٦١٨)

ناوی مصطەفایە، کوڕی ئەحمەدە، ساڵی ١٦٤٣ز لە گوندی (بێساران) سەر بە (مەریوان) هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (نۆدشە)، ماوەك چووە (پایگەلان) پاشان چووە (سنە) ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕاوە (بێساران) دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی، هەروەها تەریقەتی (خەلوەتی) وەگرت، وێرەکانی ئەنجام دەدا، ساڵی ١١١٥ك – ١٧٠٣ز کۆچی کرد.

دیوانی شیعری هەیە، بۆ نمونە:

ئێمە یچ پەروانەی شەشناسانیم
پەڕ و باڵ سفتەی دین حاسانیم
میلـلەت پاك دین پێغەمبەرانیم
نەك جەتایفەی کەم نەزەرەنیم

بمانە جەمین نور پاکتەن
ئەر توپاکەنی جەکێ پاکتەن

واتە:

ئێمەش ئەو پەپولانەی شەم دەناسین
پەڕ و باڵ کراوی ئاینی چاکین
نەوەی ئاینی پاکی پێغەمبەرانین
نەك لە تایفەی ئەوانەی کەم دەزانن

ڕۆناکی پاکی نێوچەوانت پێمان پیشان بدە
ئەگەر تو پاك نەبی کێ پاکە ؟

سەرچاوەکان:

١. مێژووی ئەدەبی کوردی ٢/٣٩ – ٤٧.
٢. تأریخ مشاهیر کورد ١/١٧٢ – ١٧٥.

٣. تأريخ السليمانية ٢٩٢ – ٢٩٣.

٤. معجم أعلام الكورد ٧١٢.

٥. مشاهير الكورد ٤٠٥ – ٤٠٦.

## مصطەفا ئەفەندی عاکیف (١٦١٩)

مامۆستا مصطەفا ئەفەندی عاکیف، بنەماڵەی (قەرە موفتی)یە، خەڵکی شاری (وان)ە، لە کوردستانی تورکیا، ساڵی ١٢٥٢ك – ١٨٣٦ز کرا موفتی (وان)، پاش دە ساڵ چووە (ئەستانە)، پاش ساڵەك چووە (بنغازی)، دوایی گواستراوە بۆ (مەرعەش)، ناوبراو دەستی شیعری هەبوو.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٤٠٦.

٢. معجم أعلام الكورد ٧٠٦.

## مصطەفا باباڕەسول بەرزنجی (١٦٢٠)

ناوی مصطەفایە، کوڕی باباڕەسولی کوڕی شێخ طاهای کوڕی شێخ ڕەسولی کوڕی بایەزیدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی باباڕەسولە، ساڵی ١٢٣٥ك – ١٨١٩ز لە گوندی (بەرزنجە) هاتەدنیا.

دەستی کرد بە خوێندن، گەڕا لە چەند شوێنان، تا گەیشتە قۆناغی موستەعیدی، لەو کاتە چووە مزگەوتی باباعەلی لە سلێمانی لای مامۆستا محەممەد فەیزی زەهاوی، پاشان چووە (سابلاغ) لەوێ کۆتایی بە خوێندن هێنا، ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە سلێمانی، لە مزگەوتی سەید حەسەن کرا مودەڕریس، دوایی کرا (موفتی).

مامۆستا زانایەکی بە سوود بوو، قسەخۆش بوو، ڕووخۆش بوو، زمان ڕەوان بوو لە کوردی و عەرەبی و فارسی، لە بابەت بڕوایی هۆنراوەی عەرەبی هەیە، سەرەتایەکەی دەست پێ دەکا، بە:

قرأت كتاب الكائنات فأنه     سطور بتوحيد الاله تهلل...

ساڵی ١٣٠٢ك – ١٨٨٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٦٦ – ٥٦٧.

٢. معجم المؤلفين ١٢/٢٤٣.

٣. تأريخ السليمانية ٢٨٨.

٤. معجم أعلام الكورد ٧٠٩.

## مصطەفا بالیسانی (١٦٢١)

مامۆستا مەلا مصطەفای خۆشناو، خەلکی گوندی (بالیسان)ە، یەك بووە لەزانایەکانی صەدەی دوازدەی کۆچی، زانایەکی بەتوانا بووە، لە کتێبەکانی خوێندن شارەزا بووە، لە زانستەکان دەستی بالآ بووە، لەلای مەلا صبغةالله ئەفەندی ماوەرانی خوێندووە و پێگەیشتووە، لە (موصل) دەرسی داوە، خەلکەکی زۆر سوودی لێ وەرگرتووە، عیصامەدین عومەری مێژوونوس دەلێ: {یەك بووە لە مامۆستایانی خۆم}، لە کتێبی (الروض النضر) بەوپەڕی ڕێزەوە باسی دەکا.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/١٩٧.

٢. مشاهير الكورد ٢/١٩٤.

٣. علماء ومدارس في أربيل ١٠٩.

٤. معجم أعلام الكورد ٧١٢.

٥. مجلة الحكم الذاتي ١/١٩٨٣م.

## مصطەفا پێنجونی (١٦٢٢)

مەلا مصطەفا پێنجوێنی، دەوروبەری ساڵی ١٣٥٤ك – ١٩٤٨ز هاتەدنیا، دەستی کرد بەخوێندن، لەچەند شوێنان لە حوجرەی فەقێیان کۆتایی بە خوێندن هینا، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی،

دەرسدانەوە و ئامۆژگاری خەڵکان، پاشان بۆ پەرەپێدان بە زانیاری، چووە (میصر) لە زانکۆی (ئەزهەر) بڕوانامەی (ماجستێر) و (دکتۆرا)ی بەدەست هێنا، گەڕاوە کوردستان ماوەك لە (موصل) دەرسی دەدا، دوایی چووە (قەطەر)، نامەکەی دکتۆرای (مختصر من قواعد العلائي وكلام الأسنوي) یە، دوو بەرگە، (١٣٠٤) لاپەڕەیە، ساڵی ١٩٨٤ز لە موصل چاپ کرا.

سەرچاوە: اسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٣٠ – ٢٣١.

## مصطەفا حەسەن سعێرتی (١٦٢٣)

ناوی مصطەفایە کوڕی حەسەنە، لە قوتابخانەی (صالحیە)ی (سعێرت) دەرسی داوە، زانایەکی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بووە، شاعیر بووە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٤٠٥.

٢. معجم أعلام الكورد ٧١٥.

## مصطەفا دەروێش گۆج (١٦٢٤)

ناوی مصطەفایە، کوڕی دەروێشی کوڕی ڕەسولە، ساڵی ١٨٨٩ز لە (کۆیە) هاتەدنیا، دەستی کرد بەخوێندن، قۆناغی (سوختە)یی، لە (هەرتەل) و (هیران) و (بێتواتە) بردەسەر، لە قۆناغی (موستەعید)ی، چووە لای مەلا ئیسماعیلی ماویلی، دوایی چووە (بالیسان) لای مەلا شێخ طاها، چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادر، چووە (کۆیە)لای جەنابی مەلا محەمەدی جەلیزادە، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت.

لەم شوێنانە مەلایەتی کرد: (گورزەیی)، (کانی دەربەند)، (پیرەر)، (سماق شیرین)، (بانەقەلات)، مامۆستا ناسرابوو بە (فەرائیز) زان، ساڵی ١٩٥٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## مصطفا ڕەسول صەفوەت (١٦٢٥)

ناوی مصطفایە، کوڕی مەلا ڕەسولی کوڕی شەریفی دیلـژی قەرەداغی یە، ساڵی ١٣١٤ك – ١٨٩٦ز لە سلێمانی هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بەخوێندن، دوایی چووە مزگەوتی شێخ بابا عەلی، چووە لای شێخ عومەری قەرەداغی، چووە (بێژوە)ی ئالان لای مەلا محەممەدئەمین، گەڕاوە سلێمانی لای شێخ بابا عەلی ئیجازەی وەرگرت، بووە مەلا لە گوندی (بارچاوش)، لە ٩/٢/١٩٦٣ز کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا نووسەر و شاعیر بوو، چەند دانراوی هەنە، لەوانە:

١. هۆنراوەی کوردی لە دوڕڕی بوردی: تەرجومەی قەسیدەی بوردییەیە، ساڵی ١٩٣٥ز چاپ کرا، سەرەتایەکەی دەست پێ دەکات بە:

بڕێژە ڕەحمەت خودا، بە دائیمی تا ئەبەد

سەر خۆشەویستت کە چاترینی خەلقە بەجەم

٢. مرشد الصلاة: ساڵی ١٩٦١ز چاپ کرا.

٣. تەرجومەی گولستانی شێخ سەعدی شیرازی لە فارسی وەلای کوردی ساڵی ١٩٦٨ز لە بەغدا چاپ کرا.

٤. شانۆی ناو ماڵ: ساڵی ١٩٧١ز لە (بەغدا) چاپ کرا.

٥. مرشد الحج: ساڵی ١٩٧٣ز لە (بەغدا) چاپ کرا.

٦. دیوانی (صەفوەت)، ساڵی ١٩٨٤ز لە (بەغدا) چاپ کرا.

٧. مێژووی بەرزنجە.

٨. ڕابەری ڕۆژوو.

٩. ڕابەری زەکات.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٧٢.

٢. أعلام كورد العراق ٨١٤ – ٨١٦.

٣. إسهام علماء کوردستان العراق فی الثقافة الإسلامیة ٢٦٨.

## مصطەفا زیارەتی (١٦٢٦)

مامۆستا مەلا مصطەفا خەڵکی گوندی (زیارەت)ی بناری چیای (پیرمەم)ە، ساڵی ١١٣٠ك – ١٧١٨ز هاتەدنیا، زانایەکی زیرەك و وردبین بووە، یاسین عومەری مێژووناس لە (غایة المرام) دەڵێ: {پسپۆری ناسراوی چەرخی خۆی بوو، هیچ شەریعەت زان و بوێژەك ناو قەرانی ئەو نەبوو}، محەممەدئەمین عومەری لە (منهل الأولیاء) دەڵێ: {من لە ماوەران بە خزمەتی گەیشتم، بە زۆرزان و زیرەك هاتە پێش چاوم}.

مامۆستا ئیجازەی لە مەلا صبغەالله ئەفەندی یەکەم وەرگرتووە، مەلا ئەبوبەکر محەممەد دایەخەجێ (کۆیی) دەڵێ: {ساڵی ١١٩٥ك – ١٧٨٠ز شەرحی عەقائیدم لە مەدرەسەی مامۆستا لە گوندی (زیارەت) نووسییەوە}، هەروەها مەلا محەممەد خان ئەحمەد ئەسپیندارەیی دەڵێ: {ساڵی ١١٧٨ك – ١٧٦٤ز (کافیە)م، لە مەدرەسەی ئەو لەهەمان شوێن نووسییەوە}.

ناوبراو لە ١١٩٨ك – ١٧٨٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووەی زانایانی کورد ٤/٢١٤.
٢. غایة المرام ١٠٨.
٣. علماء ومدارس فی أربیل ٨٩.

## مصطەفا سەعید عەینتابی (١٦٢٧)

ناوی مصطەفایە، کوڕی سەعیدی کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدە، خەڵکی (سروج)ە، دوایی چوویتە (عەینتاب) ڕۆژئاوای (سروج)، زانایەکی شەرع زان و مەزهەب حەنەفی بووە، لە (عەینتاب) موفتی بووە، کتێبی (جهادیە)ی داناوە، لەگەڵ (انتخاب الفقهاء): چوار بەرگە، ساڵی ١٢٧٩ك – ١٨٦٢ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ١٢/٢٥٤.

٢. هدیة العارفین ٢/٤٥٨.

## مصطەفا سولەیمان ئاشۆکانی (١٦٢٨)

ناوی مصطەفایە کوڕی مەلا سولەیمانی کوڕی فەقێ محەممەدی کوڕی ئەحمەدی، کوڕی عەزیزی کوڕی ڕەسولە، عەشیرەتی (گەردی)یە، ساڵی ١٨٩٤ز لەگوندی (ئاشۆکان)ی بەڕانیان هاتووتەدنیا، مامی نووسەری ئەم مێژووەیە.

خوێندنی: لەخومەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (جدیدە)ی بەڕانیان، لای مەلا حوسێنی مامی، ماوەك لەوێ بوو، دوایی چووە (بنەسراوە)ی گەورە، لای مەلا ئەحمەدی مامی، پاشان چووە (قەراسنج) لای مەلا شێخ حوسێنی سورچی، دوایی چووە (بەحرکە) لای مەلا عوسمانی شەوەکی، ماوەکیش لە (خورمەلە) بوو لای مەلا عوسمان، ماوەکیش لە (قازیخانە)ی خوێند، پاشان چووە هەولێر لای شێخ مصطەفای نەقشبەندی، ماوە لە خزمەت شێخ تا ساڵی ١٩٣٢ز ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: ئەمجا کۆتایی بە خوێندن هینا، ماوەك مەلا بوو لە (زەرگەزەوی)، ماوەك چووە (کودەریان)، ماوەك چووە (بابەجیچك)، لەو شوێنانە فەقێی هەبون، دوایی چووە (دۆبە)ی سەربەقەزای (ئاکرێ)، پاشان باری کرد، چووە (قەراتەسۆران)، دووبارە گەڕاوە (دۆبە)، لەوێ چووە (گۆمك) لەوێ چووە (گەویلان)ی شێخ ئەحمەد سورچی.

سەفەرەکانی: چەندجار سەفەری ماڵی خوای کرد، بۆ حەج و عومرە، هەروەها لەگەڵ بابی و مامەکانی و برایەکانی بەشداری غەزای (ڕواندز)ی کرد، بۆ بەرگریکردنی لەشکری ڕووسە داگیرکەرەکان.

پیشەسازی: جگە لە مەلایەتی زۆر ئیش و کاری ئەنجامدەدا، بۆ نمونە:

- وەستایەکی چاك بوو بۆ دروستکردنی خانووبەرە.
- دارتاشەکی چاك بوو پەرتوکخانەی بۆ برایەکانی دروست دەکرد.

- لە جزو بەند و شیراز و بەرگکردن دەست ڕەنگین بوو.
- (کورە)ی ئەرز و ئاسمانی لە بەرد دروست دەکرد، لەگەڵ نەخشــەی مــانگ و ڕۆژ و بورجەکان.
- خەتی خۆش بوو، زۆربەی کتێبەکانی خوێندنی مەلا و فەقێیانی بە دەستی خۆی نووسی بوو، لەگەڵ پەراوێزەکان.
- لە دامەزراندنی ئاشی (ئاو) شارەزابوو.

سیفەتەکانی: مەلایەکی زیرەك ، دیمەن جوان ، دڵنەرم ، هێمن ، ڕووخــۆش ، دەم بە پێکەنین بوو، پێکەنینی خەندە بوو، مەراقی سوحبەت بوو، حــەزی لــە مێوانــداری بــوو، سەخی و چاو بڵند بــوو، بــەردەوام بــوو لەســەر خوێندنــەوەی قورئــانی پــیرۆز و (دلائــل الخیرات)، لە مانگی ڕەمەزان هەموو ڕۆژ خەتمەکی تەواوی قورئانی پیرۆزی دەکرد، ئەگەر ڕەمەزان بیست و نۆ با بیست و نۆ خەتم ئەگەر سی با سی خەتم.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٧٠ز لە (گەویلان) کۆچی دوایی کرد، لــە گۆڕســتانی (گرد قەمەر) نزیك گوندی (زێڕاو) بە خاك سپێردرا.

دوو کوڕی هەبوو: (حاجی ڕەئــوف): کۆچــی دوایــی کــرد، وە (مــەلا خالیــد): ئێستا لە جێگای باوکی مەلایە لە (گەویلان).

سەرچاوەکان:


١. الإكليل في محاسن أربيل ٣٠٦ – ٣٠٧.
٢. النجم الزاهر ٦٨.
٣. گۆڤاری هەولێر ١٤٧ – ١٤٨.


## مصطەفا صیدقی سیواسی (١٦٢٩)

ناوی مصطەفا صــیدقییە، کــوڕی ئیبراهیمــە، خــەڵکی (ســیواس)ە، ناســراوە بــە: مودەڕڕیس و بە دەباغ زادە، دەوری ساڵی ١١٩٦ك – ١٧٨١ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبــی (لطائف المواعظ)ی داناوە، لە دوو بەرگ.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٢/٢٥٩.

٢. إيضاح المكنون ٢/٤٠٦.

## مصطەفا شەمسەدین تەختی (١٦٣٠)

ناوی مصطەفایە، کوڕی شەمسەدینی کوڕی عبدالغفاری کوڕی مەلا گۆشایشی کوڕی شێخ محەممەدی مەردۆخی یە، ساڵی ٩٥١ك – ١٥٤٤ز هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە قوتابخانەکانی ناوچەی خۆیان قۆناغەکانی بردەسەر، ئەمجا چووە (حەج) لە شاری (مەککە)ی پیرۆز بە خزمەت شێخ ئیبن حەجەری خاوەنی توحفە گەیشت، لە زانیاری ئەو سوود بەخش بوو، ئیجازەی مەلایەتی لێ وەرگرت، گەڕاوەو گوندی (تەختە)ی سەر بە (سنە) قوتابخانەیدانا، هەروەها تەریقەتی شازەلی لە شێخ شەهابەدین کاکۆزەکەریا وەرگرت، بەم شێوەیە خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوو، تا ساڵی ١٠٤٧ك – ١٦٣٧ز لە (تەختە) کۆچی دوایی کرد، چەند پارچە شیعری هەیە، لە بابەت تەصەووف.

دوو کوڕی زانای هەبوو: (شێخ ئەحمەد): باوکی باپیری شێخ قەسیم و شێخ محەممەد سەعیدە، وە (شێخ ئەبوبەکر).

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٦٥ – ٥٦٦.

٢. تأريخ مشاهير كورد ١/١٨٣ – ١٨٤.

٣. بنەماڵەی زانیاران ١٢٨ – ١٢٩.

## مصطەفا عبداللە خەرپوتی (١٦٣١)

ناوی مصطەفایە، نازناوی حیلمی یە، کوڕی عبداللە یە خەڵکی (خەرپوت)ە، لە کوردستانی تورکیا، لە قوتابخانەی یەحیا ئەفەندی نەقشبەندی، لە (قوسطەنطینییە)

دابەزیوە، ساڵی ١٢٨٤ك – ١٨٦٧ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (زبدة العلوم وخلاصة الفنون)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٢/٢٦١.

٢. هدية العارفين ٢/٤٥٨.

## مصطەفا عبداللە کوردی (١٦٣٢)

ناوی مصطەفایە، کوڕی عبداللە یە، ناسراوە بە (دامـاد)، لـە (قوسطەنطینییە) دابەزیوە، لە قوتابخانەی سوڵتان لە (بروسە) دەرسی داوە، هەر لەوێ ساڵی ١٠٩٨ك – ١٦٨٦ز کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی: (حاشية على أنوار التنزيل للبيضاوي) و (مسألة التحليل من مزالق الأقدام).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٢/٢٦٣.

٢. إيضاح المكنون ٣/١٤٠.

٣. هدية العارفين ٦/٤٤٢.

٤. معجم أعلام الكورد ٧١٠.

## مصطەفا عبداللە هیرانی (صافی) (١٦٣٣)

ناوی مصطەفایە، کوڕی کاك عبداللە[1]ی کوڕی کاك عەلی کوڕی کاك مصطەفای کوڕی کاك عبداللە ی کوڕی شێخ سولەیمانە، نازناوی (صافی)یە، بەرەبابی (میر مەحەلی) یە، شێخ سولەیمان میربوو خەریکی کاری دنیابوو، پاشان وازی هێنا، تەریقەتی

---

[1] کاك عبداللە (کاك عەولا) ناودەبردرا بە (ثاني) چونکە بەناو کاك عەولای گەورە کرابوو، (ثاني) ساڵی ١٨٣٠ز هاتەدنیا لە ١٩٠٦ز لە هیران کۆچی دوایی کرد.

(قادری) لە شێخ طاهای بەتلیسی وەرگرت، دەستی کرد بە یادی خودا و ئەنجامدانی وێرد و دەستووری تەریقەت، صافی ساڵی ١٨٧٣ز لە (هیران) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، ماوەك لە قوتابخانەکانی خۆشناوەتی بوو، دوایی چووە (کۆیە) ماوەك لە هەولێر بوو، ماوەك لە (ڕواندز) ماوەك لە (سەران)، ماوەك لەلای مەلا ئەحمەدی ئۆمەرگومبەتی بوو، ماوەك لەلای مەلا ئەحمەدی (ڕەش).

دوایی ئاودیوی (ئێران) بوو، چووە (لاجان)، چووە (پەسوێ)، چووە (سابلاغ) لە مزگەوتی شادەرویش چەند ساڵ لەلای قازی عەلی باوکی پێشەوا قازی محەممەد ماوە، پلەی خوێندەواری لە عەرەبی و فارسی و تورکی بەرزبۆوە، گەڕاوە (هیران) کە باوکی کۆچی دوایی کرد، بووە جێنشینی لە کاروباری مەلایەتی و سەرپەرشتی تەکیەکەیان.

شاعیراتی: صافی جگە لە مەلایەتی شاعیرەکی چاك بوو، شیعرەکانی زۆر تەڕ و بەتام و کێش و ڕێك و پێکن، شیعری کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی هەیە، وەك خۆی دەڵێ:

خۆی کوردییە (صافی) لە هەوای عەشقی توو ئێستێ

کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی بوو بە ئەشعار

شیعرەکانی بەشێکیان دڵدارین، ئەویتر ئاینین، زۆربەی بە (شێخ) عبدالقادری غەوسی گەیلانی (بەغدا) هەڵگۆتووە، دیوانەکەی ساڵی ١٩٥٣ز لە چاپ درا، دووبارە ساڵی ٢٠٠٤ز بە لێکۆڵینەوەی محەممەد مەلا مصطەفا هیرانی لە هەولێر چاپ کراوە.

سەفەرەکانی: حەزی لە تێکەڵایەتی و هاتووچووی برادەران بوو، دەچووە (شەقلاوە)، دەچووە (ڕواندز) لە تەکیەکەی خۆی دادەبەزی، دەچووە (کۆیە) میوانی جەنابی مەلای گەورەی کۆیە دەبوو، دەچووە هەولێر، دەچووە دەشتی هەولێر لە (ترپەسپیان) میوانی مەلا شێخ جەلال دەبوو، دەچووە (دووگرتکان) میوانی حەمەئەمین

ئاغای دزەیی دەبوو، دەچووە (موصل)، دەچووە (بەغدا) لە مزگەوتی (گەیلانی) دادەبەزی.

کۆچی دوایی: لە ١٢/٢/١٩٤٢ز ماڵئاوایی لە دۆستان و مریدان کرد، لە گۆڕستانی شێخ سولەیمان بە خاك سپێردرا، ئەویش ئەشکەوتێکی دەستکارە، تایبەتە بەو بنەماڵە، گۆڕەکەشی لە پێشدا خۆی بۆ خۆی هەڵکەنی بوو، ئێستاش شێخ (ثاني) لەو شوێنە گۆڕەکی بۆ خۆی لێداوەو ئامادەی کردووە.

کوڕەکانی: صافی حەوت کوڕی لە دوا بەجێمان:

١. کاك عەلی: مەلایەکی چاك بوو، شاعیریش بوو، نازناوی شیعری (صەفوەت) بوو، پاش کۆچی دوایی باوکی، بووە جێنشینی، ساڵی ١٩٧٧ز کۆچی دوایی کرد.
٢. کاك مەلا عەزیز: بایەخی بە مەلایەتی پتر دەدا لە شێخایەتی لە ١/٢/١٩٨٦ز کۆچی دوایی کرد، لە پێشدا باسمان کرد.
٣. کاك ئەنوەر: لە ١٢/٤/١٩٨٠ز کۆچی دوایی کرد.
٤. کاك جەعفەر: لە ٢٧/٥/١٩٨٧ز کۆچی دوایی کرد.
٥. کاك عبدالقادر (غەوسە): لە ٢٠/٥/١٩٩٠ز کۆچی دوایی کرد.
٦. کاك جونەید: ساڵی ٢٠٠٣ز کۆچی دوایی کرد.
٧. عبدالکریم: شاعیرە لەم ڕۆژانە کۆتایی مانگی ئابی ساڵی ٢٠٠٨ز کۆچی کرد.

سوپاس بۆ خودا ئێستاش تەکیەکەیان لە (هیران) ماوە، ویرد و دەستووری تەریقەتی لێ ئەنجام دەدرێ، میوانان و مریدان لێی دادەبەزن، سەرپەرشتی تەکیە و جێنشینی ئەو شوێنەی باوك و باپیرانیان کاك عبدالله ی کاك عەلی یە، ناسراوە بە (ثاني).

سەرچاوەکان:


١. أربيل في مختلف العصور ١٤٠.
٢. دیوانی صافی ١١ – ٤٢.
٣. بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز ١٥٧ – ١٧٤ – ٢٢٥ – ٢٣١.

٤. ژیناوەری زانایانی کورد ٧٩٥ – ٧٩٧.

٥. مێژووی ئەدەبی کوردی ٤/٥٧ – ٦٠ /٥/٣٢٥ – ٣٤٠.

## مصطەفا عبدالکریم سنەیی (١٦٣٤)

ناوی مصطەفایە، کوڕی عبدالکریمی کوڕی مصطەفای کوڕی یەعقوبی قازی یـە، ساڵی ١١٦٠ك لە (سنە) کـرا (شـیخ الإسـلام)، یـەك بـوو لـە مەلایـە چـاکەکانی ئـەو سەردەمی، بەردەوام بوو لەسەر خزمـەتی ئـاینی پـیرۆزی ئیسـلام، تـا سـاڵی ١١٦٧ك – ١٧٥٣ز شەهیدکرا.

سەرچاوە: تأریخ مشاهیر کورد ١/٢٤٢.

## مصطەفا عەلی هیرانی (١٦٣٥)

ناوی مصطەفایە، کوڕی عەلی کوڕی ئەبوبـەکرە، عەشـیرەتی (بلّبـاس)ە، سـاڵی ١٩٠٦ز لە (هیران) هاتەدنیا.

خوێندنی: لـە سەرەتاوە لای کاك عەلی هیرانی دەستی کرد بـە خوێنـدن، دوایـی چووە لای مەلا طەیبـی کۆیی لە (هیران)، دوایی چووە (سکتان) لای مەلا عبدالله، دوایی چووە (سەران) لای مەلا عبدالله، دوایی چووە (زێـوە) لای مـەلا عبـدالله، دوایـی چـووە (هەرتەل) لای مەلا فتح الله، ماوەکیش چووە (ڕواندز)، پاشان چووە گوندی (دێمەکار) لە دەشتی هەولێر لای مەلا ئەحمەدی (ڕەش)، ئەمجا ئاودیو بوو بـۆ (ئێـران) چـووە (پەسـوێ) لای مەلا عبدالله ی بورهانی پاشان گەڕاوە (عێراق) چووە (شەقلاوە) لای مەلا طاها، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٣٦ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: کۆتایی بـە خوێنـدن هینـا، مەلایـەتی لـەم شـوێنانە کـرد: (گەرۆتـە)، (هیران)، (بیرۆکان)، (پونگینە)، (فریـز)، (زیـارەت)، (سمـاقولّی)، (سوسـێ)، (بێلینگـە)، ساڵی ١٩٥٨ز چووە (ناودارۆکان)، ساڵی ١٩٦١ز باری کرد لە دەشت، هاتـە هـەولێر بووە مەلای مزگەوتی حاجی حەسەن بەززاز، دوایـی چـووە مزگـەوتی گـەورەی قـەڵات، پاشان چووە مزگەوتی خانەقای شێخ مەزهەر لەناو بازاڕ.

کۆچی دوایی: لە ٢٥/٩/١٩٩٣ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخ ئەحمەد بە خاك سپێردرا.

کوڕەکانی: (محەممەد): مامۆستا بوو لە وەزارەتی پەروەردە، ئێستاش (مشرف تربوی)یە، و (د. طاهیر): مامۆستایە لە زانکۆ و (حاجی): مەلا بوو لە (هیران).

سەرچاوە: دەنگی زانا، ژمارە ١٤ – ١٥ / ١٩٩٨ز، محەممەد مەلا مصطەفا.

## مصطەفا فاضیل بالیسانی (١٦٣٦)

مامۆستا مەلا مصطەفا، ناسرابوو بە: (فاضیل) یەك بوو لە مەلایە باشەکانی خۆشناوەتی، لە گوندی (بالیسان) گەڕەکی ڕۆژهەڵات دەرسی فەقێیانی دەداوە، ڕەشید بەگ سەرپەرشتی مەدرەسەکەی دەکرد، دوایی کرا (واعیز) لە ناوچەی (شەقڵاوە)، پاشان هاتە هەولێر لە گەڕەکی سیطاقان نیشتەجێ بوو، هاتووچووی خانەقای شێخ مەزهەری دەکرد، لەوێ لەگەڵ مەلایان لەلای مەلا شەریفی دووشیوانی کۆدەبوونەوە بۆ ووتوێژ لەسەر بابەتانی شەریعەت.

مامۆستا حەزی لە قسەکردن بوو بە زمانی عەرەبی، زۆرجار بە کوردی پرسیاریان لێ دەکرد ئەو بە عەرەبی وەڵامی دەداوە، بەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆز تا کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی هەبوو: ئیبراهیم و مەلا محەممەد.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٣١٨.

## مصطەفا محەممەد (أبو السعود) (١٦٣٧)

ناوی مصطەفایە، کوڕی (شیخ الإسلام) محەممەد ئەبوسعود (ئامێدییە)، حاشیەی لەسەر (الدرر والغرر)ی مەلا خسرۆ هەیە، ساڵی ١٠٠٨ك – ١٥٩٩ز کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی هەبوو ناو محەممەد، ساڵی ٩٩٧ك – ١٥٨٨ز هاتەدنیا، ساڵی ١٠١٩ك – ١٦١٠ز کرا مامۆستا لە (بروسە)، ساڵی ١٠٤٨ك – ١٦٣٨ز لە (دیاربەکر) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٢/١٢٧ – ١٧٧.

٢. معجم أعلام الکورد ٥٧٩.

**مصطەفا محەممەد بارزانی (مەلا مصطفی بارزانی) (١٦٣٨)**

ناوی مصطەفایە، کوڕی شێخ محەممەدی کوڕی شێخ عبدالسلامی کوڕی مەلا عبدالله ی (بارزانی)یە، لە بەرواری ١٤/٣/١٩٠٣ز لە گوندی (بارزان) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، بەشێکی لە کتێبە سەرەتاییەکان تەواوکردن، ماوەك لە حوجرەی فەقێیان بوو لە (پردێ) نێوان هەولێر و (کەرکوك)، ماوەکیش چووە خانەقای مەولانا خالید لە سلێمانی لای مەلا عبدالله ی (چورستانی)، لەو کاتە مەلا صالح عبدالکریم هەڵەبجەیی لەوێ لە خزمەت عومەری قەرەداغی بوو، پاشان گەڕاوە (بارزان).

شۆڕش سازدان: بۆ مەبەستی وەرگرتنی مافی ڕەوای گەلی کورد، مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٤٣ز دەستی کرد بە (شۆڕش) زۆر سەرۆك هۆز و خەڵکی کوردستان وەگەلی کەوتن، هێز و توانایەکی وایان هەبوو حکومەتی عێراق نەیتوانی بەرانبەریان بوەستی، ناچار سەرەتای ساڵی ١٩٤٤ز وتووێژی لەگەڵ کردن، لە ئەنجامدا پێکهاتن لەسەر ئەم خاڵانە:

١. قوتابخانە درست بکرێن لە شوێنانی پێویست لە کوردستان.

٢. بنکەی تەندروستی بکرێنەوە لە شوێنانی پێویست لە کوردستان.

٣. ئەو شوێنانەی خۆراکی لێ قەدەغەکراوە بۆیان بنێردرێ.

٤. بنکەی پۆلیس لە ناوچەکانی سەرێ کەم بکرێتەوە.

٥. گرتییەکانی بەندیخانە ئازادبکرێن.

پاشگەزبوونەوەی حکومەت: پاشان حکومەت لە بڕیارەکانی خۆی پەشێمان بۆوە، داواکارییەکانی هەموو وەلانان هیچی جێبەجێ نەکرد، دووبارە (بارزانی) ساڵی ١٩٤٥ز دەستی کردەوە بە (شۆڕش)، حکومەتی عێراق بە پاڵپشتی ئینگلیز بە

سەرۆکایەتی جەنەڕاڵ (رنتن) چەند فڕۆکەی ناردە سەر بارزان و چەند ناوچەی تریان بۆردومان کرد، هەروەها دوو هەزار سەرباز و یەك هەزار کوردی هەڵخەڵەتێنراو هێرشیان کردە سەر ناوچەکە، ناچار (بارزانی) خۆی و چەند چەکداری تایبەت کە خۆی هەڵی بژاردن، ڕوویان کردە کوردستانی (ئێران)، چووە لای قازی محەممەد، ئەویش خەریکی بانگەوازکردنی گەلی کورد بوو بۆ دروستکردنی کۆماری مەهابادی کوردی، بارزانی بەشداری کردن، (قازی) یەکسەر کردییە سەرۆکی هێزی چەکدار لە کۆماری نوێی (مەهاباد)، پاشان کۆماری (قازی) سەری نەگرت و نسکۆی هینا، لەلایەن حکومەتی (ئێران) قازی دەستگیرکرا، (بارزانی) خۆی نەدانەدەست، لە نێوان سێ دوژمنی خوێن خۆر (عێراق) و (ئێران) و (تورکیا) توانی شێرانە خۆی دەرباز بکا، ئاوی (ئاراس)ی بڕی، ماوەك لە کێوی (ئەرارات) خۆی حەشاردا، لە بەرواری ١٧/٦/١٩٤٧ز گەیشتە (ڕوسیا)، چەند ساڵ لەوێ ماوە، تا شۆڕشی ١٤/٧/١٩٥٨ز، لەسەر بڕیاری زەعیم عبدالکریم قاسم – سەرۆك کۆماری عێراق – گەڕاوە (بەغدا)، ماوەکی کەم بەسەرچوو (زەعیم) دەستی کرد بەململانێ و دژایەتی گەلی کورد، (بارزانی) لە سەرەتای ئازاری ساڵی ١٩٦١ز بەغدای بەجێ هێشت، گەڕاوە (بارزان).

لە بەرواری ١١/٩/١٩٦١ز شۆڕشی ئەیلولی سازدا، (زەعیم) بڕیاری جەنگیدا، بە لەشکر و بە فڕۆکە هێرشی کردە سەر، چەند شوێن لە کوردستان بۆردومان کرا و وێران کرا، ساڵی ١٩٦٣ز کە بەعسەکان لەسەر حوکم بوون، ئەوانیش لە ٩/٦ هێرشەکی دڕاندانەیان هینا، بەڵام هێزی (پێشمەرگە) بەرگری کردن، هیچیان بۆ نەکرا، ناچار (بەعسەکان) داوای ووتوویژ و پێکهاتنیان کرد، عبدالرحمان عارفی سەرۆك کۆمار، عبدالرحمان بەززازی سەرۆك وەزیرانی ناردە کوردستان، لە ٢٩/٢/١٩٦٦ز لەسەر چەند خاڵ بڕیاری پێکهاتنیاندا، بەڵام ئەمجارەش هیچیان جێبەجێ نەکرد، ساڵی ١٩٦٨ز (بارزانی) دەستی کردەوە بە (شۆڕش)، لەوکاتە تاقمەکی ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆك کۆمار هاتنە سەر حوکم، ئەوانیش داوای ووتوویژیان کرد، لە ئەنجامدا پێکهاتن لەسەر

(١٥) خالّ، لە ١١ی ئازاری ١٩٧٠ز بڕیاری لەسەردا، پاش چوار سالّ، لە ١١ی ئازاری ١٩٧٤ز حکومەتی (بەعس)، بێ ڕەزامەندی (بارزانی) لە یەکلاوە، بڕیاری قانوونی حوکمی زاتی، لە ناوچەکانی کوردستاندا، هەروەها بڕیاریدا ناوچەکانی کەرکوك و دوزخورماتو و خانەقین و ژەنگار و شێخان و مەخمور - کە هەموویان کوردنشین و کوردستان بوون - ئەوانە لە ژێر بازنەی کوردستان نین، لەژێر حوکمڕانی حکومەتی عێراقن، وەپێکهاتنەکەی سالّی ١٩٧٠ز ئەو شوێنانە ناگرتەوە.

بۆ جێبەجێ کردنی ئەو مەبەستانەی چەند کەسانی کوردی لایەنگری خۆی هینا، دایمەزراندن، کاروباری ئەو حوکمرانییەی پێ سپاردن، ئەوان بەناو نوێنەری کورد بوون، بەلاّم بۆ بەرژەوەندی ئەو گەلە دەست بەستڕابوون، چاویان بلّندکردبا گلّۆپی سۆریان دەدیت، کەچی بۆ بەرژەوەندی (بەعس) هەرکات بیان ویستبا ئیش بکەن، گلۆپی کەسك هەرکرابوو، رێدرابوو، (بارزانی) ئەوەی دانا بە بڕیاری شەڕ، نەك ماف پێدانی گەلی کورد، بۆیە بانگەزای کرد: ئەوانە خاوەنی قسەی خۆیان نین، ووتووێژ لەگەلّیان بێ سوودە، چارەی ئێمە تەنیا جەنگە، تا مافی ڕەوای خۆمان وەردەگرین، جا لەسەر فەرمانی حکومەت و صەدام حوسێنی سەرۆك وەزیران هێرشی دڕندانەیان هینا سەر ناوچەکانی کوردستان، چەند کەسانی کوردی بەکرێ گرت بۆ جەنگی کورد، چەند ناوچەی گواستەوە و خەلّکەکەی دەربەدەرکرد، چەندی رماند و ڕوخاند و تەختی کرد، چەندی سووتاند و وێران کرد و تالاّنی کرد، چەند شوێنانی کوردنشینی بەزۆری دەرکردن، لە عەرەبوستانی دوورەوە عەرەبی هینا، پارە و خانووبەرەی پێدان لەو جێگایانەی نیشتەجێ کردن، چەند مزگەوت و تەکیە و خانەقا و گوند و باخچە و کانی کۆرکردنەوە، حکومەتی بەعس بەو هەموو کارە ناهەموارە هیچی بە هیچ نەکرد، نەیتوانی ئەو گەلە لە ناو ببا، نەیتوانی ئەو شۆڕشە بنبڕ بکا و بیکوژێنتەوە، تەنیا خۆی تاوانبار کرد، دلّی کوردی موسولّمانی شکاند، نەیدەزانی، خوای گەورە کەسی بۆ کەس دروست نەکردووە، نەیدەزانی خاوەن

دەستەڵاتی بەرز تەنیا خوای گەورەیە، نەیدەزانی ئەو کورسیە بۆ وی ماڵ نیە، ڕۆژەك دادێ لێی وەربگەڕێ، (هەروەك وەرگەڕا و سەرنخون بوو).

ئەمجارە پیلانەکی تری گێڕا، پەنای بردە بەر ئەمریکا و ئینگلیز و فەرەنسا و ئەڵمانیا و ڕوسیا، بۆوەی ووتوێژ لەگەڵ (ئێران) بکا، یارمەتی کورد نەدا، سنوریان لێ بگری، هەموو جۆرە پەیوەندی لەگەڵیان قەدەغە بکرێ، بەرانبەر چەند شتێك کە (عێراق) بە (ئێران) بدا، ساڵی ١٩٧٥ز هەموویان لە (جەزائیر) کۆبونەوە بڕیاریان لەسەردا ناچار (بارزانی) بۆ بەرژەوەندی گەلەکەی بڕیاریدا: کۆتایی بە شۆڕش هات، پێشمەرگە چەك دابنێ، بگەڕێتەوە ماڵی خۆی، وەك قازی محەممەد و محەممەد پاشای ڕواندز بۆ هەمان مەبەست خۆیاندا دەست دوشمن، خۆشی و ناخۆشی فەرمانەکە جێبەجێ کرا، (بارزانی) چاوی بەرایی نەدا لە کوردستان بمێنێ، چووە (ئێران) لە (کەرەج) نیشتەجێ بوو، لە ئەنجامدا، لە خەفەتان تووشی نەخۆشی دەروونی بوو، ساڵی ١٩٧٦ز بۆ چارەسەر بردیانە (ئەمریکا).

کۆچی دوایی: سعات پێنج و نیوی شەوی ٢/٣/١٩٧٩ لە نەخۆشخانەی (نیۆیۆرك) کۆچی دوایی کرد، لە شاری (شنۆ) بە خاك سپێردرا، لە ١٠/١٠/١٩٩٣ز گواستراوە بۆ جێ نەزەرگەی باب و باپیرانی: گۆڕستانی (بارزان).

کوڕەکانی: عبیداللە و لوقمان و صابیر و ئیدریس، ئەوانە کۆچی دواییان کردووە، وە نیهاد و سیداد و وەجیە ئەوانە ماون، کاك مەسعود بارزانی: ساڵی ٢٠٠٥ز لەسەر بڕیاری پەرلەمان و گەلی کورد کرا سەرۆك هەرێمی کوردستان.

سەرچاوەکان:

١. البارزاني والحركة التحررية الكردية ٣ – ٩٠ – ٩١.
٢. معجم أعلام الكورد ٤٢٩ – ٧١٠ – ٧١٢.
٣. أسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٣١٠ – ٣١١.
٤. محمد پاشا الرواندزي ٥٧.

٥. مصطفى البارزاني زعيم الحركة القومية الكردية المعاصرة ٩٦ – ٩٧.
٦. الأكراد في بهدينان ١٩٢.
٧. شۆڕشەکانی کورد ١٤٨ – ٢٤٥.
٨. تأريخ مشاهير كورد /فارسی/ ٣/٥١٧ – ٥٣٤ – ٥٩٤.
٩. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/٣٣.
١٠. خۆری ئیسلام ٢٠٠٧/٣٤ز.

## مصطەفا محەممەد ڕەباتی (١٦٣٩)

ناوی مصطەفایە، کوڕی مەلا محەممەدی ڕەباتی قەرەداغی یە، دەوری ساڵی ١٢٩٥ك – ١٨٧٨ز هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوختەیی و موستەعیدی لە قوتابخانەکانی حوجرەی فەقێیان تەواوکرد، لە کۆتاییدا چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادری مودەڕریس ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، هەروەها ئیجازەی تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عومەر وەرگرت، پاش کۆچی دوایی شێخ عومەر، چووە لای شێخ نەجمەدین، لەلایەن ئەو کرا (خەلیفە) دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی، داب و ڕەوشتی تەریقەت تا کۆچی دوایی کرد.

دوو کوڕی هەبوون: مەلا زاهید و مەلا خالید.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العم والدين ٥٧٠ – ٥٧١.
٢. بنەماڵەی زانیاران ٢٠٨ – ٢١١.

## مصطەفا محەممەد کوردی (١٦٤٠)

ناوی مصطەفایە، کوڕی حاجی محەممەدی کوردییە، ناسراوە بە (ابن الحاج)، چەند دانراوی خۆی هەیە، لەوانە:

١. مورد العذب في بيان الكسب: سەرەتایەکەی بە: (الحمدلله على ما أنعم....) دەست پێ دەکا، لەو نووسراوە باسی کۆمەڵێك لە زانایان دەکا، لەوانە مەلا مصطەفای

زیارەتییـە، کـە سـاڵی ١١٩٨ك – ١٧٨٣ز کۆچـی دوایـی کـردووە، وادیـارە مامۆستای ناوبراو دوای ئەو بەروارە کۆچی دوایی کردووە.

٢. حاشیە لەسەر شەرحی (نونیة).

سەرچاوە: بوژاندنەوە ٣/٣٠٩ – ٣١١ ، ٥/ ٣٥٣.

## مصطەفا مەحمود قەرەداغی (١٦٤١)

ناوی مصطەفایە کوڕی مەحمودە، خەڵکی (قەرەداغ)ە، سـاڵی ١٨٩٢ز هاتـەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، زانستە شەرعییەکانی تەواوکرد، چووە (ئەستەمبۆل) لە قوتابخانەی قازییاتی دەرچوو، ساڵی ١٩١٨ز کرا قازی گشتی، لە ١٩٢٣ز کـرا قـازی (ئامێـدی)، پاشـان نـاردرا (کـەرکوك)، لـە ١٩٣١ز نـاردرا هـەولێر، لـە ١٩٣٨ز کـرا جێگـری بەڕێوەبـەری گشـتی، لـە ١٩٤١ز کـرا پارێزگـاری سـلێمانی، دوایـی کـرا سـەرۆکی ڕێکخستنی مافەکانی ئەرز و بان.

ساڵی ١٩٤٤ز کرا پارێزگاری هەولێر، لە ١٩٥٠ز گواستراوە بۆ (کـەرکوك)، پاشان خانەنشین کرا، بووە (پارێزەر)، مامۆستا پەرتوکخانەکی دەوڵەمەنـدی پێشـکەش بـە کۆڕی زانیاری کورد کرد، لە (بەغدا)، لە ١٦/٥/١٩٧٣ز لـە (بەغـدا) کۆچـی دوایـی کرد، لە (خانەقین) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٧١٤.

## مصطەفا مەحمود موفتی (١٦٤٢)

ناوی مصـطەفایـە، کـوڕی مـەحمودی کـوڕی شـێخ عبـداللەی خەرپانیـە، سـاڵی ١٢٩٥ك – ١٨٧٨ز لە (هەڵەبجە) هاتەدنیا، دەسـتی کـرد بـە خوێنـدن، لـە قوتابخانـەی خۆیان قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، سـاڵی ١٣١٩ك – ١٩٠١ز بـاوکی کۆچـی دوایـی کرد، ئەویش چووە (بیارە) لای مەلا قـادر ئیجـازەی وەرگـرت، گـەڕاوە (هەڵەبجـە) لـە شوێنی باوکی کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن و مودەرریس، دەستی کرد بە جێبەجێ کردنـی کاروباری مەلایەتی، ئامۆژگاری خەڵکان، بەخێوکردنی هەژاران، خزمەتی مێوانان، سـاڵی

١٣٥٧ك – ١٩٣٨ز کۆچی دوایی کرد، مەلا جەمیلی کوڕی جێگری بوو، ئەویش ساڵی ١٣٨٧ك – ١٩٦٧ز کۆچی دوایی کرد، مەلا خالیدی برای بووە جێگری.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٦٧ – ٥٦٨.

## مصطەفا نەجیب قەرەداغی (١٦٤٣)

ناوی مصطەفایە، کوڕی شێخ نەجیبی کوڕی شێخ عبداللطیفی کوڕی شێخ عبداللهی کوڕی شێخ عوسمانی کوڕی شێخ عبداللطیفی قەرەداغی یە، ساڵی ١٣٠٣ك – ١٨٨٥ز هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی پەروەردە بوو، خوێندی، بووە مەلا، هەر لەلای ئەو ئیجازەی وەرگرت.

مامۆستا زیرەك و بیرتیژ بوو، لە زانستەکانی ئەقڵی و نەقڵی شارەزا بوو، بۆ فتوای شەرعی ڕوویان تێ دەکرد، نامیلکەی ژمێریاری داناوە، ئاماژەی بە زاراوەکانی کەون و نوێ کردووە، دۆستایەتی لەگەڵ شێخ مصطەفای نەقشبەندی هەولێر بەهێز بووە، ماوە لە (قەرەداغ) تا دوا عەمری ڕژێمی بەعسی ڕووخاو ناچاری کرد بێتە سلێمانی لە مزگەوتی شێخ عبدالرحمان عازەبانی نیشتەجێ بوو.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٩٠ك – ١٩٧٠ز کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی هەبوو: جەمال و بەهائەدین.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٦٨ – ٥٦٩.
٢. بنەماڵەی زانیاران ١٦٠.
٣. إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٣١.

## مظفر حەسەن سەلماسی (١٦٤٤)

ناوی مظفرە، نازناوی ئەبولحەسەنە، کوڕی حەسەنی کوڕی موهەننەدی سەلماسییە، ساڵی ٣٥٩ك – ٩٦٩ز چووە (ئەصفەهان)، پاشان گەڕاوە (عێراق)، لای زانا بەرزەکانی

وەك عوسمان ئیسماعیل بەغدایی دەرسی خوێند، بووە مەلا، دەرسی بە ئەحمەد موسای فەرمووەدەناس، داوە.

سەرچاوە: الأنساب ٣/٢٩٨.

## مظفر حوسێن بروجردی (١٦٤٥)

ناوی مظفرە، کوڕی حوسێنی کوڕی مظفری کوڕی عوبێداللە یە، خەڵکی (بروجرد)ە، لە ١٠ی جیمادی یەکەم، ساڵی ٤٥٥ك – ١٠٦٣ز هاتەدنیا، لە (بەغدا) فێری شەریعەت بوو، دوای ساڵی ١١٣٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٧١.

## مظفر قاسم شارەزوری (١٦٤٦)

ناوی مظفرە، کوڕی قاسمی کوڕی عەلی شارەزوورییە، ساڵی ٤٥٧ك – ١٠٦٥ز لە هەولێر هاتەدنیا، پاشان چووە (موصل) دوایی چووە (بەغدا)، دەرسی شەریعەتی لای ئەبو ئیسحاقی شیرازی و ئەبو نەصری زەینەبی خوێند، کرا قازی (ژەنگار)، ساڵی ٥٣٤ك – ١١٣٩ز سەفەری بەغدای کرد، دەرسی فەرمووەدەی دەداوە، لە ٥٣٦ك – ١١٤١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. وفيات الاعيان ٣/٢٣٣.
٢. تأريخ أربيل ١/٢١١ /٢/٣٦١.
٣. أربيل في مختلف العصور ٢٢.
٤. أربيل في العهد الأتابكي ٣٥.
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٧١.
٦. طبقات الشافعية الكبرى ٤/١٩٣.
٧. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ٢/٩٩.
٨. الأنساب ٣/٤٨٩.

٩. تأريخ مشاهير كورد ١/٣٩.
١٠. معجم أعلام الكورد ٧١٥.
١١. شذرات الذهب ٤/١٢٤.

## موعەد نصرالله جزیری (١٦٤٧)

ناوی موعـەدە، کـوڕی نەصـروالله کـوڕی ڕەجـەبی کـوڕی ئەبوفـەتحی کـوڕی حەسەنی کوڕی ئیسماعیلی جزیرییە، نازناوی (شەمسەدین – ئـەبو نەدا)یـە، لـە (بەغـدا) دانیشتووە، وەزیرەکی نووسەر و شاعیر بووە، ساڵی ٦٧٢ك – ١٢٧٠ز کتێبـی (المقامات الزينية)ی داناوە، ساڵی ٧٠١ك – ١٣٠١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٢/٣٠٤ – ٣٠٥.
٢. كشف الظنون ٢/١٧٨٥.
٣. معجم أعلام الكورد ٧١٦.
٤. هدية العارفين ٢/٤٦٥.

## مەعروف ئیسماعیل جلبەسەری (١٦٤٨)

ناوی مەعروفە، کوڕی سەید ئیسماعیلی کوڕی سەید نەسیمە، ساڵی ١٩١٠ز لە گوندی (جلبەسەر) هاتەدنیا، لەو گوندە دەستی کرد بە خوێندن دوایی چـووە (سـێکانی) لای مەلا عبـدالرحمانی بـەگزادە (لارە)، دوایـی چـووە (گردەسـۆر) لای مـەلا مـەحمود، ماوەکیش چووە لای مەلا شەریفی دووشـیوانی، مـاوەکیش چـووە لای مـەلا عبـدالقادر سێگرتکانی، دوایی چووە (قەشقە) لای مەلا ئیسـماعیلی نـاقیص، پاشـان چـووە هـەولێر مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لای مـەلا محەممەدئـەمینی کونەفلوسـەی ئیجـازەی وەرگـرت، گەڕاوە (جلبەسەر) چەند ساڵان کاروباری مەلایەتی ئەنجام دەدا، دوایی باری کـرد، هاتـە هەولێر لە ٢٠/١٢/١٩٩٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی

## مەعروف ئەمین قەرەداغی (١٦٤٩)

ناوی مەعروفە، کوڕی شێخ ئەمینی قەرەداغی یە، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، هەر لەلای ئەو کۆتایی پێ هینا، دانیشت لە مزگەوت و قوتابخانەکەی باوکی، کاروباری مەلایەتی و دەرسی فەقێیانی ئەنجام دەدا، زانایەکی زۆرزان بوو، جێ متمانەی خەڵکان بوو بۆ پرس و ڕا، ساڵی ١٣٧٠ك – ١٩٥٠ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (سەیوان) بە خاك سپێردرا، دوو کوڕی هەبوو: شێخ مصطەفا و شێخ محەممەد.

سەرچاوە: بنەماڵەی زانیاران ١٥٢.

## مەعروف عبدالرحمان نێرگسەجاڕی (١٦٥٠)

ناوی مەعروفە، کوڕی شێخ عبدالرحمانی کوڕی شێخ قادری کوڕی شێخ عبدالعزیزی (نێرگسەجاڕ)ە، دەوری ساڵی ١٢٨٠ك – ١٨٦٣ز هاتەدنیا، ساڵی ١٨٧٠ز لەبەر خوێندنیان دانا، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، وردە کتێبەکانی خوێندن، بۆ مەبەستی فەقێیەتی چووە حوجرەکانی فەقێیان لە (شارەزور)، ماوەك لە (هەڵەبجە) بوو، پاشان چووە (دەوڵەتناوا) گەڕاوە (هەڵەبجە)، لە قوتابخانەی شێخ مەحمودی موفتی ماوە، تا کۆتایی بە خوێندن هینا.

مەلایەتی: هەر لەو خوێندنگایە لەسەر داوای شێخ مصطەفا شێخ مەحمود، کرا (مودەڕریس)، دە ساڵان لەوێ دەرسی داوە، شێخ مصطەفا عائیشەخانی کچی خۆی پێدا، پاشان کوڕەکی بوو، لە تەمەنی نۆ ساڵیدا (مار) پێی وەدا، جوانەمەرگ بوو، مامۆستا لەبەر گریان و پەرۆشی چاوەکانی نزم بوون، بۆ چارەسەری چووە (بیارە) لای شێخ عومەر، چاوی تێمار کرد، هەروەها تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ وەرگرت، گەڕاوە (هەڵەبجە)، پاشان باری کرد بۆ (نێرگسەجاڕ)، لەوێ دەستی کرد بە ویرد و دابی تەریقەت، دوایی لەسەر فەرمانی شێخ چووە (ئەحمەد بڕندە)، لەوێ تەکیەی بۆ مریدان و مێوانان دروست کرد.

مەلا ئەحمەدی (فەوزی) دەربارەی تەکیەی (ئەحمەد بڕندە) دەڵێ:

ئەم تەکیەیی شێخ مارفە، چوار فەسڵە بەهارە

جێی سونبول و گوڵ، یا سەمەن و سەرو و چنارە

ئەم سەحنە چ سەحنێکە، کە ڕێی هەر کەسی تێکەوت

دەرچوونی لە بۆ باغی ئیرەم، زەحمەت و عارە

کوحلی بەصەرە ئەصڵی کەمالاتە غوباری

هەرچەندە لەبەر صەفوەتی، خالی لە غوبارە

لە کۆتاییدا دەڵێ:

(فەوزی) چ دەڵێ گەر شەو و ڕۆژ مەدحی بکەم من

نایێتە نیهایە، بە مەسەل (یەك لە هەزارە)

خووڕەوشتی: زاتێکی خوایی بوو، یارمەتی هەژاران و بێ نەوایانی دەدا، هەتیوی بەخێودەکردن، پەروەردەی دەکردن، لەبەر خوێندنی دادەنان، چاودێری دەکردن تا دەبوونە مەلا، شێخ مارف سەرپەرشتی سێ مەردەسەی گەورەی دەکرد، مەلای چاکی بۆ دادەنان:

١. نێرگسەجاڕ: شێخ عبداللە شێخ محەممەدئەمینی بۆ دانا.

٢. وازوول: مەلا عبدالعزیزی بۆ دانا.

٣. ئەحمەدبڕندە: مەلا عبدالرحیمی چورستانی بۆ دانا.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٣١ك – ١٩١٣ز لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد، لە ئەحمەد بڕندە بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. یادی مەردان ٢/٥٣٢ – ٥٣٨.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٨٧ – ٥٩١.

## مەعروف عبدالغنی ڕەصافی (١٦٥١)

ناوی مەعروفە، کوڕی عبدالغنی یە، ساڵی ١٢٩٢ك – ١٨٧٥ز لە بەغدا هاتەدنیا، لە گەڕەکی (ڕەصافە) پەروەردە بوو، عومەر کەحالە لە کتێبی (معجم المؤلفین) دەڵێ: {عەشیرەتی جەبارەیە لە کەرکوك}، لەوانەیە (جەباری) بی، هەروەها لە پەراوێزەکە دەگێڕێتەوە: {ناوبراو باوکی کوردە، دایکی عەرەبی کۆچەرە}، بۆ خوێندن ناردرا قوتابخانەی (ڕشدیە)ی عەسکەری، لەوێ دە ساڵان لای مەحمود شوکری ئالوسی خوێند، کرا مامۆستا، پاشان کرا مامۆستای ئامادەیی دوایی چووە (قوسطەنطینییە) لەوێ کرا مامۆستای قوتابخانەی مەلەکی، دوایی کرا (نائیب)، چووە (دیمشق)، لە قودس کرا مامۆستا، گەڕاوە (بەغدا)، کرا جێگری سەرۆکی لیژنەی تەرجومە لە وەزارەتی پەروەردە، پاشان ڕۆژنامەی ئەمەلی دەرکرد، دوایی کرا پشکێنەر لە وەزارەتی پەروەردە، پاشان کرا سەرۆکی لیژنەی داڕشتنی زاراوەکانی زانیاری، دوایی کرا ئەندامی کۆڕی نائیبان، گەڕاوە (دیمشق) لەوێ کرا ئەندامی کۆڕی زانیاری عەرەبی، چووە (میصر)، چەند پارچە شیعری بە (ڕەشید عالی گەیلانی) دا هەڵگوت، کە شۆڕشەکەی (گەیلانی) سەری نەگرت، گەیلانی ئاوارە بوو، ڕەصافی لەلایەن مەلیکی عێراق بێ ڕووەت ما، ڕێزی جارانی نەما، لە ماڵەوە دانیشت، مەرحەبای لێ نەکرا، ساڵی ١٣٦٤ك – ١٩٤٥ز کۆچی دوایی کرد، لە گەڕەکی (ئەعزەمییە)، لە تەك گۆڕی شاعیری کورد جەمیل صیدقی زەهاوی، بە خاك سپێردرا.

بەرهەمەکانی: (دیوان الرصافي): دوو بەرگە، وە (دفع الهجنة في ارتفاع اللكنة) و (نفح الطيب في الخطابة والخطيب) و (دروس تأريخ آداب اللغة العربية) و (ديوان الأناشيد).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٢/٣٠٦.
٢. نثر الجواهر والدرر ٢/١٦١٧ – ١٦١٨.
٣. مشاهير الكورد ٤٠٨ – ٤١٠.

٤. الأعلام ٨/١٨٤ – ١٨٥.
٥. لب الالباب ٢/٣٣٥ – ٣٣٨.
٦. معجم أعلام الكورد ٧١٧ – ٧١٩.

## مەعصوم خضر هەورامی (١٦٥٢)

ناوی مەعصومە، کوڕی مەلا خضری هەورامی یە، ساڵی ١٩١٢ز لە (کۆیە) هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چوە (دووگرتکان) لای مەلا محەممەد میر، دوایی چووە (ترپەسپیان) لای مەلا شێخ جەلال، گەڕاوە کۆیە لای مەلا تەوفیق مەلا ئیمام و لای مەلا صادیق و لای مەلا ئەحمەدی ماوەکی خوێند لە مزگەوتی مەلا (جامی)، هەروەها کتێبی (قازی لاری) لای مەلا بەهائەدین خوێند لە مزگەوتی (بایز ئاغا)، ئەمجا چووە لای جەنابی مەلا محەممەدی جەلی ئیجازەی وەرگرت، بووە مەلا لە مزگەوتی حاجی مەلا عومەر، دوایی چووە مزگەوتی گەورەی (کۆیە)، بەردەوام بوو لەسەر دەرسدانەوە، تا ساڵی ١٩٦٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. محمد بن عبدالله الجلي ١٢٦.
٢. دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## مەعصوم ضیاءالدین نەقشبەندی (١٦٥٣)

شێخ مەعصوم، ناسراوە بە محەممەد مەعصوم نەوەی (ضیاءالدین) شێخ عومەری بیارەیە، بە گەنجی چوو بۆ (ئێران) لەوێ چووە شاری (تەوریز) شەوێك لە خەو پێیان وت: ڕوو بکە خوێندن و زانست، بەڕێ کەوت بگەڕێتەوە (بیارە)، لە (مەهاباد) چاوی بە قازی محەممەد کەوت، ئەویش بردیە لای قازی عەلی باوکی، ئەو پێی وت نابی بڕۆی دەبی لێرە بخوێنی، شێخ لەوێ دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، لە قۆناغی موستەعیدی چووە لای مەلا حوسێنی مەجدی، ماوەکیش چووە لای مارفی کۆکۆی،

دوایی چووە (حەمامیان) ناوچەی (موکریان)، گەڕاوە (بیارە) لە خزمەت مەلا عبدالکریمی مودەڕریس کۆتایی بە خوێندن هێنا.

هەروەها لە خزمەت شێخ عەلائەدینی مامی ئیجازەی تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت، کرا سەرپەرشتکاری قوتابخانە و خانەقا، پاشان گەڕاوە (مەهاباد) لەوێ قازی محەممەد زۆر ڕێزی لێنا، پرس و ڕای پێ دەکرد، دوای شەهیدکردنی قازی شێخ گەڕاوە (بیارە)، ساڵی ١٩٥٨ز دووبارە گەڕاوە (مەهاباد)، ساڵی ١٩٧٩ز گەڕاوە (عێراق) لە وڵاتەکەی دابەزی دیتی خەڵکەکە وەك جاران ڕوو لە ئاین نەماوە، زۆریان خەریکی براکوژی و تاڵان و ئاژاوەن، ڕووی کردە (ئەمریکا) لەوێ نیشتەجێ بوو، خەریکی جێبەجێ کردنی داب و دەستووری تەریقەت بوو، چەند دکتۆر و ئەندازیار و سەرۆك دەوڵەتانی ئیسلام تەریقەتیان لەسەر دەستی ئەو وەرگرت، لە ڕۆژی دووشەممەی ٨/١/٢٠٠٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: خۆری ئیسلام ٢٠٠٧/٣٤ز.

## مەعقەل عبیدالله جزیری (١٦٥٤)

ناوی مەعقەلە، کوڕی عوبێدوالله یە، خەڵکی (جزیرە)یە، مامۆستایەکی فەرموودەناس و بڕواپێکراو بووە، زانیاری لە عەطای کوڕی ڕەباح و مەیمونی کوڕی مەهران وەرگرتووە، ساڵی ١٦٦ك – ٧٨٢ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: شذرات الذهب ١/٢٦١.

## مەقصود ئەفەندی کوردستانی (١٦٥٥)

مەقصود ئەفەندی خەڵکی شاری سلێمانییە، لە (ئەرزەڕۆم) نیشتەجێ بووە، زانایەکی بە توانا بووە، چەند دانراوی هەیە، لەوانە: (حاشیە لەسەر تەفسیری بەیزاوی) و (حاشیە لەسەر شەرحی شافیە) و (شەرحی کلمة التوحید (لااله الا الله)).

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٤١٣.

٢. معجم أعلام الكورد ٧٢٥.

٣. تأريخ مشاهير كورد ٢/١٦٨.

## مەکارم سالم حەڕانی (١٦٥٦)

ناوی مەکارمە، کوڕی سالمی کوڕی مەکاریمی کوڕی سووەیدی کوڕی عەلی حەڕانی یە، نازناوی (ئەبولفەضل شەهابەدینە)، لە مانگی ذی القعدە، ساڵی ٦٣٦ك – ١٢٣٨ز هاتەدنیا، خەریکی خوێندنی فەرموودە بوو، تا گەیشتە ئەو پلەیە دەرسی دەداوە، مامۆستا زانایەکی ئەهلی تەصەووف بوو، لە ١١ی (محرم)ی ساڵی ٧٢٤ك – ١٣٢٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٣٥٧/٤.

## مەلا شێخ ئیلیاس شنۆیی (١٦٥٧)

ناوی مەلا شێخە کوڕی صۆفی ئیلیاسی شنۆیی یە، لە (ورمێ) هاتەدنیا، لە (شنۆ) پەروەردە بوو، پاشان چووە (مەدینە)ی پیرۆز، لەوێ حاشیەکی نایابی لەسەر حاشیەی صبغةالله لەسەر تەفسیری بەیزاوی نووسی، هەروەها شەرحی (الزوراء والحوراء)ی جەلالەدینی دەوانی کردووە، پێشکەشی بە شەڕەفخانی میری جزیرە کردووە.

سەرچاوە: بوژاندنەوە ٣٤٣/١ – ٣٤٥ /٢٨٣/٣ – ٢٨٦.

## مەمدوح سەلیم مزوری (١٦٥٨)

ناوی مەمدوحە، کوڕی سەلیمی کوڕی نەجمەدینە، ساڵی ١٩٢٨ز لە گوندی (ئێدلبێ) هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە لای مەلا یەحیای گەردی، پاشان چووە لای مەلا مصطەفای (هیرانی)، دوایی چووە (ئاکرێ) لای مەلا هیبةالله موفتی، پاشان چووە (ڕواندز) لای مەلا عبدالکریم ئەفەندی خەیلانی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

بووە مەلا لە (گەرەوان)ی گەروە، دوایی هاتە مزگەوتی گەیلانی لە ڕواندز، ماوەك ئاوارەبوو بۆ (ئێران)، دوایی گەڕاوە مزگەوتی حاجی جەمال لەگەڕەکی موفتی لە

هەولێر چەند ساڵ لەوێ دەرسی دا، چەند ئیجازەی مەلایانی بە دەرچووانی قوتابخانەکەدا، پاشان باری کرد بۆ (سۆران).

کتێبی (بنەماڵانی ڕواندزی) داناوە، چاپ کرا لە هەولێر ساڵی ١٩٩٨ز.

سەرچاوە: دەستووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## موسا ئەعین حەڕانی (١٦٥٩)

ناوی موسایە، کوڕی ئەعینی خەڵکی (حەڕان)ە، بۆ خوێندن هاتە عێراق، دەرسی فەرموودەی لە عبدالله ی کوڕی محەممەدی کوڕی عەقیل وەرگرت، ساڵی ١٧٧ك – ٧٩٣ز کۆچی دوایی کرد، بەڵام سەمعانی ساڵی ١٩٧ك – ٨١٢ز داناوە.

سەرچاوەکان:

١. سیر أعلام النبلاء ٦/١٥٢.

٢. شذرات الذهب ١/٢٨٨.

٣. الأنساب ٢/٨٠.

## موسا بایەزید تەومککەلی (١٦٦٠)

ناوی موسایە، کوڕی بایەزیدی کوڕی بایەزیدی کوڕی عەلی کوڕی خەسرۆی کوڕی هەمزەیە، دەوری ساڵی ٩٥٠ك – ١٥٤٣ز هاتەدنیا، زانایەکی خۆشنووس بوو، نووسخەکی قورئانی پیرۆزی بە دەستی خۆی نووسیوە، ساڵی ٩٨١ك ژنی هینا، ساڵی ١٠٠٥ك خێزانەکەی کۆچی دوایی کرد، ساڵی ١٠٢٧ك – ١٦١٨ز خۆی کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. بنەماڵەی زانیاران ٥٤٣.

٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٧/١٣١ – ١٣٢.

## موسا حامید دیاربەکری (١٦٦١)

ناوی موسایە، نازناوی (عەزمی)یە، ناسراوە بە (حامید خۆشنووس) کوڕی (ذوالفقار) ئاغایە، ساڵی ١٣٠٩ك – ١٨٩١ز لە (دیاربەکر) هاتەدنیا، لە (ئەستەمبۆڵ) لای محەممەد نەزیف خۆشنووس دەرسی خەتی خوێند، لە سەدەی چواردە بەناوبانگترین کەس بوو لە خەتخۆشی، چەندان نووسخە قورئانی پیرۆزی بە دەستی خۆی نووسیتەوە، دوا عەمری سێ نوسخەی تایبەتی نایابی نووسییەوە، ساڵی ١٤٠٣ك – ١٩٨٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: عقد الجوهر ١٧٧٥.

## موسا حەسەن ئالانی (١٦٦٢)

ناوی موسایە، کوڕی حەسەنی (ئالانی)یە، ناسراوە بە مەلا موسای کوردی، مەزهەبی شافیعیە بووە، لە وولاتی خۆی خوێندووە، لە (حەلەب) دابەزیوە، ماوەك لەوێ خەریکی خوێندن بوو، دوایی چووە (مەککە)ی پیرۆز، تەفسیری بەیزاوی لەلای مەلا ئیسماعیل شەروانی خوێند، چووە (ئەنطاکییە) شەرحی تەجرید و چغمینی خوێند، گەڕاوە (حەلەب)، خەریکی نووسین و دەرسدانەوە بوو، بەتایبەت (بەلاغە)، ڕۆژ بە ڕۆژی بوو، شەوان خەریکی شەو نوێژ بوو، دڵفراوان و چاوبلند بوو، ڕوو لە خوا و دوور لە دنیا بوو، مانگی شەعبانی ساڵی ٩٣٠ك – ١٥٢٣ز بە نەخۆشی تاعون لە حەلەب کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شایەکان بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٨/١٧٧ – ١٧٨.

٢. مشاهير الكورد ٤١٧ – ٤١٨.

٣. معجم أعلام الكورد ٧٢٧.

## موسا حوسێن ئالانی (١٦٦٣)

ناوی موسایە، کوڕی حوسێن عیوەزی کوڕی موسافیری کوڕی حەسەنی کوڕی مەحمودی کوردی (ئالانی)یە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (حەلەب) دابەزیوە، لای مەلا چاکەکانی خوێندووە، دوایی هاتە (ئامێدی) دەرسی دەدا، دوایی وازی هینا خەریکی تەصەووف بوو، لای شێخ عەلوان لەشاری (حەما).

پاشان گەڕاوە (حەلەب)، دەرسی دەدا چەند قوتابیان لەوانە: (ابن الحنبلی) بوو، دوایی لە خانەقای (زەینەبییە) شێخاتی ئەنجام دەدا، چەند مریدی هەبوون سفرە و خوانی بۆ مێوانان ڕێزدەکرد، مێوانداری سۆفییەکانی دەکرد، زاتەکی قسەخۆش و مەجلیس خۆش بوو، دیمەن ڕێك و زمان ڕەوان بوو، لە تەفسیر و حەدیس و تەصەووف شارەزابوو، ساڵی ٩٣٩ك – ١٥٣٢ز کۆچی دوایی کرد، لەسەر وەسیەتی خۆی لە گۆڕستانی (الصالحین) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٨/٢٣٦.
٢. مشاهیر الکورد ٢/٢١٠.
٣. معجم أعلام الکورد ٧٢٨.

## موسا عەلی زەرزاری (١٦٦٤)

ناوی موسایە، کوڕی عەلی کوڕی موسای کوڕی یوسفی کوڕی محەممەدە، نازناوی (ضیاءالدین)ە، عەشیرەتی زەرزارییە، ساڵی ٦٥٨ك – ١٢٦٠ز لە هەولێر هاتەدنیا، باوکی قازی ئەو شارە بوو، مەلا موسا بۆ خوێندن چووە (بەغدا)، دوایی چووە (قاهیرە) هەردوو تەفسیرەکەی (کەواشی) گچکە و گەورەی لەلایەن خاوەنی تەفسیرەکە خوێند، مامۆستا زاتەکی هێمن و دیمەن جوان و پڕ خێر و بەرەکەت بوو، ووتارخوێن بوو، دەرسی زانستەکانی قورئانی پیرۆزی دەداوە، شاعیرەکی چاك بوو، بۆ نمونە بە عەرەبی دەڵێ:

تواضعْ كما النجمُ استبانَ لناظرِ على صفحاتِ الماءِ وهو رفيعُ
ولا تكُ كالدخانِ يرفعُ نفسَه الى طبقاتِ الجوِّ وهو وضيعُ

کۆچی دوایی: لە کاتی سوجدەی نوێژ لە ١١ی ڕەجەب، ساڵی ٧٣٠ك – ١٣٣٠ کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٤/٣٧٨ – ٣٧٩.

### موسا کفتارۆ (١٦٦٥)

مامۆستا مەلا موسا کفتارۆ لە زانایە بەرزەکانی کوردی تورکیایە، لە شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندە، لە شاری (کرما)ی سەر بە (مادرین) هاتەدنیا، خوێندنی تەواوکرد، ئیجازەی تەریقەتی وەرگرت، پاشان ئاوارەبوو بۆ (سوریا) لە (دیمشق) نیشتەجێ بوو، لە مزگەوتی (أبو النور) دەرسی دەدا بە زمانی کوردی و عەرەبی ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد، تا کۆچی دوایی، مامۆستا باپیری شێخ ئەحمەد کفتارۆی سەرۆکی زانایانی سوریایە، کە لە پێشدا باسمان کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٧٣١.

### موسا محەممەد هەولێری (١٦٦٦)

ناوی موسایە، کوڕی محەممەدی کوڕی موسای کوڕی یونسی کوڕی ڕەضی کوڕی یونسی هەولێرییە، لەو شارە و دەوروبەری فێری شەریعەت بوو، پاشان کرا قازی (موصل)، زانایەکی زمان ڕەوان و ووتارخوێن بوو، لە بنەماڵەکی خانەدانی زانیاری پەروەردە ببوو، ساڵی ٧١٥ك – ١٣١٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٤/٣٨١.

### موسا یونس هەولێری (١٦٦٧)

ناوی موسایە، کوڕی یونسی کوڕی محەممەدی کوڕی مەنعەی کوڕی مالیکە، نازناوی (کەمالەدینە)، ساڵی ٥٥١ك – ١١٥٦ز لە (موصل) هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی شەریعەتی خوێند، دوایی چووە مەدرەسەی (النظامية) لە (بەغدا)، لەوێ دەرسی دەخوێند

و دەرسی دەدا، گەڕاوە (موصل) لە مزگەوتی (زین الدین) شوێنی باوکی دەستی کرد بە دەرسدانەوە، ئبن خەلەکان دەڵێ: {لەبەر ئەوەی برادەری باوکم بوو، زۆرجاران دەچوومە لای یەك لەو جارانە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٦٢٦ك بوو}

ماموستا زانیاری لەو بابەتانە بەهێزبوو: (أصول الفقه)، (کەلام)، (فەلەك)، (حیکمەت)، (مەنتیق)، (طب)، (هەندەسە)، (حیساب)، (جەبر)، (موقابەلە)، (پێوانی ئەرز)، (مۆسیقا)، (وەفق)، ساڵی ٦٣٩ك – ١٢٤١ز لە (موصل) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. طبقات المفسرين ٢/٣٤٣.
٢. وفيات الأعيان ٦/٣٩٦.
٣. تأريخ أربيل ١/٢٢٧ /٢/٩٧.
٤. أربيل في مختلف العصور ٧٣ – ٩٤.
٥. أربيل في العهد الأتابكي ٢٨٣ – ٢٨٥.
٦. هدية العارفين ٦/٤٧٩.
٧. إيضاح المكنون ٤/١٣٥.
٨. مشاهير الكورد ٢/٢٠٨.
٩. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٩١ – ٥٩٨.
١٠. معجم المؤلفين ١٣/٥١.
١١. شذرات الذهب ٥/٢٠٦ – ٢٠٧.
١٢. منهل الأولياء ١/٢١٢ – ٢١٣.
١٣. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٤٦١.
١٤. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ٢/٥٧٠.
١٥. سير أعلام النبلاء ١٣/٢٥٦.
١٦. الأعلام ٨/٢٥٠ – ٢٨٨.

١٧. معجم أعلام الکورد ٧٣٠ – ٧٣١.

١٨. ژیناوەری زانایانی کورد ٤٦٨.

## مەولود لطف الله حەنەفی زادە (١٦٦٨)

ناوی مەولودە، کوڕی لطف‌الله ئەفەندی کوڕی داودە، نازناوی (حەنەفی زادە)یە، یەك بووە لە مەلایە چاکەکانی هەولێر، هاوچەرخ بووە لەگەڵ شێخ ئەبوبەکری (هەرشەمی)، مامۆستا مەلا عبدالله فەرهادی لە جەنابی شێخ مصطفای نەقشبەندی دەگێڕێتەوە: {ڕۆژانی سێشەمە و ڕۆژانی هەینی – کە لە کۆنەوە کاتی پشوودانی خوێندنی مەلا و فەقێیان بوو – مەلایەکان لەلای مەلا مەولود کۆدەبوونەوە، گفتوگۆیان لەسەر تەفسیری بەیزاوی دەکرد، ئەگەر گەیشتبانە جێیەك زەحمەت و ئالۆزبایە، ئەو بۆی ڕۆن دەکردنەوە}.

مەلا مەولود کۆچی دوایی کرد، چوار کوڕی هەبوون: (عبداللطیف) و (عبدالقادر) و (مەلا تەوفیق) و (عبدالکریم): ئەوەبوو ساڵی ١٣٠١ك – ١٨٨٣ز دانراوێکی مەلا مەحمودی خەواهیرزادە، لە بابەت (مەصدەر) نووسیەوە.

سەرچاوە: الإکلیل في محاسن أربیل ٢٤٣ – ٢٤٤.

## مونیسە ئەبوبەکر ئەییوبی (١٦٦٩)

خاتوون مونیسە کچی مەلیك ئەبوبەکری کوڕی ئەییوبە، ساڵی ٦٠٣ك – ١٢٠٦ز هاتەدنیا، خانمەکی فەرموودەناسی بەناوبانگ بووە، دەرسی بە عبدالله موسای شەریعەت زان داوە، لە مانگی ڕەبیعی دووەم، ساڵی ٦٩٣ك – ١٢٩٤ز لە (قاهیرە) کۆچی دوایی کرد، لە (باب زەویلە) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. البدایة والنهایة ١٣/٣٤١.

٢. معجم أعلام الکورد ٧٣١.

٣. مشاهیر الکورد ٢/٢٥٠.

## مەوهوب عومەر جزیری (١٦٧٠)

ناوی مەوهوبە، کوڕی عومەری کوڕی مەوهوبی کوڕی ئیبراهیمە، نازناوی ئەبومەنصور (صدر الدین)ە، مەزهەبی شافیعی بووە، خەڵکی جزیرەی بۆتانە، لە (شام) فێری شەریعەت و زانیاری بووە، لە (میصر) کرایتە قازی، ساڵی ٥٩٠ك - ١١٩٤ز لە دایك بوو، ساڵی ٦٧٥ك - ١٢٧٦ز کۆچی دوایی کرد، کتێبانی: (الدرر المنظوم في حقائق العلوم) و (الفتاوي)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٢/٢١٠.
٢. إيضاح المكنون ٣/٤٥١.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٩١.
٤. معجم المؤلفين ١٣/٥٤.
٥. كشف الظنون ٢/١٢٣٠.
٦. شذرات الذهب ٥/٣٢٠.
٧. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٤٦٦.
٨. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ١/٣٧٩.
٩. بغية الوعاة ٢/٣٠٩.
١٠. هدية العارفين ٢/٤٨٣.
١١. معجم أعلام الكورد ٧٣١.

## مەیمون ئەصبەغ نەصیبی (١٦٧١)

ناوی مەیمونە، کوڕی ئەصبەغی کوڕ فوڕاتە، خەڵکی شاری (نوسەیبین)ە، فەرموودەی لە یەزیدی کوڕی هاڕون گێڕایتەوە، عومەری کوڕی عبدالعزیزی نوسەیبی لەو زاتەی وەرگرتووە، ساڵی ٢٥٦ك - ٨٦٩ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ٥/٣٩٣.

٢. اللباب ٣/٣١٢.

## میرزا مەحمود قازی (١٦٧٢)

میرزا مەحمود یەکە لە زانایەکانی کوردی (ئێران)، لە کۆتایی صەدەی حەڤدەی زایینی کرا قازی (موکری)، زاتەکی شەریعەت زان بوو، بەشێکی زۆری لە توحفەی ئیبن حەجەر تەرجومە کردووە، وەلای زمانی (فارسی)، خەتی خۆش بووە، ناسراوە بە (زەعیم الخطاطین) سەرۆکی خۆشنوسان.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٣٩٦.

٢. معجم أعلام الکورد ٧٣٢.

– ن –

## ناصر ئەحمەد خۆیی (١٦٧٣)

ناوی ناصرە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی بەکرە، نازناوی (ئەبولقاسمە)، خەڵکی (خۆی) ڕۆژهەڵاتی (وانە)یە، ساڵی ٤٦٦ك – ١٠٧٣ز هاتەدنیا، زانایەکی فەرموودەناس و شەریعەت زان و نەحوزان بووە، لە (ئازربێجان) کرایتە قازی، شەرحی (اللمع)ی ئیبن جینی کردووە، لە بابەتی (نەحو)، هەروەها شیعری هەیە، لە مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ٥٠٧ك – ١١١٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ١٣/٦٧ – ٦٨.

٢. کشف الظنون ٢/١٥٦٣.

## نامی عبداللە ئەفەندی (١٦٧٤)

مامۆستا نامی عبداللە، ساڵی ١١٦٧ك - ١٧٥٣ز لە هەولێر هاتەدنیا، خوێندی تا کرا (قازی)، لەگەڵ حاکمی هەولێر نەگونجا، چووە (بەغدا)، ماوەك دەرسی دەداوە، پاشان داود پاشای والی کردییە قازی (بەصرە)، ساڵێك لەوێ بوو، گەڕاوە (بەغدا)، ساڵی ١٢٤١ك - ١٨٢٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٧٣٩.

## نەبی صادق ماویلی (١٦٧٥)

ناوی نەبی یە، کوڕی صادقی کوڕی مەحمودە، ناسراوە بە (پیری ماویلی)، ساڵی ١٨٠٢ز لە گوندی (ماویلیان) ڕۆژهەڵاتی ڕواندز هاتەدنیا، لەلای مەلای ئەو گوندە دەستی کرد بە خوێندن، بەشێوەی فەقێیانی کوردستان، گەڕا لە چەند شوێنان، تا لە قۆناغەکان سەرکەوت، لە کۆتاییدا لەلایەن مەلا ئەبوبەکری میرڕۆستەمە و مەلا محەممەدی خەتی لە ڕواندز کۆتایی بە خوێندن هینا، گەڕاوە (ماویلیان) دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی، دەرسدانەوەی فەقێیان، چەند حاشیەی لەسەر شەرحی وەضع و ئیستیعارەی مەلا عبداللەی شێخ مەمونەدی نووسیوە، لەسەر نوسخە دەستخەتەکەی (باوکم) کە لامانە زۆریان نووسراون، هەروەها (شێخ نەبی) کتێبی (منبع الأعمال في تصحيح الأقوال والأفعال) لەسەرباسی (فروع التقليد)ی توحفە، داناوە دوا عەمری چووە (تەوێڵە) تەریقەتی نەقشبەندی لە سیراجەدین شێخ عوسمان وەرگرت، جەنابی شێخ کە دیتی لێهاتووە و شایەنی خەلیفاتییە، ئیزنی سەربەخۆی تەریقەتدانی پێدا، گەڕاوە (ماویلیان).

بەشێك لە خەلیفەکانی: شێخ عوسمانی دیرەی، شێخ مەلا عبدالرحمانی کەورین، شێخ مەلا غەفوری گەلالەی، شێخ عەباسی سەردڕی، شێخ مەلا خدری وەرتی، شێخ دێوانە، شێخ عبدالصمدی سەران، خەلیفە حارسی ماویلی: ئەوە زاوای شێخە.

شێخ زاتەکی بە دین و خواناس بوو، چەند کەراماتی لێ دەگێڕنەوە، مامۆستا عبدالکریم مودەرریس لە مامۆستا صالحی کۆزەپانکە دەگێڕێتەوە: {مامۆستا شێخ نەبی لەگەڵ مریدەکان بە سەفەر دەچی لە ڕێگا مارەك دەکوژن، شێخ دەڵێ: زگی شەق بکەن (فلان)گیان لەبەری لەناوە – ناوی دەبا –، زگی مارەکە شەق دەکەن فەرموودەکەی شێخ دەردەچی، ماری دووەم دەکوژن ناوی گیان لەبەرەکی دی دەبا، سکی مارەکە شەق دەکەن دیسان وەك فەرموودەی شێخە، جاری سێیەم ناوی گیان لەبەرەکی دی دەبا، هەروا دەردەچی، چەندجار مار دەکوژن شێخ دەڵێ: فلان گیان لەبەری لەناوە، هەروا دەردەچیت} .

ڕۆیشتنی لە ماویلیان: پاشان بەرە بەرە سۆفییەکان پتر دەبوون، شێخ نەبی جێگای فراوان نەبوو بۆیە باری کرد لە (ماویلیان) چووە دۆڵی (ڕەژی کەریان) لە ڕۆژهەڵاتی ماویلیان، لەوێ خانوو و خانەقای دروست کرد، مریدانیش هاتنە دەورەی ئاوەدانی پەیدابوو، ئەو گوندە ئێستا ناسراوە بە (خانەقا)، (شێخ نەبی) بەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، تا ساڵی ١٨٨٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٠١ – ٦٠٢.
٢. یادی مەردان ٢/٥٠٦ – ٥٠٨.
٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/٣٢١ – ٣٢٥.
٤. بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز ١٧٦ – ١٩٤.


## نەجمەدین جەلالەدین مەردۆخی (١٦٧٦)

ناوی نەجمەدینە، کوڕی جەلالەدینی کوڕی شێخ محەممەد وەسیمی مەردۆخی یە، زانایەکی بە توانا بووە، پاشان کرایتە قازی شەرعی، خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆز و فەتوادان بوو، تا ڕۆژی ٩ی جیمادی دووەم، ساڵی ١٣٤٢ك – ١٩٢٤ز لە شاری (سنە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأریخ مشاهیر کورد ٢/١٧٣.

## نەجمەدین عومەر بیارەیی (١٦٧٧)

ناوی نەجمەدینە، کوڕی (ضیاءالدین) شێخ عومەری بیارەیە، ساڵی ١٢٨٠ك – ١٨٦٣ز لە گوندی (بیارە) هاتەدنیا، لە بنەماڵەکی دڵپاك و دەروون چاك و ئاین خواز پەروەردە بووە، دەستی کرد بە خوێندن: قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، چەند بابەتی نەحو و صەرف و عەرەبی تەواوکرد، ماوەك خەریکی منهاجی ئیمامی نەوەوی بوو، شارەزاییەکی باشی پەیدا کرد، خەتێکی خۆش و جوانی هەبوو، نووسەر و خاوەن هەست و بیربوو، چەند پارچە شیعری هەیە، نازناوی (کەوکەب)ە.

شێخ نەجمەدین تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ محەممەد بەهائەدینی مامی وەرگرت، لەلایەن مامی کرا خەلیفە، لەگەڵ شێخ عەلائەدینی برای یارمەتی باوکیان دەدا بۆ ئامۆژگاری خەڵکان، بەخێوکردنی هەژاران، خزمەتی مێوانان و مریدان.

سیفەتەکانی: زاتەکی خواپەرست بوو، ڕوو لە خوا، دوور لە دنیا بوو، خۆڕاگربوو، پشتی بەخودا دەبەستا، پێکەنینی گرژینەوە بوو، یاوەری کتێب بوو، دۆستی زانایان بوو، مەلایان لەلای کۆدەبونەوە، فەرمانی بە یەکەك دەدا چەند لاپەڕەك لە (إحیاء علوم الدین)ی غەزالی، یان نەفەحاتی مەولانا (جامی) دەخوێندراوە، کۆڕەکە پیرۆز دەبوو بەم شێوەیە توانی زۆر کەسان بێنێتە سەر ڕێگای ڕاست، ئەوانەش خۆیان ببن بە گڵۆپی ڕۆناك و ڕێ نیشاندەر، دەنگوباسی چاکەیان ببێت بە بەرنامە، باس بکرێت هەتا هەتا.

ڕووداوێك: جارەك شێخ نەجمەدین بانگی کرد، ئەسپەکەم بۆ ئامادە بکەن، ئەسپەکەیان هینا، سواربوو، بەتەنیا بە غاردان چووە (هەڵەبجە)، بانگی طاهیر بەگی کرد: {وەرە پێم بڵێ تازە لەسەر قەبران کاتێ مەلا مردووەکەی (تەلقین) دەدا، چ پڕوپاگەندەکت هاتە ناودڵی ڕاستم پێ بڵێ؟}، کابرا وەڵامی داوە: {یا شێخ چت لێ بشێرمەوە، ڕاستی هاتە ناو دڵم: (ئەو مردووە، لەناو ئەو گۆڕە قورە، لەژێر خاك، چ

سوودێك لەو تەلقینە وەوردەگرێ)، بەڵام ئێستا تۆبە لەسەر دەستی جەنابت}، شێخ فەرمووی: منیش تەنیا بۆ ئەوە هاتم، گەڕاوە خواحافیزی کرد.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٣٧ك – ١٩١٨ز کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی هەبوو ناوی محەممەد، شاعیر بوو، نازناوی (نەجمی) بوو، ساڵی ١٣٣٥ك – ١٩١٦ز پێش خۆی جوانەمەرگ بوو.

سەرچاوەکان:

١. نثر الجواهر والدرر ١٦٣٧/٢ – ١٦٣٨.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٠٢ – ٦٠٣.
٣. بنەماڵەی زانیاران ٤١٤ – ٤١٦.
٤. تاریخ مشاهیر کورد ١٤٣/٢ – ١٦١.
٥. یادی مەردان ٢٨١/٢.

## نەجمەدین عیسا کوردی (١٦٧٨)

ناوی نەجمەدینە، کوڕی عیسای کوردییە، زانایەکی شەرع زان بووە، لە مەدرەسەی (ڕەواحیە)ی دیمشق دەرسی دەداوە، لە مانگی شەعبانی ساڵی ٦٥٦ك – ١٢٥٨ز کۆچی دوایی کرد، شەوی هەینی لە خەویان دیت، پرسیاری ڕوح کێشانیان لێ کرد، وەڵامی داوە: {کاتەکی کەمە، کە بە خزمەت بارەگای خوای گەورە گەیشتی، ئەو زۆر بە ڕوحمە}، لێیان پرسی ئەتو چۆنی؟ ووەڵامی داوە: {باشم سوپاس بۆ خودا}.

سەرچاوە: بستان العارفین / نەوەوی.

## نەجمەدین کەوکەبی (١٦٧٩)

مامۆستا نەجمەدین لە گوندی (دیوالدن)ی سەردەشت هاتەدنیا، کە فامی کرد ناردیانە بەر خوێندن، بەشێوەی فەقێیانی تری کوردستان، گەڕا لەو جێ بۆ ئەم جێ تا قۆناغەکانی خوێندنی بڕی، ساڵی ١٩٥١ز چووە لای مەلا عبداللەی گەناوی لە گوندی (میرزا ڕۆستەم)، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (ئێران) لە گوندی (بێوری)

خواری بووە مەلا، دەستی کرد بە دەرسدانەوە، ساڵی ١٨٥٦ز چووە (کەوپەڕ)، زۆر پـێ نەچوو باری کرد بۆ (ئالوەتان)، لەوێ ماوە تا سـاڵی ١٩٦٩ز، لـە بەندیخانـەی (ورمـێ) گیرا، نۆ ساڵان ماوە، لەو ماوە درێژە فێری زمانی ئینگلیـزی بـوو، هـەروەها ئامۆژگـاری خەڵکانی دەکرد، دەرسی دەداوە، یەك لە فەقێیەکانی بەندیخانە نـاوی مـەلا محەمـەد بـوو، خوێندنی تەواوکرد، ئیجازەی پێدا.

سوپاس بۆ خودا دوایی ئازاد کرا، لە (قەڵات)ی مەنگوڕان بووە مەلا، پـاش دوو ساڵ ئاوارە بوو، بۆ (عێراق) خۆی و ماڵ ومنداڵی بە زۆرداری بە دەستی ڕژێمی بەعسـی صەدام ڕەوانەی ئۆردوگای (ڕومادیـە) کـران، چـوار سـاڵ مـاوە لـەوێ، پاشـان چـووە (نەرویج)، لە کاتی نوێژکردن، لەسەر بەرماڵەکەی گیانی پاکی دەرچوو، لەوێ بـە خـاك سپێردرا، (مامۆستا کەوکـەبی) زیـرەك و چـاوقەیم و قەڵـەم لـەکاربوو، کتێبـی بـەناوی (روناکی چاوان) هەیە، شیعری زۆرن.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٣١٧ — ٣١٨.

## نەجیب عبداللطیف قەرەداغی (١٦٨٠)

ناوی نەجیبە، کوڕی عبداللطیفی کوڕی عبداللە ی کوڕی عوسمانی کـوڕی شـێخ عبدالطیفی گەورەیە، دەوری ساڵی ١٢٨٣ك — ١٨٦٦ز هاتەدنیا، لە قوتابخانـەی خۆیـان دەستی کرد بە خوێندن، هەر لـەوێ قۆناغەکانی تەواوکرد، چوە شاری (کفری) لای مـەلا شێخ حەسەنی قەرەداغی مامی ئیجازەی وەرگـرت، گـەڕاوە گونـدی (زەردیـاوا)، لـەوێ خەریکی: مەلایەتی، دەرسدانەوە، خزمەتی ئاینی پیرۆز، مێوانداری هەژاران و مێوانان بـوو، تا ساڵی ١٣٥١ك — ١٩٣٢ز لە (قەرەداغ) کۆچی دوایی کرد، سێ کوڕی هەبوو: شێخ مصطەفا، شێخ عبدالمجید، شێخ حەمید.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٠٣ — ٦٠٤.

٢. بنەماڵەی زانیاران ١٥٩ — ١٦٠.

## نەجیب عەینتابی (١٦٨١)

حاجی نەجیب، خەڵکی (عەینتابە)، زانا و دەرس بێژ بووە، لە مەدینەی پیرۆز دەرسی داوە، لە ژیانامەی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بی) شارەزابووە، شەرحی (شیفا)ی قازی عەیاضی کردووە، ساڵی ١٢١٩ک – ١٨٠٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٣/٨٠.

٢. إيضاح المكنون ٢/٥٢.

٣. معجم أعلام الكورد ٧٤٠.

## نەزیر ئیبراهیم تەوێڵەیی (١٦٨٢)

ناوی نەزیرە، کوڕی مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەلا مەحمودی کوڕی صۆفی ئەحمەدە، ساڵی ١٢٠١ک – ١٧٨٦ز لە گوندی (تەوێڵە) هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە کۆتاییدا ئیجازەی لە مەلا قاسمی شەرکان وەرگرت، پاشان سەفەری (بوخارا)ی کرد، لەوێ تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت، خەریکی جێبەجێ کردنی دابی تەریقەت و کاروباری مەلایەتی بوو، تا ساڵی ١٢٩٦ک – ١٨٧٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأريخ مشاهير الكورد ١/٤٦٠ – ٤٦١.

## نەسیبە یونس ئەییوبی (١٦٨٣)

نەسیبەخان، کچی مەلیك یونسی کوڕی مەحمودی کوڕی مەلیك ئەبوبەکری، کوڕی ئەییوبە، ئەو خاتوونە فەرمووودەناسەکی بەناوبانگ بووە، ساڵی ٦٦٧ک – ١٢٦٨ز لە تەمەنی نۆهەت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: مشاهير الكورد ٢/٢٥٠.

## نەسیم محەممەد سەعید موهاجیر (١٦٨٤)

ناوی نەسیمە، کوڕی محەممەد سەعیدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی مەحمودی کوڕی ئەحمەدی کوڕی شێخ مصطفای (تەختی)یە، دەوری ساڵی ١٢٢٣ک – ١٨٠٨ز لە شاری

(سنه) هاتەدنیا، لە بنەماڵەکی روو لە زانست و زانیاری و ئاین پەروەر پەروەردە بوو، لەلای شێخ عبدالقادری برای دەستی کرد بە خوێندن، هەر لە خزمەت ئەو کۆتایی پێ هێنا، هاتن بۆ (عێراق)، لە شاری سلێمانی نیشتەجێ بوون، شێخ نەسیم لە (خورماڵ) کرا مودەرریس، دەستی کرد بە دەرسدانەوە و ئامۆژگاری خەڵکان.

سیفەتەکانی: بە دین و خواناس و خواپەرست بوو، شەونوێژی نەدەچوو، دوایی نوێژان تا ماندوو دەبوو بە زمانی عەرەبی دەپاڕاوە، ئەمجا بە کوردی ئەمجا بە فارسی، ئەمجا بە هەورامی – زمانی باوك و باپیرانی –، ماوەك دەگریا پاشان دەنووست، خەتی خۆش بوو، چەند کتێبی نووسینەوە، لەوانە: (الأجوبة المرضية)ی شێخ عبدالوەهابی شەعرانی.

مامۆستا نەسیم ساڵی ١٣١٥ك – ١٨٩٧ز لە (خورماڵ) کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی هەبوون: شێخ جەعفەر و شێخ یەحیا.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەوی مێژووی زانایانی کورد ١/٣٢١ – ٣٢٤.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٠٦ – ٦٠٧.

٣. بنەماڵەی زانیاران ١٤٦.

## نەصر ئەحمەد نۆرمەوی (١٦٨٥)

ناوی نەصرە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی سناطە، خەڵکی (ورمێ)یە، زانایەکی شەرع زان بووە، مامۆستا عبدالکریم سەمعانی، دەڵێ: {ماوەك لە شاری (مەرو) پێکەوەمان دەخوێند لەلایەن یوسف ئەیوبی هەمەدانی، پاشان ئەو گەڕاوە ولاتەکەی خۆی، لەوێ کرا قازی، نازانم کەی کۆچی دوایی کرد؟}.

سەرچاوە: الأنساب ١/١١٩.

## نەصر حوسێن حەڕانی (١٦٨٦)

ناوی نەصرە، کوڕی حوسێنی کوڕی حامیدە، خەڵکی (حەڕان)ە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، سەفەری کردووە بۆ (بەغدا)، دەوری ساڵی ٥٤٥ك – ١١٥٠ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (كفاية المنتهي ونهاية المبتدي) داناوە.

سەرچاوەکان:

١. الذيل على طبقات الحنابلة ٣/٢٠٧.

٢. هدية العارفين ٦/٤٩١.

## نەصر خضر هەولێری (١٦٨٧)

ناوی نەصرە کوڕی خضری کوڕی نەصری (هەولێری)یە، نازناوی (ئەبولعەباس)ە، مەزهەبی شافیعی یە، دانراوی لە تەفسیر و حەدیس و چەند بابەتان هەیە، لەوانە: (خطبة الوداع)ە، ساڵی ٦١٩ك – ١٢٢٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٣/٨٩.

٢. كشف الظنون ١/٧١٥.

٣. إيضاح المكنون ١/٤٣١.

٤. هدية العارفين ٦/٤٩١.

٥. معجم أعلام الكورد ٧٤١.

## نەصر عەقیل هەولێری (١٦٨٨)

ناوی نەصرە کوڕی عەقیلی کوڕی نەصری کوڕی عەقیلە، نازناوی (عزالدين)ە، ساڵی ٥٣٤ك – ١١٣٩ز لە هەولێر هاتەدنیا، لە مەدرەسەی قەڵات شوێنی مەلا خضری مامی دەرسی دەدا، پاشان سوڵتان مظفر دڵی لیٚ ئێشا، ناردیە (موصل)، لە گوندێك نزیك ئەو شارە نیشتەجێ بوو، ساڵی ٦٣٣ك – ١٢٣٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:
١. تأريخ أربيل ١/٣٦٥.
٢. أربيل في مختلف العصور ٧٠.
٣. شذرات الذهب ٥/٨٦.
٤. أربيل في العهد الأتابكي ١٩٩ – ٢٤٨ – ٢٤٩ – ٢٨٧ – ٢٨٨.
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٠٧.
٦. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٤٦٧.
٧. طبقات الشافعية/ ئەسنەوی ١/١١٩ – ١٣٤.

## نەصر عەلی ژەنگاری (١٦٨٩)

ناوی نەصرە، کوڕی عەلی کوڕی عبدالمليکە، خەڵکی (ژەنگارە)، ساڵی ٢٧٨ك – ٨٩١ز لەو شارە دەرسی داوە، خۆی لەلای ئەبو ڕافیعی خوێندووە.

سەرچاوە: الأنساب ٣/٣٣٩.

## نەصرالله عبدالعزیز حەڕانی (١٦٩٠)

ناوی نەصرالله یە، کوڕی عبدالعزیزی کوڕی صاڵحی کوڕی محەممەدی کوڕی عوسمانی کوڕی عەبدوسە، خەڵکی (حەڕان – ئورفە) یە، زانایەکی شەرع زان و بەدین بووە، سەفەری کردووە بۆ (بەغدا)، لەوێ ئامادەی دەرسی زانایان بووە، پاشان چوویتە (دیمشق)، گەڕایتەوە (حەڕان)، لەسەر مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد ڕۆیشتووە، کتێبی (تعليم العوام ما السنة في السلام؟)ی داناوە.

سیفەت و ڕەوشتی: بەژنی کورت بوو، ڕیشی سۆربوو، حەق گۆ بوو بۆ کاربەدەستان سەری شۆڕ نەدەکرد، سوڵتان مظفر پێی ووت: دەمناسی؟ گۆتی: ئا، پێی ووت: بەچی؟ وەڵامی داوە: (بەبێ دین و زۆردار)، سووڵتان ویستی لێی بدا، خەڵکان پێیان ووت: (سوڵتان ئەو مەلایە لە ناو گەل ڕێزدارە، لێدانی ئەوە بۆ تو شکستە، لە پێش چاویان دەکەوێ)، ئەمجا وازی هینا.

مامۆستا پێش ساڵی ٦٠٠ك – ١٢٠٣ز لە (دیاربەکر) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الذیل علی طبقات الحنابلة ٣/٤٤٧ – ٤٤٨.

**نەصرالله محەممەد جزیری (ابن الأثیر) (١٦٩١)**

ناوی نەصرالله یە، کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالکریمی کوڕی عبدالواحیدی جزیرییە، نازناوی (ئەبولفەتح ضیاءالدین)ە، برا گچکەی هەر سێ زانایە مەزنەکانە، کە ناودەبران بە: (أبناء الاثیر) لە ٢٠ی شەعبانی ساڵی ٥٥٨ك – ١١٦٣ز لە جزیرەی بۆتان هاتەدنیا، پاشان لەگەڵ باوکی و برایەکانی چووە (موصل)، دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆز، بەشێکی لە فەرموودەکانی خۆشەویست (درودی خوای لێ بێ) لەبەرکرد، هەروەها دیوانی (أبو تمام) و (بحتري) و (أبو طیب) و چەند ئەشعاری لەبەرکردن، ساڵی ٥٨٧ك – ١١٩١ز گەیشتە مەلیك سەلاحەدین، پاشان چووە لای نورەدینی کوڕی ئەویش ڕێزی لێنا و کردیە (وەزیر)، کە باوکی کۆچی دوایی کرد کوڕەکە پتر ڕێزی لە مامۆستا نا، پاشان (دیمشق) لە دەست نورەدین نەما، وەزعی شارەکە ئالۆز بوو، مامۆستا ڕووی کردە (میصر)، ساڵی ٦٠٧ك – ١٢١٠ز چووە لای مەلیك ظاهیر غازی لە (حەلەب)، کەمەك لەوێ ماوە، لەگەڵ مەلیك نەگونجا، گەڕاوە (موصل) ساڵی ٦١١ك سەفەری (هەولێر)ی کرد، ساڵی ٦١٨ك – ١٢٢١ز ناصرەدین مەحمود خاوەنی (موصل) کردییە نووسەری تایبەتی خۆی.

کۆچی دوایی: بە ئیشی خاوەنی (موصل) چووە (بەغدا)، لەوێ ڕۆژی دووشەمە ٢٩ی ڕەبیعی دووەم ساڵی ٦٣٧ك – ١٢٤٠ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (المثل السائر في أدب الكاتب والشاعر) و (الإستدراكات) و (البرهان في علم البيان) و (أوصاف مصر) و (المعاني المخترعة) و (الوشي المرقوم في حل المنظوم) و (مجموعة أشعار) و (ديوان الترسل) و (رسالة الضاد والظاء).

سەرچاوەکان:

١. وفيات الاعيان ٥/٢٥.

٢. تأريخ أربيل ٢/٦٩٤.
٣. أربيل في العهد الاتابكي ١٠٩ – ١٥٧ – ٢٥٩ – ٣٣٨.
٤. هدية العارفين ٦/٤٩٢.
٥. كشف الظنون ٢/١٥٨٦.
٦. مشاهير الكورد ١/٦٧ – ٦٨.
٧. شذرات الذهب ٥/١٨٧ – ١٨٩.
٨. غاية المرام ٣٦.
٩. منهل الأولياء ١/٢٠١ – ٢٠٢.
١٠. سير أعلام النبلاء ١٣/٢٤٩.
١١. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ١/١٣٣.
١٢. بغية الوعاة ٢/٣١٥.
١٣. إنباه الرواة ٣/٢٦٠.
١٤. الأعلام ١/٧٩ /٨/٣٥٤ /١٠/٢٤٧.
١٥. كشف الظنون ٢/٢٠١٢.
١٦. معجم أعلام الكورد ٧٤١ – ٧٤٢.
١٧. معجم المؤلفين ١٣/٩٨.
١٨. إيضاح المكنون ٢/٥٠٧.

## نصرالله محەممەد حەڕانی (١٦٩٢)

ناوی نەصراللە یە، کوڕی محەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی ئەبومەنصوری کوڕی ئەبولفەتحی کوڕی ڕافیعی کوڕی عەلی (حەڕانی)یە، لە (دیمشق) نیشتەجێ بووە ساڵی ٦٦٤ك – ١٢٦٥ز لە دایك بووە، خوێندویەتی، ئیجازەی وەرگرتووە، مزگەوتی دروست کردووە، پێش نوێژی کردووە، زاتەکی هێمن و بە ئارام و چاك و دڵپاك بووە.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٤/٣٩١.

## نصرالله مەنصور دوینی (١٦٩٣)

ناوی نەصرالله یە، کوڕی مەنصوری کوڕی سەهلە، خەڵکی (دوین)ی ئازربێجانە، زانایەکی شەرع زان بووە، چوویتە (بەغدا) لە مەدرەسەی (النظامیة) دەرسی لەلای ئیمامی غەزالی خوێندووە، بوویتە مەلا، دەرسی فەرموودەی دایتەوە، گەڕایتەوە وولاتی خۆی، لە کۆتایی مانگی ڕەمەزانی، ساڵی ٥٤٦ك – ١١٥٢ز لە شاری (بەلخ) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٢٠٦.
٢. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ١/٥٣٠ – ٥٣١.
٣. معجم البلدان ٢/٤٩١.
٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٠٧.
٥. اللباب ١/٥١٧.
٦. تأريخ مشاهير كورد ١/٤٠.
٧. معجم أعلام الكورد ٧٤١.
٨. الأنساب ٢/٥٧٥.

## نصر یەعقوب دینەوەری (١٦٩٤)

ناوی نەصرە، نازناوی ئەبو سەعدە، کوڕی یەعقوبە، خەڵکی دینەوەرە، زمان ڕەوان و نووسەر و شاعیر بووە، لە (نیسابۆر) کرا وەزیری (مالیە)، لەسەر فەرمانی سوڵتان مەحمود سەبوکتەگین وەڵامی نامەکانی (خەلیفە قادر بالله)ی دەداوە، چەند دانراوی هەیە، لەوانە: (التعبير القادري في الأحلام): ساڵی ٣٩٧ك – ١٠٠٦ز بۆ خەلیفەی عەبباسی ئەحمە قادر بالله ی داناوە، وە (روائع التوجيهات في بدائع التشبهات) و (ثمار الانس في تشبهات الفرس).

سەرچاوەکان:
١. معجم المؤلفين ١٣/٩٣ – ٩٤.
٢. معجم أعلام الكورد ٧٤٢.
٣. كشف الظنون ١/٤١٧.
٤. هدية العارفين ٢/٤٩٠.
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٠٨.
٦. فوات الوفيات ٤/١٩٦ – ١٩٧.

## نەضر عەرەب حەڕانی (خوای لێی رازی بی) (١٦٩٥)

ناوی نەضرە، کوڕی عەرەبی جزیری‌یە، نازناوی (ئەبو روحە) خەڵکی (حەڕان)ە، زانایەکی فەرموودەناس بووە، فەرموودەی لە (عیکریمە) و (نافیع) و (عەطا) و (موجاهید) و چەند زانایان بیستووە، مامۆستا (وەکیع) و (سەفیانی سەوری) و چەند زانایان فەرموودەی پێغەمبەریان (درودی خوای لێ بی) لەو زاتە گێڕاوەتەوە، (مامۆستا زەهەبی) فەرموودەناس (خوا لێی خۆش بی) بە زنجیرە دەگێڕێتەوە تا دەگاتە نەضری کوڕی عەرەب، ئەویش لە عیکریمەی بیستووە، ئەویش لە ئیمامی ئیبن عەبباس (خوا لێی رازی بی) دەڵێ: {کە پێغەمبەریان (درودی خوای لێ بی) لەناو گۆڕە پیرۆزەکەی دانا، لە نێوان تەنی پاکی و ئەلحەدەکەی قوماشەکی سپی دروست کراوی شاری (بەعلەبەکە) دانرا}، مامۆستا ساڵی ١٦٨ك – ٧٨٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: سير أعلام النبلاء ٥/٤٥٤ – ٤٥٥.

## نیظامەدین عیصامەدین نۆدشەیی (١٦٩٦)

ناوی نیظامەدینە، کوڕی عیصامەدینی کوڕی جەلالەدینی کوڕی مەلا عبدالرحمانی کوڕی مەلا ئەحمەدی نۆدشەیە، ساڵی ١٣١٣ك – ١٨٩٥ز لە گوندی نۆدشەی (هەورامان) هاتووتەدنیا، خوێندی تا کۆتایی پێ هینا، ئیجازەی وەرگرت، دەستی کرد بە

جێبەجێ کردنی کاروبارێ مەلایەتی و خزمەتی ئاینی پیرۆز، دەستی شیعری هەبوو، ساڵی ١٣٩٩ك - ١٩٧٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأریخ مشاهیر کورد ٢/٤٦٨.

## نعمةالله زەکەریا شازەلی (١٦٩٧)

ناوی نیعمةالله یە، کوڕی شێخ زەکەریای کوڕی عبدالرحمانی کوڕی سولەیمانی کوڕی خالیدی کوڕی حەسەنی کوڕی شێخ ئەبوحەسەنی شازەلی کاکۆزەکەریای (سنە)یە، لە شاری (کەرمان) هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان ئارەزوی تەصەووف هاتە ناو دڵ و دەروون، لەوبوارەدا خۆی ماندوو کرد، تا بگا بە مەبەستی ڕاستەقینە، لە گوندی (کاکۆزەکەریا) شوێنی تایەتی هەبوو بۆ خواپەرستن، ئێستاش ئەو شوێنە پیرۆزە ناودەبردرێ بە (چلەخانە).

پاش کۆچی باوکی ئەو گوندەی بەجێهێشت بۆ برایەکانی کە ژمارەیان یازدە بوو، چووە (بەغدا) بنەماڵەی گەیلانی ژنیان دایێ، کوڕەکی بوو ناوی نا (محەممەد صادق)، پاشان شێخ نیعمةالله چووە (شام)، دوایی چووە (حیجاز)، لەوێ چووە (یەمەن)، پاشان چووە (میصر)، ئەمجارە چووە (هیند)، لەوی گەڕاوەو شاری (ماهان) و (کەرمان) لەوێ خوای گەورە دوو کوڕی پێ بەخشی: عبدالحافظ و عبدالرؤوف.

شێخ لە (کەرمان) خەریکی ئامۆژگاری خەڵکان بو، محەممەد صادقی ناردەوە گوندەکەی خۆیان (کاکۆزەکەریا)، عبدالرؤوفی ناردە (بەغدا) خۆشی کۆچی یەکجاری کرد بەرەو بارەگای خوا.

سەرچاوەکان:


١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٠٨ - ٦٠٩.

٢. بنەماڵەی زانیاران ١٠٣ - ١٠٧.

## نعمةالله عبدالكريم هەزارکانیانی (١٦٩٨)

ناوی نیعمةالله یە، کوڕی شێخ عبدالکریمی مەردۆخی یە، ساڵی ١٨٦٠ز لە گوندی (هەزارکانیان) سەر بە (سنە) هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن پاشان چووە مزگەوتی (دار الإحسان) لای مەلا عبدالقادر شەریعەتی، ساڵی ١٢٧٦ك – ١٨٥٩ز لەگەڵ مامی چووە شاری سلێمانی، ساڵی ١٢٩٧ك – ١٨٧٩ز لە گوندی (پایگەنە) لای مەلا فەضل‌اللهی خوێند، لەو کاتە بوو (تەصریفی مەلا عەلی) نووسییەوە، پاش کۆچی دوایی مامی چووە (ئەستەمبوڵ)، لەوێ مووچەیان بۆ بڕیەوە، گەڕاوە سلێمانی دوایی هاتە هەولێر، دوبارە گەڕاوەو (ئەستەمبۆڵ) گەڕاوە هەولێر، دەستی کرد بە دەرسدانەوە لە مزگەوتی شێخەڵلا.

بەشێك لە فەقێیەکانی: (مەلا عبدالله ی دێرەبڕوشە): دەوری ساڵی ١٩٠٠ز، وە (مەلا عبدالقادری سێگرتکانی)، مامۆستا چەند حاشیەی لەسەر (تهذیب الكلام) و (عبدالله یەزدی) و چەند کتێبانی مەنتیق و کەلام هەیە، ساڵی ١٩١٥ز کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: (شێخ عەلی): مەلا بوو لە (بەغدا) و (شێخ حەسەن): (مدرس)بوو لە هەولێر و (شێخ حوسێن): فەرمانبەر بوو، وە (شێخ مصطەفا): بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرت لە (بەغدا)، وە (شێخ جەعفەر).

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٧٤٣.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ٢٤٤.

٣. مشاهير الكورد ٢/٢١٥ – ٢١٦.

٤. بنەماڵەی زانیاران (١) شێخانی مەردۆخی.

٥. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٥/٨.

## نیعمەم نەجمەدین حەڕانی (١٦٩٩)

نیعمم خان، کچی نەجمەدینی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حمرانه، خـەڵکی (حەڕانـە)، لای چەند زانایانی خوێندووە، خۆشی دەرسی داوە، سـاڵی ٦٣٨ك – ١٢٤٠ز هاتـەدنیا، لە ٢٠ی ذی القعده، ساڵی ٧٢١ك – ١٣٢١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٢/١٢٩

## نەعیم مسافر ئورمەوی (١٧٠٠)

ناوی (نەعیم)ە، کوڕی موسافیری کوڕی جەعفەرە، نازناوی (طـەییبـە)، خـەڵکی شاری (ورمێ)یە، هەر لـەوێ کرایتە (قازی)، پاشان بۆ خوێندن چوویتە (بەغـدا)، گـەڕاوە (ورمێ) دەستی کرد بە دەرسدانەوە، دوای ساڵی ٤٦٠ك – ١٠٦٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الأنساب ١/١٢٠.

## نورەدین ئیسماعیل شێروانی (١٧٠١)

ناوی نورەدینە، کوڕی ئیسماعیلی کـوڕی حەسـەن بـەگی (شـێروانی)یە، سـاڵی ١٨٦٦ز لـە هـەولێر هاتـەدنیا، دەسـتی کـرد بـە خوێنـدن، قورئـانی پـیرۆز و کتێبـە سەرەتاییەکانی تەواوکردن، چووە (کەربەلا) ماوەك لـەوێ لای مەلا طاهای بـرای خوێنـد، ماوەك چووە لای مەلا باقری یەزدی، جارجار دەچووە لای مەلا نیظامەدین بـەگ و مـەلا تەوفیق بەگی صۆفی، تەجویدی لەلای مەلا عبدالسلامی بەغدایی خوێند.

کرا (مدرس) لە کەربەلا، دوایی گواسـتراوە (بەصـرە)، لـەوێ نـاردرا (حـەی)، پاشان هاتە (بەغدا)، ساڵی ١٩٠٩ز کرا بەڕێوەبەی (دار المعلمین) لـە (بەصـرە)، گـەڕاوە هەولێر، گەڕاوە (بەغدا)، گەڕاوە (بەصرە)، ساڵی ١٩٣٠ز خانەنشین کرا، دواعەمری لە مزگەوتی (ئەزبەك) لە (بەغدا) دەرسی دەدا، هەروەها ووتارخوێن بور لە مزگەوتی حـاجی ئەمین، لە گەڕەکی (کەرخ)، ساڵی ١٣٦١ك – ١٩٤٢ز لە بەغدا کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (خلاصة تأريخ الإسلام)، (الفلسفة العلمية)، (الفلسفة الأخلاقية)، (تأريخ التربية)، (حقيقة الحقائق)، (رد العوام عن امتهان ما له الإحترام)، (زبدة الهندسة)، (علم الحيوان)، (الفلسفة العليا)، (المنطق القديم)، (المنطق الجديد).

سەرچاوەکان:

١. لب الألباب ٢/٣٧٧.

٢. معجم المؤلفين ١٣/١٢٣ – ١٢٤.

٣. معجم أعلام الكورد ٧٤٥ – ٧٤٦.

## نورەدین عبدالله جەلی (١٧٠٢)

ناوی نورەدینە، کوڕی مەلا عبداللهی کوڕی مەلا ئەسعەدی کوڕی مەلا عبداللهی کوڕی مەلا عبدالرحمانی جەلیيە، ساڵی ١٨٨٣ز لە شاری (کۆیە) هاتەدنیا، لە مەدرەسەی باوکی دەستی کرد بە خوێندن، لەلای موستەعیدەکان قۆناغی سوختەیی بڕی، لە قۆناغی موستەعیدی چووە خزمەت باوکی، پاشان چووە لای مەلا محەممەد برای، زانستەکانی تەواوکرد، لەلای ئەو ئیجازەی وەرگرت.

لە مزگەوتی گەورەی کۆیە ووتاری دەدا، دەرسی فەقێیانی دەداوە، لەوانە: مەلا مصطفای بانەموردی، مەلا صاڵحی نێرەگێنی، مەلا ئیبراهیمی بێراوەی.

کۆچی دوایی: شەوی چوارشەممە، ٢٩ی ذی القعدە، ساڵی ١٣٧١ك – ٢٠/٨/١٩٥٢ز کۆچی دوایی کرد، نزیك گۆڕی مەلا محەممەدی برای و مەلا عبداللهی باوکی بەخاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. بنەماڵەی زانیاران ٥٦٥.

٢. محمد بن عبدالله الجلي ٩٩.

٣. دەستووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## شێخ نورەدین عبدالجبار بریفکانی (١٧٠٣)

ناوی نورەدینە، نازناوی (نوری)یـە، کـوڕی عبـداجلباری کـوڕی نـوری کـوڕی ئەبوبەکری کوڕی (زین العابدین)ی کوڕی عبدالکریمی کوڕی موسای کوڕی سـولەیمانی کوڕی عبدالغنی کوڕی ئیسحاقی کوڕی بابا مەنصوری کوڕی حوسێنی (ئـەخلاطـی)یـە – کە ساڵی ٨٠٨ك – ١٤٠٥ز لە (میصر) کۆچی دوایـی کـرد –، ئـەو زاتـە ڕەچـەڵەکی دەچیتەوە سەر ئیمامی حوسێنی نەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) کەواتە: سـەیدەکی جسنی حوسێنی یە، ساڵی ١٢٠٥ك – ١٧٩٠ز لە گوندی (ئیتووت) هاتەدنیا.

خوێندنی: لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشـان لەسـەر فـەرمودەی ئەو چووە (ئامێدی)، ماوەکیش چـووە (شـۆش)، دوایـی چـووە (موصـل) پاشـان چـووە (کۆیە)، دوایی چووە (شەقلاوە)، دوایی هاتە هەولێر، گەڕاوە (ئامێدی) لای مەلا یـەحیای مزوری، ماوە تا ئیجازەی وەرگرت، هەروەها ئیجازەی دووەمی لە مەلا ئیسـلامی شۆشـی وەرگرت، ئیجازەی سێیەمی لە مەلا یونسی کوردی لە (موصل) وەرگرت.

شێخ نورەدین ماوەك لە گوندی (میردینك) بوو، لەو ساڵە ١٢٣٦ك – ١٨٢٠ز (فتح المبین)ی ئیبن حەجەر – کە شەرحی ئەربـەعینی ئیمـامی نەوەوییـە – نووسـییەوە، جـا نازانم لەو کاتە مەلا بووە، یا فەقێ؟ ئەو نووسخە ئێستا لەلای ئێمەیە.

مەلایەتی: کۆتایی بەخوێندن هینا، لەسەر فەرموودەی مامۆستای گەڕاوە خزمـەت باوکی لە (ئیتووت)، لەوێ دەستی کرد بە خواپەرستی، سەر لە بـەیانی قورئـانی پـیرۆزی دەخوێند، پاشان تا نیوەڕۆ دەرسی فەقێیانی دەدا، دوایی تـا عەسـر ئامۆژگـاری خـەڵکانی دەکرد، دوای عەسر خەریکی وێردی تەریقەت بـوو، پاشـان لەسـەر فـەرموودەی بـاوکی چووە (موصل)، تەریقەتی (قادری) لە شێخ مەحمودی جەلیلی وەرگرت، زۆر پـێ نەچـوو لەلایەن شێخ کرا خەلیفەی تەریقەتی قادری ڕوفاعی.

مامۆستا عبدالکریمی بیارە(خوا لـێی خۆش بێ) دەڵێ: لەو ماوەی شێخ نورالـدین لە (موصل) بوو، شێخ نور محەممـەدی هینـدی لـەوێ دابـەزی، شـێخ نورالـدین تەریقـەتی

نەقشبەندی لێ وەرگرت، ئەمجا گەڕاوە لای باوکی لە (ئیتووت)، ماوەك لەوێ بوو، دوایی باوکی ناردیە (بریفکان) بۆ سەرپەرشتی تەکیەی باپیری، ئەویش چوو تەکیەکەی چاك کردەوە، دەستی کرد بە ئامۆژگاری خەڵکان و دەرسدانەوەی فەقێیان.

خووڕەوشتی: زاتەکی لە خواترس بوو، بەردەوام بە ڕۆژی بوو، دنیای وەلا نابوو، کاربەدەستان بەدویان دا دەنارد مووچەی بۆ برنەوە نەدەچوو، هەر شتێك بۆی هاتبایە تەکیە، دابەشی سەر دەروێشەکانی دەکرد، بە ماوەکی کەم دەشت و چیای دهۆك و موصل و هەولێری هەمو ڕۆناك کرد، بەو ئامۆژگارییە بەهێزانەی، توانی چەند کەسانی سەر ڕەق نەرم بکا، لێشێواوان ڕاستەڕی بکا، ئێش و کارە ڕێکەکانی، وەکو زمان وقەڵەمەکەی مەدرەسەکی بەردەوامی شەوان و ڕۆژان بوون، بۆ ئەوان کەسان وێستبایانە چاوی لێ بکەن.

چەند نامەی پڕ سوودی نووسیوە بۆ دۆستان و خەلیفەکانی، لەوانە: نامەی مەلا حامیدی دۆسکی، نامەی مریدەکان، نامەی شێخ ئیسلامی شۆشی، نامەی شێخ ئیسماعیلی شۆشی، نامەی مریدەکانی ناوچەی زێبار، نامەی شێخ یونسی شۆشی، نامەی شێخ حەسەنی جەببار، نامەی سەید ئەحمەد بە زمانی عەرەبی، نامە بۆ مریدەکانی خۆی بە زمانی فارسی.

دانراوەکانی:

١. البدور الجلية: سەید محەممەدی موصلی شەرحی کردووە.
٢. بهجة السالكين.
٣. آداب الخلوة.
٤. مرام الإسلام.
٥. إبراز دقائق الحقائق.
٦. تنبيه النيام.
٧. الفتح الأرحم.
٨. المعشرات: محەممەد طاهیر (الصائغ) شەرحی کردووە.

٩. مناجات نوري.
١٠. القصيدة التائية.
١١. القصيدة الهمزية: شێخ محەممەد نوری موصلّی شەرحی کردووە.
١٢. الفصيدة اللامية: شێخ حەسەن جەببار موصلّی شەرحی کردووە.
١٣. القصيدة النونية: سەید محەممەد نوری موصلّی شەرحی کردووە.
١٤. تلخيص الحكم.

لەگەڵ چەند قەسیدانی تر بە کوردی و بە عەرەبی.

خەلیفەکانی شێخ نورەدین: شێخ طاهای سلێمانی، شێخ عوسمانی ڕێچوانی، شێخ عبدالغفور، شێخ عەلی گەلی رمانە، شێخ عبدالحمیدی بریفکانی، شێخ محەممەد جەرجیس موصلی، شێخ ئیسلامی شۆشی، شێخ عبدالکریمی ئاکرێ، شێخ مصطفی ی ئامێدی، شێخ عبدالقادری فاریلی، مامۆستا حەسەن جەبار، شێخ عەلی مەغریبی، شێخ سولەیمان بەگی موصلی، مەلا حامیدی دۆسکی، شێخ عبدالرحمانی جزیری، شێخ محەممەدی برازای، شێخ محەممەد عزی، شێخ ئەحمەدی سەبعاوی، مەلا عبدالله فەیزی، شێخ سولّتان خەلیفە، حاجی سەلیم ئاغەوات، حاجی یاسین جۆرە، شێخ عبدالفتاح زاخولی، شێخ عبداللطیف، حاجی صالّح جلمیران، شێخ عبدالباری جزیری، نور محەممەد بریفکانی، شێخ مەحمود دەرگەلی، شێخ محەممەد عەلی ئەتروشی، شێخ عبدالقهار بریفکانی، شێخ موحسین بریفکانی، شێخ مونەووەر بریفکانی، شێخ محیەدین بریفکانی، شێخ نوری بریفکانی، شێخ طاها بریفکانی، شێخ عبدالله بەرۆشکی، عبدالرحمان ئەتروشی، شێخ ئەنوەر رەبەتکی، ئەوانە بەشێکیان ڕاستەوخۆ خەلیفەی شێخ بوون، وە بەشێکیان جێگری خەلیفەکانی شێخ بوون.

نەتەوەی شێخ نورەدین: نەمانزانیوە جەنابی شێخ کوڕی هەبووبێ، ئەوەی نووسراوە سێ کچی هەبووە:

١. پیرۆزخان: دایە شێخ محەممەد دهۆکی برازای.
٢. فاطمە خان: خێزانی شێخ عبدالحمیدی ئەتروشی.

٣. صافیە خان: کچی مالّیّ بوو، مێردی نەکرد، قورئانی پیرۆز و تەفسیر و چەند فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لیّ بی) و شەریعەتی ئیسلامی لە خزمەت باوکی خوێند، دوای کۆچی دوایی شێخ، تەکیەی بریفکانی چاك کردەوە و ئاوی بۆ دابین کرد، پاشان کۆچی دوایی کرد، لە (بریفکان) بە خاك سپێردرا.

کۆچی دوایی: شێخ نورەدین، ماوەی چل سالآن پتر، لە (بریفکان) خەریکی ئامۆژگاری دەروێش و مریدان و دەرسدانەوەی فەقێیان بوو تا سالّی ١٢٦٧ك – ١٨٥٠ز کۆچی دوایی کرد، ڕستەی (تبکي السماء لفقد النور للاسف)ی بە لێکدانەوەی ئەبجەدی، بۆ مێژوی کۆچی دوایی داندراوە، بەم شێوەیە:

تبکي السماء لفقد النور للاسف

٤٣٢ + ١٣٣ + ٢١٤ + ٢٨٧ + ٢٠١ = ١٢٦٧ك

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٠٤ – ٦٠٦.
٢. الأكراد في بهدينان ٨٢ – ٨٤.
٣. معجم أعلام الكورد ٧٤٧.
٤. الرد المبين في مآثر الشيخ نورالدين.
٥. الشيخ نورالدين البريفكاني.
٦. کاروان، ٧ – ١١٣ – ١١٥/ ١٩٨٣ز.
٧. ژیناوەری زانایانی کورد ٧٨٠ – ٧٨٧.
٨. بنەمالّەی زانیاران ٤٣٢ – ٤٤١.
٩. بوژاندنەوە ٣/١٧٥ – ١٩٣

**نورس عبدالرزاق کەرکوکی (١٧٠٤)**

مامۆستا نورِس ئەفەندی خەلّکی شاری (کەرکوك)ە، سەفەری (ئەستانە)ی کرد، لەوێ کرا مودەرریس، سالّی ١١٥٩ك – ١٧٤٦ز کرا قازی (بۆسنە)، پاشان

دوورخراوە بۆ (کوتاهیە)، هەر لەوێ ساڵی ١١٧٥ك – ١٧٦١ز کۆچی دوایی کرد، دیوانی شیعری هەیە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٤٢٤.

٢. معجم أعلام الکورد ٧٤٨.

## نور محەممەد ئیسحاق زادە (١٧٠٥)

مامۆستا نور محەممەد ئەفەندی کوڕی ئیسحاق زادە، ناسراوە بە (کوڕەکورد)، دەرسی داوە لە (یەکی شەهر)، کرایتە قازی، ماوەکیش قازی (بروسە) بووە، پاشان لە (مەککە)ی پیرۆز کرایتە قازی، دوایی کرایتە قازی (ئەستەمبۆڵ)، ساڵی ١١٤١ك – ١٧٢٨ز کۆچی دوایی کرد، چەند کوڕی بەڕێز و ماقوڵی هەبوون.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الکورد ٤٤٧.

٢. مشاهیر الکورد ٢/٢١٧.

## نوری باباعەلی تەکیەیی (١٧٠٦)

ناوی نورییە، کوڕی باباعەلی کوڕی شێخ عەلی مودەڕریسی گوندی (تەکیە)یە، دەوری ساڵی ١٣٠٥ك – ١٨٨٧ز هاتەدنیا، لە قوتابخانەی باوکی خوێند و پێگەیشت بوو بە زانا و نووسەر، لە ئەستێرەناسی و ژمێریاری بەناوبانگ بوو، زاتەکی سوودبەخش بوو بۆ خەڵکان و قوتابیان، ڕەشید و چاوقەیم و نەترس بوو، لە ١٢/٣/١٩٥٦ز کۆچی دوایی کرد، شێخ کەمالی کوڕی جێگری بوو.

دانراوەکانی: (شرح الدرة العروضیة للشیخ معروف) و (شرح تشریح الأفلاك لبهاء الدین العاملی) و (سەرجەلەی سەیدەکان) و (نەحو و صەرف) و (چەند شیعری کوردی و عەرەبی و فارسی).

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٠٩.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٢١٨ – ٢١٩.

٣. شرح منظومة الدرة العروضية ٧.

– و –

## وەلی عثمان زێباری (١٧٠٧)

ناوی وەلی‌یە، کوڕی عوسمانە، عەشیرەتی (زێباری)یە، ناسراوە بە (ئامێدی)، یەك بووە لە شێخەکانی تەصەووف، لەو بابەتە کتێبی (أنیس العارفین)ی داناوە، ساڵی ٩٦٧ك – ١٥٥٩ز تەواوی کردووە، پێشکەشی بە وەزیر فەرهاد پاشا کردووە، سەرەتایەکەی بە (الحمد لله الذي أنزل الحكم على قلوب أوليائه....) دەست پێ دەکا.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٣/١٦٦.

٢. هدية العارفين ٦/٥٠١.

## وەلی هەولێری (١٧٠٨)

مامۆستا وەلی، خەڵکی شاری هەولێرە، پاشان چوویتە (موصل)، لە مزگەوتی (وەزیر) ووتارخوێن بووە، دەرسی دایتەوە، چەند زانا لەسەر دەستی ئەو دەرچوونە، کوڕێکی زانای هەبووە، ناو (بەکر) لە شوێنی باوکی کرایتە ووتارخوێن.

سەرچاوەکان:

١. غاية المرام ٨١ – ٨٢.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ٢٣٤ – ٢٣٥.

## وەیسی عبداللە گرتکی (١٧٠٩)

ناوی وەیسـی‌یـە، کـوڕی مـەلا عبـداللّەی کـوڕی مـەلا ئەحمـەدی کـوڕی مـەلا عبدالخالیقی کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی ئادەمە، عەشیرەتی (بالەك)ە، ساڵی ١٩٠٤ز لـە گوندی (گرتك) هاتەدنیا.

خوێندنی: لە مەدرەسەی باوکی دەستی کـرد بـە خوێنـدن، پاشـان لـە خزمـەت باوکی چووە (پەسوە)ی ئێران، لەلای ئەو ماوە تا گەیشتە (جمع الجوامع)، لەوکاتە بـاوکی کۆچی دوایی کرد، ئەویش گەڕاوە (گرتك)، لەوێ بەرێ کەوت هاتە هـەولێر لای مـەلا صالّحی کۆزەپانکە زانستەکانی تەواوکرد، چووە مزگەوتی (قـەلّات) لای مـەلا ئەبوبـەکر ئەفەندی ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: گەڕاوە (گرتك) لەوێ مەدرەسەی فەقێیانی دروست کرد، لە عێراق و ئێران و تورکیا فەقێیان ڕوویان تێ کـرد، بەشـێك لەوانـە: مـەلا حەسـەنی ڕوسـتێ، مـەلا مصطەفا خضر، مەلا ئیبراهیم شێخ ئاودەلی، مەلا ئەحمەد عبداللّە پیرئۆمەری، مـەلا جـەلال خەیلانی، مەلا ئەحمەد مەمیخەلی، پاشان چووە (مێرگە)، گەڕاوە (گرتك)، چووە (گەزنـە) گەڕاوە (گرتك).

خووڕەوشتی: زاتەکی بەرز بوو، گران بوو، هێمن بوو، سـەخی بـوو، بـۆ ئاشـت بوونەوەی خەڵکان خۆی ماندوو دەکرد، بەشدار بوو لە شۆڕشی ئازادی کورد، دەورێکی سەرەکی هـەبوو بـۆ دامەزرانـدنی یەکیـەتی زانایـانی کوردسـتان، یـەك بـوو لـە ئەندامـە دیارەکانی لیژنەی فتوای شەرعی قازییەکان، کە جەنابی سەرۆك مەلا مصطەفـای (بـارزان) ساڵی ١٩٧٠ز لە (گەلالە) دایمەزراند.

مامۆسـتا بـەردەوام بـوو لەسـەر دەرسـدانەوە، تـا سـاڵی ١٩٧٨ز گونـدەکان ڕوخاندران بە دەستی ڕژێمی (بەعس)، ئەویش بە زۆرداری نیشتەجێ کرا، لـە کۆمـەڵگای (دیانە).

کۆچی دوایی: لە ١٨/٢/١٩٧٩ز کۆچی دوایی کرد، گۆڕەکەی لەسەر گردێکە بەسەر (سۆران)دا دەڕۆنی، ئەو شوێنە حاجی عومەر گوانی بەخشی بۆ ئەو مەبەستە، مامۆستا چەند کتێبی چاك و دەستنووسی باوك و باپیرانی لە دوا بەجێما.

مەلا سەعیدی کوڕی بووە جێگری لە کاروباری ئاینی و پێش نوێژی و ووتارخوێندن و ئامۆژگاری خەڵکان، ئەویش لە دایك بووی ساڵی ١٩٣٧ز یە، لای باوکی خوێند، ساڵی ١٩٦٦ز ئیجازەی وەرگرت، لە ١٣/٣/١٩٩٧ز لە (سۆران) کۆچی دوایی کرد، مەلا عوبیداللە ی کوڕی جێگریێتی، کوڕانی تریشی هەنە مەلا و نووسەرن خوای گەورە ئەو بنەماڵە یارمەتی بدا بۆ خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

سەرچاوەکان:

١. بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز ٨٤ – ٩٠.

٢. خۆری ئیسلام ٣١ / ٢٠٠٦ز، ٦٧ – ٧١.

## وەیسی محەممەد گەپەنك ڕەشی (١٧١٠)

ناوی وەیسی یە، کوڕی محەممەدی کوڕی عبداللە یە، خەڵکی (کەپەنك ڕەش)ە، لە بناری چیای (قەرەچوغ) قەزای مەخمور، عەشیرەتی (شێخ مەمونديیە)، ساڵی ١٨٨٨ز هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، چەند حوجرەی فەقێیانی بەسەر کردەوە، لە چەند شوێنان گەڕا، تا قۆناغەکانی خوێندنی بڕی، دوا هەواری مزگەوتی شێخ مصطەفا بوو لە هەولێر، ماوە لە خزمەت شێخ ئیجازەی مەلایەتی و تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (کەندار) دوایی چووە (کەپەنك ڕەش)، لەو کاتە مەلا ئیسماعیلی دیبەگە لەلای دەخوێند، مامۆستا وەیسی ساڵی ١٩١٨ز کۆچی دوایی کرد، مەلا شێخ محەممەدی کوڕی ماوەك مەلا بوو لە (ماجید)، پاشان هاتە مزگەوتی حاجی مەجید قەردار لە هەولێر، دوایی چووە (حەسەن بەگ)، گەڕاوە هەولێر، ڕۆژی هەینی ٢٠/٣/١٩٩٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٣٨١.

– هـ –

## هبةاللە محەممەد ئاکرەیی (١٧١١)

ناوی هبةاللّٰهیە، کوڕی محەممەد سەعید ئەفەندی موفتی ئاکرە، کوڕی مەلا عبدالرحمانی کوڕی زانای مەزن مەلا یەحیا ئەفەندی مزوری یە، ساڵی ١٨٨٠ز لە شاری (ئاکرە) هاتەدنیا، یەکە لە مەلایە چاکەکانی ئەو سەردەمی، پاش تەواوکردنی قۆناغەکانی خوێندن هاتە هەولێر لە مزگەوتی قەڵات، ساڵی ١٩٠٦ز ئیجازەی لە مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی وەرگرت، گەڕاوە (ئاکرێ) دەستی کرد بە دەرسدانەوە و کاروباری مەلایەتی هەر لەو ساڵەدا کرا مودەرریس، ساڵی ١٩٠٩ز کرا سەرۆکی زانیاری، ساڵی ١٩١٨ز کرا قازی (ئاکرە)، ساڵی ١٩٢٤ز کرا موفتی (ئاکرە)، لە ماوەی ساڵی ١٩٢٥ز تا ساڵی ١٩٤٣ز چوارجار هەڵبژێردرا بە (نائیب)، ساڵی ١٩٤٧ز کرا ئەندامی پیاو ماقوڵان، ساڵی ١٩٠٠ز شەرحی فەرائیزی شەرحی مەنهەج – دانراوی محەممەد ئیبن ئادەمی باڵەکی – نووسییەوە، دانەکی کۆپیمان لەلایە.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٧٥ك – ١٩٥٥ز کۆچی دوایی کرد، لە (ئاکرە) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:


١. أسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٣٣.
٢. معجم أعلام الکورد ٥٥٢.
٣. أعلام کورد العراق ٨٦٢ – ٨٦٣.


## هبةاللە نەصر حەڕانی (١٧١٢)

ناوی هبةاللّٰهیە، کوڕی نەصری کوڕی مەنصوری کوڕی حوسێنی کوڕی حامیدی (حەڕانی)یە، نازناوی (ئەبولەحاسینە)، مەزهەبی حەنبەلی بووە، دەوری ساڵی ٥٨٠ك – ١١٨٤ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (المعیار في الرد علی المتمسکین عن الأخیار)ی

داناوە، لە بابەت گۆرانی و سەما و هەڵپەڕین، سەرەتایەکەی بە (الحمد لله مكرم الأولياء بجزيل الاكرام...) دەست پیّ دەکا.

سەرچاوەکان:

١. هدية العارفين ٦/٥٠٦.

٢. إيضاح المكنون ٢/٥١٦.

٣. معجم المؤلفين ١٣/١٤٥.

٤. معجم أعلام الكورد ٧٥٢.

## هدايةالله ئیسماعیل هەولێری (١٧١٣)

ناوی هیدايةاللّٰهیە، کوڕی ئیسماعیلە، خەڵکی (هەولێرە)، خەلیفەی مەولانا خالید بووە، خەریکی فتوا و دەرسدانەوە بووە، کاروباری تەریقەتی ئەنجام داوە، دەڵێن: مەولانا کە ئیجازەی تەریقەتی پێدا، فەرمووی: {بە تەمای تەریقەت لە خۆت مەگەڕێ، خوێندنەکەت تەواو بکە، ڕۆژەك دادێ بە مەلایەتی دەرباز دەبی}.

مەلا هیدایەت گەڕاوە هەولێر خوێندنەکەی تەواوکرد، دانیشت بە مەلایەتی خەریکی ویردی تەریقەت بوو، بەڵام پتر ڕویدا دەرسی فەقێیان، کە محەممەد پاشای (ڕواندز) هاتە هەولێر بڕیاری دا بە داخرانی هەموو تەکیە و خانەقایەکانی شێخ و دەروێش و صۆفی لێنە، تەنیا ئەوانە بکرێنەوە کە مەلا و فەقێ لێ دەخوێنن، لەو بڕیارە مەلا هیدایەت سوودی وەرگرت، چونکە بەگەر چینی مەلایەکان کەت، لە ئەنجامدا محەممەد پاشا خۆی هاتە زیارەتی داوای دوعای لێ کرد، ئەوەبوو فەرمودەکەی مەولانا کە لە پێشدا ئامۆژگاری کرد.

کۆچی دوایی: مامۆستا هیدایەت لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخ عبدالقادری گەیلانی نزیك مەلا یەحیای مزوری بە خاك سپێردرا، شێخ محەممەد سەعیدی کوڕی بووە جێگری، ئەویش کۆچی دوایی کرد، شێخ ئەسعەدی کوڕی جێگری بوو، ئەویش ساڵی ١٨٤٨ز لە هەولێر هاتەدنیا، لە مزگەوتی نزیك مزگەوتی خانەقا

دەرسی دەدا، دیوانی شیعری بە زمانی تورکی هەیە، کتێبی (كنز العرفان في أحاديث نبي الرحمان)ی داناوە، دوایی داوایان کرد لە (ئەستەمبۆڵ)، کە چوو دەستگیریان کرد، لە ٣٠/١/١٩٣١ز لە بەندیخانەی تورکیا کۆچی دوایی کرد، شێخ محەممەدی کوڕی ناسرابوو بە (شێخەڕەشکە) لە جێی دانیشت، ساڵی ١٩٣٩ز کرا قازی هەولێر، لە ٨/٧/١٩٥١ز کۆچی دوایی کرد، لە مزگەوتی خۆی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٤٧.

٢. أربيل في مختلف العصور ١٠٥.

٣. علماء ومدارس في أربيل ٦٧ – ٧٠.

٤. یادی مەردان ١/٩٤.

## هیلال ئەحمەد جزیری (١٧١٤)

ناوی هیلالە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیمی جزیرییە، لە (دیمشق) دانیشتووە، دەرسی لەلای ئەبو حامیدی صابونی و فەخری بوخاری خوێندوە، خۆشی دەرسی بە ماموستا بەرزالی و مامۆستا زەهەبی داوە، ساڵی ٧٢٧ك – ١٣٢٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٤/٤٠٤.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦١٧.

## هیلال مەحفوظ ڕەسعەنی (١٧١٥)

ناوی هیلالە، نازناوی (ئەبونەجم)ە، کوڕی مەحفوظی کوڕی هیلالە، خەڵکی گوندی (رأس العين)ی جزیرەیە، بۆیە ناسراوە بە (ڕەسعەنی)، بۆ خوێندن چوویتە (بەغدا) لای شوهدەخانی دینەوەوری، گەڕایتەوە گوندەکەی خۆی، دەرسی فەرموودەی داوە، ئەو بنەماڵە ناسراون بە شێخ و پیاوچاك و ماقووڵ، ساڵی ٦١٠ك – ١٢١٣ز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٤٤/٥.
٢. الذيل على طبقات الحنابلة ٦٨/٤.

- ی -

## یاسین بریفکانی (١٧١٦)

مامۆستا یاسین بریفکانی، یەکە لە مەلایە بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی، دەستی کرد بە خوێندن، لە قۆناغەکان سەرکەوت، چووە (کۆیە) لای جەنابی مەلا عبداللەی جەلی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕاوە (دهۆك) دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی و دەرسی فەقێیان، فەتوا و لابردنی کێشەکانی نێوان خەڵکی ناوچەکە،ساڵی ١٣٢٥ك – ١٩٠٧ز لە (موصل) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: أسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٣٣.

## یاسین عبدالرحمان تەوێڵەیی (١٧١٧)

ناوی یاسینە، کوڕی عبدالرحمانی کوڕی حوسێنی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی حوسێنی کوڕی مەلا سەلامە، ئەم بنەماڵە لە (تەوێڵە) مەلایەتیان کردووە، ناوبراو ئیجازەی لە مەلا عبداللەی خەرپانی وەرگرتووە، لە (تەوێڵە) دەرسی داوە، باغی خۆی هەبووە پێی ژیاوە، کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی هەبوو: (مەلا عبدالباقي – مەلا عەبدە) و (مەلا عبدالباري).

سەرچاوە: بنەماڵەی زانیاران ٤٣٠ – ٤٣١.

## یەحیا ئەبو مەنصور حەڕانی (١٧١٨)

ناوی یەحیایە، کوڕی ئەبو مەنصوری کوڕی ئەبولفەتحی کوڕی ڕافیعی کوڕی عەلی کوڕی ئیبراهیمە، مەزهەبی حەنبەلی یووە، نازناوی (جەمالەدین ئەبوزەکەریا)یە، ساڵی ٥٨٣ك – ١١٨٧ز لە (حەڕان) هاتەدنیا، ساڵی ٦٠٧ك چوویتە (موصل)، پاشان

چوویتە (بەغدا)، دوایی چووە (دیمشق) لەوێ نیشتەجێ بوو، ساڵی ٦٧٩ك – ١٢٨٠ز کۆچی دوایی کرد.

چەند کتێبی داناون، لەوانە: (انتهاز الفرص في من أفتى بالرخص في العقوبات)، (دعائم الإسلام في وجوب الدعاء للإمام)، (نوادر المذهب) و (آداب الدعاء).

سەرچاوەکان:

١. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٢٩٥ – ٢٩٧.

٢. هدية العارفين ٦/٥٢٥.

٣. معجم المؤلفين ١٣/٢٣٣.

## یەحیا خالید مزوری (١٧١٩)

ناوی یەحیایە، کوڕی خالیدی کوڕی حوسێنی مزوری ژێرییە، ساڵی ١٧٧٢ز لە گوندی (باڵەتە)ی نزیك (بریفکان) هاتەدنیا، لە کۆنەوە ئەو بنەماڵەیە سەرۆك و کاربەدەست بووینە.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن، گەڕا لە چەند قوتابخانان، چووە (ئامێدی) چووە (موصل)، ماوەکیش لەلای مەلا خەلیلی سعێرتی بوو، پاشان چووە (بەغدا) لای عاصم ئیبراهیم حەیدەری، لەو ماوەیە برادەراتی بتوونی لەگەڵ ئەسعەد ئەفەندی حەیدەری پەیداکرد، دوایی گەڕاوە (موصل) مەدرەسەی محەممەد پاشای جەلیلی لای مەلا جەرجیس ئەفەندی هەولێری ئیجازەی وەرگرت، هەروەها ساڵی ١٧٩١ز چووە سەفەری حەج، لە ڕێگای (دیمشق) لەوێ ئیجازەی تری لە شێخ محەممەد (الکزبری) و شێخ ئەحمەد عوبیدی عەتاری وەرگرت.

مەلایەتی: دوای گەڕانەوەی لە سەفەری حەج، کرا مودەریس لە قوتابخانەی (دار الحديث) لە (موصل)، پاشان سەرۆکی (بادینان) بە دوایدا نارد بۆ (ئامێدی)، لەوێ ماوەك دەرسی داوە، دوایی ناکۆکی لە نێوان سەرۆکەکانی ئەوێ پەیدابوو، (مزوری) لەوێ باری کرد، گەڕاوە (موصل) لە قوتابخانەی حاجی زەکەریا دەستی کرد بە دەرسدانەوە، یەك لە

فەقێیانی ئەو سەردەمی جەنابی شێخ نورەدینی بریفکانی بوو ساڵی ١٨٠٨ز، پاشان چووە (بەغدا) لەوێ دەرسی دەدا.

بەشێك لە فەقێیەکانی:

١. عبدالرحمان محەمەد موحسین قازی بەغدا، ساڵی ١٢٤٥ك – ١٨٢٩ز ئیجازەی لە خزمەت وەرگرت.

٢. شێخ ئیبراهیم فەسیح حەیدەری: خاوەنی کتێبی (عنوان المجد).

٣. شێخ نورەدین بریفکانی: شێخی تەریقەتی قادری لە (بادینان).

٤. مەلا ئەحمەد ئۆمەرگومبەتی: ساڵی ١٨٢٩ز.

٥. عبدالله محەمەدئەمین تورکمانی.

٦. مەلا مەحمودی کوڕی عەبباسی کوڕی عومەری دیملانی.

٧. مەلا عبداللهی باپیرەگەورەی سەرۆك مەلا مصطفای بارزانی.

٨. مەلا محەمەدی کوڕی عبداللهی زیارەتی.

٩. مەلا مەحمودی هەولێری: ساڵی ١٨٠٢ز.

١٠. مەلا حوسێن عەلی بەغدایی: ساڵی ١٢٤٤ك – ١٨٢٨ز ئیجازەی وەرگرت.

١١. مەلا محەمەدی (مەجذوب).

تەریقەتی: مزوری تەریقەتی نەقشبەندی لە مەولانا خالیدی شارەزوری وەرگرت، مەولانا زۆر رێز و حورمەتی دەگرت، گەلێ خۆشی دەویست، جارەك دەچیتە سەردانی دەبینێ مزوری نوستووە، دڵی نایێ گازی بکا، دەمی ماچ دەکا، دەگەڕێتەوە دەڵێ: (خوا بۆ ئێمەت بێلی)، ئەو پەیوەندیە لە نێوانیان هەر مابوو، کە مەولانا سەفەری کرد بۆ (شام) چەند نامەیان بۆ یەك و دوو دەنارد.

دانراوەکانی:

١. هەشت ئامۆژگاری بۆ شێخ مەعروفی نۆدەیی، دەربارەی ئاشتبوونەوەی لەگەڵ مەولانا خالید.

٢. نامیلکـەی عـەرەبی: دەربـارەی مـەولـودی پێغەمبـەر (درودی خـوای لـێ بـی)، سەرەتایەکەی دەست پێ دەکا بە: (الحمد لله الذي نوّر وقوّى هذه الأمـة الضـعيفة بوجود محمد سيد المرسلين).

٣. حاشیە لەسەر توخفەی ئیبن حەجەر: دانەکی دەستنووس و دانەکی کۆپیمان هەیە.

٤. شەرحی چەند مەتەڵ (ألغاز).

٥. حاشیە لە سەر شەرحی عیصامەدینی وەضع.

٦. نامیلکەی فارسی لە مانای (لا إله الا الله).

٧. شەرحی مەسائیلی حیساب: لە کۆتایی کتێبـی (خلاصة الحساب)ی عاملی.

٨. شەرحی موغبەچە مەیفروشی مەلای جزیری بە فارسی، ساڵی ١٨٠٧ز پێشکەشـی کردووە بە: (زوبێر پاشای کوڕی ئیسماعیل پاشای میری بادینان).

٩. شەرحی موغبەچە بە عەرەبی.

١٠. حاشیە لەسەر فەرائیزی ئیبن حەجەر.

کۆچی دوایی: بەپێی نووسینی مەلا خالیدی کـوڕی مامۆسـتا مـزوری لـە ٢٣ی شەووالی ساڵی ١٢٥٤ك - ١٨٣٩ز لە بەغدا کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی گەیلانی نزیك گۆڕی مەلا هیدایةالله ی (هەولێری) بە خاك سپێردرا.

کوڕەکانی: ئەوەی زانیومانە، مزوری پێنج کوڕی هەبووە:

١. مەلا عبدالرحمان: ئەویش کـوڕێکی هـەبووە نـاو محەمـەد سـەعید، شـاعیر بـووە، نازناوی (میهری)یە، دیوانی شیعری هەیـە بـە فارسـی، سـاڵی ١٨٤٩ز تـەواوی کردووە، لە (ئاکرێ) موفتی بووە، کوڕێکی هەبووە ناو (طاها).

٢. محەمـەد صـاڵح: لـە جۆلـەمێرگ دانیشـتووە، هـەر لـەوێ سـاڵی ١٢٥٩ك - ١٨٤٣ز شەرحی موغبەچەی باوکی نووسیوە، لەگەڵ (کافیة)ی نـەحو، سـاڵی ١٨٤٧ز چووە (بەغدا) بۆ زیارەتی گۆڕی شێخ عبدالقادری گەیلانی.

وە هەروەها کوڕی ناو خالید و طاها و ئەحمەدیشی هەبووە.

دوای مزوری کوڕی هەرە زانای خۆی مەلا ئەحمەد بوو، لە جێی دانیشت دوای ئەو عبدالهادی کوڕی، ئەویش ساڵی ١٨٩٤ز لە (ئەترووش) کۆچی دوایی کرد، دوای ئەو مەلا ئەحمەدی کوڕی، ئەویش فەقێی مەلا عبداللّٰەی جەلی کۆیە بوو، ساڵی ١٩٤٢ز لە (ئەترووش) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان


١. عنوان المجد ١١٨ – ١٣٥ – ١٣٧.

٢. یادی مەردان ١/١١٦ – ١١٨.

٣. ژیناوەری زانایانی کورد ٦٦٩ – ٦٧٢.

٤. دەنگی زانا ٣١ و ٣٢ / ١٩٩٩ز.

٥. بوژاندنەوە ٣/٦٧–٧١–٢٣٩–٢٤٢ ٤/٣٥١–٣٥٦ ٥/٣٥٧ ٦/٩.

٦. مشاهیر الکورد ٢/٢٢٢.

٧. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٦٢١ – ٦٢٣.

٨. غایة المرام ١٠٩ – ١١٠.

٩. الأکراد في بهدینان ٨٠ – ١٦٦.

١٠. معجم أعلام الکورد ٧٦٤.


## یەحیا سەلامە حصکەفی (١٧٢٠)

ناوی یەحیایە، کوڕی سەلامەی کوڕی حوسێنی کوڕی محەممەدە، خەڵکی (طەنزە)ی سەر بە (دیاربەکر)ە، ساڵی ٤٦٠ك – ١٠٦٧ز لە (حصن کیفا) هاتەدنیا، لە (بەغدا) خەریکی خوێندنی شەریعەت بوو، شارەزاییەکی چاکی پەیداکرد، گەڕاوە (میافارقین – سلیوان)، هەر لەوێ ساڵی ٥٥٣ك – ١١٥٨ز کۆچی دوایی کرد.

چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. دیوان شیعر.

٢. رسائل الحصکفي.

٣. عمدة الإقتصاد في النحو.

مامۆستا زانایەکی مەزنی مەزهەبی شافیعی بوو، لە (حصن کیفا)، وە لە (میافارقین) ووتارخوێن بوو، دەرسی دەداوە، شاعیر بوو، نمونەی شیعری:

| | |
|---|---|
| أشكوا الى الله من نارينِ: واحدةٌ | في وجنتَيْه، وأُخرى منه في كَبِدي |
| ومن سقامين: سقمٌ قد أحلَّ دمي | من الجفون، وسقمٌ حلَّ في جسدي |
| ومن دُموعينِ: دمعي حين أذكرُه | يُذيعُ سري، وواشٍ منه بالرصدِ |
| ومن ضعيفين: صبري حين أذكره | وودّه، ويراه الناس طوع يدي |
| مهفهف رقَّ حتى قلتُ من عجب: | أخصره خنصري؟ أم جلده جلدي؟ |

سەرچاوەکان


١. البداية والنهاية ١٢/٢٥٥ – ٢٥٧.

٢. وفيات الأعيان ٥/١٥١ – ٢٥٦.

٣. مشاهير الكورد ٤٢٧.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٢٤ – ٦٢٥.

٥. شذرات الذهب ٤/١٦٨ – ١٦٩.

٦. سير أعلام النبلاء ١٢/١٧٥ – ١٧٦.

٧. هدية العارفين ٢/٥٢٠.

٨. كشف الظنون ٢/١١٦٦.

٩. معجم المؤلفين ١٣/٢٠٠.

١٠. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ١/٤٣٨ – ٤٣٩.

١١. المنتظم ١٠/٤٣٣ – ٤٣٨.

١٢. الأعلام ٢/٢٨٨ /٩/١٨٣.

١٣. معجم الادباء ٧/٢٨١ – ٢٨٢.

١٤. الأنساب ٢/٢٦٩ – ٢٧٠ /٤/٥٣ – ٥٤.

١٥. معجم أعلام الكورد ٧٦٣.

## یەحیا شەرەفەدین ڕوهاوی (١٧٢١)

مامۆستا یەحیا نازناوی شەرەفەدینە، خەڵکی شاری (ڕوهایە) لە کوردستانی تورکیا، مەزهەبی حەنەفی بووە، لە (دیمشق) دابەزیوە، ساڵی ٧٤٢ك چووە (میصر)، لەوێ نیشتەجێ بوو، تا ساڵی ٧٤٩ك – ١٣٤٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٨/٢٧٩.

## یەحیا عبدالرحمان فارقی (١٧٢٢)

ناوی یەحیایە، کوڕی عبدالرحمانی کوڕی حەبیشە، خەڵکی شاری (میافارقین)ە، لە (بەغدا) نیشتەجێ بووە، ناسرابوو بە زاتەکی بە دین و ڕاستگۆ، ساڵی ٤٣٩ك – ١٠٤٧ز هاتەدنیا، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٥٢٩ك – ١١٣٥ز لە (بەغدا) کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ١٤/٣٠٨ – ٣٠٩.

٢. اللباب ٣/٤٠٥.

## یەحیا عبدالله شارەزوری (١٧٢٣)

ناوی یەحیایە، کوڕی عبداللەی کوڕی قاسمی شارەزوریە، ڕۆژی هەینی ١٢ی مانگی ڕەجەبی ساڵی ٤٩٥ك – ١١٠٢ز هاتەدنیا، زانایەکی شەرع زان بوو لە ١٩ی ڕەمەزانی ساڵی ٥٥٦ك – ١١٦١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٢٦.

٢. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٢١٣.

٣. الإكليل في محاسن أربيل ٩٣.

## یەحیا عبداللە کاژاوی (١٧٢٤)

ناوی یەحیایە، کوڕی عبداللە ی کوڕی محەممەدی کوڕی سەید خالیدی (کاژاوی)یە، سەیدی حوسێنی‌یە، لەو گوندە هاتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لەگەڵ سەید محەممەدی برای گەڕان لە چەند شوێنان، چوونە (سلێمانی)، چوونە (مەهاباد)، چوونە (بانە)، یونس خانی سەرۆکی شارەکە پێشوازی کردن، سەید محەممەدی کردە (مودەرریس)، سەید یەحیا یاریدەدەر، سەید محەممەد کۆچی دوایی کرد، سەید یەحیا بووە جێگری، دەرسی دەداوە تا سەید عبداللەی کوڕی سەید محەممەد خوێندنی تەواوکرد، ئەویان لە جێی باوکی دانا، سەید یەحیا چووە مزگەوتێکی تر، هەریەك لە مزگەوتێك مام و برازا دەرسیان دەدا، ساڵی ١٣٣٥ك – ١٩١٦ز باریان کرد، لە (بانە) هاتنە گوندی (چوێسە) نزیك (پێنجوێن)، لەوێ سەید یەحیا کۆچی دوایی کرد، منداڵەکان بەشێك چوونە (سلێمانی)، بەشێك چوونە (هەورامان)، بەشێك گەڕانەوە بۆ (مەریوان).

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٢٧ – ٦٢٨.

## یەحیا عەلی حەڕانی (١٧٢٥)

ناوی یەحیایە، کوڕی عەلی کوڕی یەحیایە، نازناوی (ئەبو عەلی جمالی)یە، یەکە لە زانایە فەرمودەناسەکانی شاری (حەڕان)، ساڵی ٢٨٩ك – ٩٠٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. اللباب ١/٢٩١.

٢. الأنساب ٢/١١١.

## یەحیا عەلی ماجیدی (١٧٢٦)

ناوی یەحیایە، کوڕی مەلا محەممەدە، ساڵی ١٨٨٧ز لە گوندی (گردەڕەشە)ی ناوچەی (خەبات) هاتەدنیا.

خوێندنی: لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، هەر لەلای ئەو قۆناغی سوختەیی بردەسەر، ئەمجا چووە لای مەلا عوسمانی خورمەلە، دوایی چووە لای مەلا

صاڵحی شێروانی، پاشان چووە لای مەلا عەزیزی (عەوینە)، دوایی چووە (خەتە) لای مەلا عبدالفتاح، چووە (مەخمور) لای مەلا عبدالفتاحی شوان، هاتە (هەولێر) خزمەت شێخ مصطفای نەقشبەندی، زانستەکانی تەواوکرد، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: دانیشت بە مەلایەتی، دەرسی فەقێیانی دەداوە لە (ماجیداوە)، ماوەك چووە (بشیریان)، ماوەکیش لە (گردەپان).

خووڕەوشتی: زانایەکی زیرەك و هوشیار بوو، فەرائیز و مەنتیقی چاك دەزانی، لە عەرەبی و فارسی و تورکی زمان ڕەوان بوو، شاعیر بوو، نموونەی شیعری عەرەبی کە ساڵی ١٩٣٧ز لە گوندی (بشیریان) داناوە:

خَفْ من الدهرِ يا صاحبِي ولا تأْمن من المكرِ

فأن الدَّهرَ مجبولٌ على الميلِ الى الغدْرِ

يودُّ أَبخلَ الخلقِ يربِّيهِ بثديِهِ

كريمُ النفسِ مفطومٌ ذليلٌ كاسدُ القدرِ

اخأ التقوى فلا تحزنْ فأن الدهرَ لا يبقَى

يُعاديكَ وفي العُقبى يزولُ العسرُ باليسرِ

سلُوا (يحيى) كمْ عن كيدِ الزمانِ إنه عاشَ

زماناً ذاقَ طعميْه رأى حيناً من الدهرِ

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٥٩ز لە گوندی (گردەپان) کۆچی دوایی کرد، دوای خۆی مەلا عەلی کوڕی جێگری بوو، ئەویش کۆچی دوایی کرد چەند کوڕی هەنە، ڕۆشنبیر و نووسەرن.

سەرچاوەکان:

١. خۆری ئیسلام ٣٥/ ٢٠٠٧ز.

٢. دەستووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## یەحیا عومەر نابینا (١٧٢٧)

ناوی یەحیایە، کوڕی عومەری کوڕی طەباخە، خەڵکی (حەڕان)ە، قورئان خوێن و شەرع زان بووە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، لە (واسط)ی خوێندووە، پاشان هاتە (بەغدا)، دوایی گەڕاوە (حەڕان)، لەوێ دەرسی دەداوە، لە مانگی شەووالی ساڵی ٦٠٧ك – ١٢١١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٥/٣١.

## یەحیا محەممەد چورستانی (١٧٢٨)

ناوی یەحیایە، کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا عبدالرحیمی چورستانی‌یە، لە ٢٨/٢/١٩٢٤ز لە شاری (سلێمانی) هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە لای مامی مەلا عبداللە، ساڵی ١٩٤٨ز چووە قوتابخانەی (سلێمانیە) لە بەغدا، لای مەلا ئەمجەد ئەفەندی زەهاوی، هەروەها لە قوتابخانەی حوسێن پاشا لای مەلا محەممەدی قزلجی، لە ١٩٥٠ز ئیجازەی وەرگرت، کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی (سەرا)، ووتارخوێن لە مزگەوتی شێخ صەندەل، لە ١٩٥٣ز کرا پێش نوێژی سوپای عێراق، لە ١٩٧٣ز لەگەڵ سوپا چووە (سوریا) و (ئوردن) بۆ بەرگری هێزی جولەکە، دوایی گەڕاوە، کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی نەخۆشخانەی ڕەشید لە بەغدا.

سەرچاوە: تأریخ علماء بغداد.

## یەحیا محەممەد کوردی (١٧٢٩)

ناوی یەحیایە، کوڕی محەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوردییە، نازناوی (تاجەدین)ە، لە مانگی صەفەری ساڵی ٦٨٠ك – ١٢٨١ز کرایتە قازی لە شاری (حەلەب).

سەرچاوە: البداية والنهاية ١٣/٢٩٨.

## یەحیا نوح وانی (١٧٣٠)

ناوی یەحیایە، کوڕی نوحی کوڕی عبدالله‌یە، ووتارخوێن بووە لە مزگەوتی گەورەی وانە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەحمەد خانی کوڕی محەممەد خانی عوسمانی، ساڵی ١٧٠٢ز کۆچی دوایی کرد، کتێبی (المباحث الدرية)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. هدية العارفين ٦/٥٣٤.

٢. معجم المؤلفين ١٣/٢٣٥.

٣. الأعلام ٩/٢٢١ /١٠/٢٤٩.

٤. بوژاندنەوە ٦/١٥٢ – ١٥٣.

## یەزید محەممەد ڕوهاوی (١٧٣١)

ناوی یەزیدە، کوڕی محەممەدی کوڕی یەزیدە، ناسراوە بە (ئەبوفەروە)، فەرموودەی لە ئەبونەعیمی کوفی گێڕایەوە، ئەبوعوروبەی (حەڕانی)ش لەوی بیستووە، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٢٦٩ك – ٨٨٣ز لە شاری (ڕوها) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ٣/١٢٠.

٢. البداية والنهاية ١١/٥١.

## یەعقوب ئەحمەد کوردی (١٧٣٢)

ناوی یەعقوبە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدی کوڕی ئەحمەدە، لە (نیسابۆر) ژیاوە، نووسەر و زمانزان بووە، شیعری هەیە، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٤٧٤ك – ١٠٨٢ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (البُلغة في اللغة)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. بغية الوعاة ٢/٣٤٧.

٢. هدية العارفين ٢/٥٤٤.

٣. معجم المؤلفين ١٣/٢٤١.
٤. معجم أعلام الكورد ٧٦٤ – ٧٦٥.
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٢٨.
٦. كشف الظنون ١/٢٥٣.
٧. تأريخ مشاهير كورد ١/٣١.

## یەعقوب محەممەد سەرکردە (١٧٣٣)

ناوی یەعقوبە، کوڕی محەممەدی کوڕی حەسەنی (هەولێری)یە، لە (شام) دانیشتووە دەرسی لەلای ئیبن ئەثیری جزیری خوێندووە، خاوەن زانیاری بووە، لە مانگی مەولودی ساڵی ٦٤٥ك – ١٢٤٧ز لە (میصر) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/٢٣٣.
٢. سير أعلام النبلاء ١٣/٣٣١.

## یەعقوب یوسف ئەییوبی (١٧٣٤)

مەلیك یەعقوب کوڕی سوڵتان صەلاحەدینی ئەیوبییە، ساڵی ٥٧٢ك – ١١٧٦ز هاتەدنیا، هەرچەندە مەلیك و سەرکردە و کاربەدەست بوو، بەڵام هەروەك مەلیکەکانی ئەیوبی دریغی نەکرد لە کۆکردنەوەی زانست و زانیاری، خەریکی خوێندنی فەرموودەکانی پێغەمبەر بوو (درودی خوای لێ بێ) لە (میصر) و لە (شام)، دوایی دەرسی دەداوە لە (مەککە)ی پیرۆز و لە (مەدینە)ی پیرۆز و لە (دیمشق)، ساڵی ٦٢٧ك – ١٢٢٩ز لە شاری (حەلەب) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٧٦٥.

## یوسف ئەبوبەکر سورچی (١٧٣٥)

ناوی یوسفە، کوڕی ئەبوبەکرە، عەشیرەتی (سورچی)یە، تیرەی (مامەسام)ە، دەستی کرد بە خوێندن، بە شێوەی فەقێیانی کوردستان، گەڕا لە چەند شوێنان، ماوەك

چووە (بجیل) لای مەلا شێخ حوسێنی سورچی، دوایی چووە گوندی (قەراسنج) لای هەمان مامۆستا، پاشان هاتە (بەحرکە) لای مەلا عوسمانی شەوەکی، لەوێ کۆتایی بە خوێندن هێنا، بووە مەلا لە گوندی (جێژنیکان)ی ئەبابەکر، تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ مصطفای شێخ ئەبوبەکرد وەرگرت.

خووڕەوشتی: زانایەکی لایەن حەق بوو، حەق خواز و حەق گۆ بوو، ڕوو لە خوا بوو، پشت لە دنیا بوو، جار وابوو ئیشی سەیری دەکرد، بەڵام لە قوولدا کارەکانی هەموو ئامۆژگاری بوون، زوو تورە دەبوو، تورەبوونەکەی لەسەر حەق بوو، بۆ خوا بوو، بۆیە خەڵکان دڵیان لێ نەدەهێشا، دۆستایەتی بەهێزبوو لەگەڵ: مەلا عبداللهی بەحرکەیی باوکم، مەلا عەلی پەریتانی، مەلا عەلی نەنۆشێ.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٣٦ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخ ئۆمەر لە (هەولێر) بە خاك سپێردرا، دوای خۆی مەلا محەممەدی کوڕی پاش تەواوکردنی خوێندنی لە (بەحرکە) دانیشت بە مەلایەتی، لە (جێژنیکان) جێگای باوکی، ئەویش ساڵی ١٩٨١ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخ مصطەفا لە (جێژنیکان) بە خاك سپێردرا، تەنیا کوڕێکی هەبوو دەوری ساڵی ١٩٥٥ز جوانەمەرگ بوو.

## یوسف ئەحمەد دینەوەری (١٧٣٦)

ناوی یوسفە کوڕی ئەحمەدی کوڕی یوسفی کوڕی کەجە، یەکە لە زانایە مەزنەکانی مەزهەبی شافیعی، دەرسی لە لایەن ئەبوحوسێنی قەططان و عبدالعزیز دارەکی خوێندووە، لە (دینەوەر) قازی بووە، خەڵکان لێی دەورین بۆ فێربوونی شەریعەت، چەند دانراوی هەیە، لەوانە (التجرید)ە، لە شەوی ٢٧ی ڕەجەبی ساڵی ٤٠٥ك – ١٠١٥ز بە دەست چەند دزی تاوانبار، لە (دینەوەر) شەهیدکرا.

سەرچاوەکان:

١. وفيات الأعيان ٦/٦٣.

٢. معجم المؤلفين ١٣/٢٧٣– ٢٧٤.

٣. مشاهير الكورد ٤٣٢.
٤. معجم أعلام الكورد ٧٦٦.
٥. شذرات الذهب ٣/١٧٧ – ١٧٨.
٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٢٩.
٧. هدية العارفين ٢/٥٥٠.

## یوسف ئەییوب (سوڵتان صەلاحەدین ئەییوبی) (١٧٣٧)

سوڵتان صەلاحەدینی ئەیوبی، قارەمانی مێژووی کوردو ئیسلامەتییە، ناوی یوسفە، کوڕی ئەیوبی کوڕی شادی کوڕی مەروانی کوڕی یەعقوبە، نازناوی (ئەبو مظفر)ە، ناسراوە بە: (سوڵتان صەلاحەدینی ئەیوبی)، باوکی لە (دوین) دانیشتووە، هەرچەندە گوندێك هەیە نزیك (حەریر) ناودەبردرێت بە (دیوین) لە کۆنەوە شار بووە، قەلاتەکی پاشایانی لێیە، دەشێ جێگای باب و باپیرانی صەلاحەدین بێ، بەلام سەرجەمی سەرچاوە کۆنەکانی ئەو سەردەمی دەڵێن: {دوین جێگای کوردەکان و پاشایە ئەیوبییەکانە لە ئازربێجان}.

هەرچۆنێ بێ، لە هەر شوێن بێ، کوردە و بۆ ئێمە سەربلندییە، منیش لە مێژە حەزم دەکرد، ئەم کتێبە پیرۆز بکەم بە باسی ژیاننامەی ئەو زاتە، بەلام ماوەك لە نیشەکە دوو دڵ بووم، چونکە ئەو کتێبەم تەرخان کردووە، بۆ مێژووی زانایان، نەوەك مێژووی حوکمداران و ناوداران، تا دیتم مامۆستا تاجەدین عبدالوەهاب ئبن سوبکی، لە (طبقات الشافعية الكبرى ٤/٢١٧) دەڵێ: {بیستوومە قورئانی پیرۆزی هەموو لەبەر بووە، هەروەها، کتێبی (التنبيه) بابەتی فیقهی ئیسلامی لەگەڵ چەندان دیوان حەماسە و شیعری لەبەرکردووە، حەزی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) بووە، لای چەند زانایانی خوێندووە، زانایەکی شەرع زان بووە، دەرسی داوە}. جا دەرفەتم وەرگرت بۆ ماوەك قەڵەمەکەم خستەکار، بۆ نووسینی چەند لاپەڕەی زێڕین لە ژیانی ئەو سەروەرە، لە

ڕێزی زانایەکانی تر، کە هەر یەك لەوانە چیای گەورەی کوردستان بوون، ڕۆژگار نەیدەجوولاندن، ڕۆژی ڕووناك بوون بۆ کوردستان و عەرەبستان.

خووڕەوشتی: مەلیکێکی خاوەن دەستەلات بوو، خەلکان خۆشیان ویستووە، بۆیان داهێناوە، پشتگیری ئیسلامەتی کردووە، چەند غەزای کردووە، دوشمنانی ئیسلامی تێکشکاندووە، ماوەی بیست و چوار ساڵ لە پێناوی ئاینی پیرۆز هەوڵی داوە، ماڵی خۆی بەخشیوە، مەرد و ڕەشید بووە، خواناس و لە خواترس و خواپەرست بووە، نوێژی کۆمەڵی نەچواندووە، دڵنەرم و بە ڕوحم بووە، فەرموودەکانی پێغەمبەریان (درودی خوای لێ بی) بۆ دەخوێندەوە دەگریا، بە یەك چاوی تەماشای پاشا و گەدای دەکرد، لەگەڵی دانیشتبای هەستت نەدەکرد مەلیکە، وەك برادەرەکی یاسایی قسەی لەگەڵ دەکردی، قەت قسەی سووکی دەرهەق کەس نەدەکرد، فیز و خۆهەڵکێشانی لەسەر کەس نەدەکرد، دەرگای کراوە بوو بۆ سکالا، نووسراوی بەس بۆ خێربوو، بۆ ئازار نەبوو.

هۆی دوورکەوتنەوەی ئەو بنەماڵە لە کوردستان: نەجمەدین ئەیوبی باوکی صەلاحەدین، برادەرەکی ئازیزی هەبوو ناو (بەهرۆز)، شتێکی لێ ڕوودا لەگەڵ کاربەدەستەکانی (دوین)، ناچار باری کرد، نەجمەدین لەگەڵیدا چووە (بەغدا)، لەوێ سوڵتان محەممەد مەلیك شای سەلجوقی یەکسەر (بەهرۆز)ی کردە والیی بەغدا، لەدوو (شادی) باوکی نەجمەدینی هەنارد، هاتە (بەغدا)، ئەویان کردە سەرکاری قەلای (تکریت)، لەوێ (شادی) کۆچی دوایی کرد، نەجمەدینیان لە شوێنی دانا، هەر لەوێ ساڵی ٥٣٢ك – ١١٣٧ز صەلاحەدین لە دایك بوو، لەوکاتە یەك لە سەرکردەکانی قەلایەکە بە دەست (شێرکۆ)ی برای نەجمەدین کوژرا، بۆیە سەر لە بەیانی نەجمەدین لەگەڵ برای باریان کرد بۆ (موصل) لە لای سوڵتان نورەدین مەحمود زەنکی دابەزی، ئەویش زۆر ڕێزی لێنا، کە (دیمشق) و (بعلبك)ی وەرگرت، نەجمەدینی لەسەر دامەزراند، صەلاحەدینیش لەژێر چاودێری باوکی بوو.

پلە و پایەکانی صەلاحەدین: سولتان نورەدین مەحمود، دیتی صەلاحەدین زیرەك و لێهاتووە، کردیە سەرلەشکر، بە سەرۆکایەتی (شێرکۆ)ی مامی ناردنی تا (میصر)ی بۆ وەربگرن، بەرێکەوتن لە مانگی رەجەبی ساڵی ٥٥٩ك – ١١٦٤ز سەرکەوتن، میصریان بۆ وەرگرت، گەڕانەوە (دیمشق)، پاشان (شاور)ی گەورەی (میصر) لە بنەوە بە دزی لەگەڵ فەرەنگەکان رێککەوت لە دژی سولتان نورەدین، کە سولتان ئەو باسەی زانی، دووبارە صەلاحەدین و شێرکۆی ناردەوە میصر بۆ سەرکوت کردنەوەی (شاور)، کاتێ چوونە ئەوێ وایان بۆ دەرکەوت: ئەم شاورە دووزمان و دووڕوو و دڵپیسە، کاتی تەنگاوی هاوار دەباتە بەر سولتان، کاتی شێنەیی رێککەوتن لەگەڵ فەرەنگان دەکا، بۆیە لەسەر فەرمانی (شێرکۆ)، صەلاحەدین بە دەستی خۆی شاوری گرت، لە ساڵی ٥٦٤ك بڕیاری کوشتنی درا و لەسەری درا، (شێرکۆ) لە جێی داندرا، سێ مانگ پێچوو (شێرکۆ) کۆچی دوایی کرد، لە لایەن (عاضد باللە)ی مەلیکی (میصر) صەلاحەدین لە جێی داندرا، نازناوی مەلیك ناصری پێدرا، ساڵی ٥٦٩ك سولتان نورەدین کۆچی دوایی کرد، ئیسماعیلی کوڕیان لە جێ دانا، ماوەکی کەم جێگری باوکی بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی منداڵ بوو، بێ دەستەڵات بوو، نەیتوانی کاروباری وڵاتەکە بە چاکی بباتە سەر (صەلاحەدین) ترسا، فەرەنگەکان دەرفەت وەربگرن و هێرش بکەنە سەر وڵاتەکە و داگیری بکەن، بۆیە لەشکری هێنا سەر (دیمشق) و کۆنترۆڵی کرد، هەروەها لە ٥٧٠ك (حمص) و (حما)ی گرتە دەست، ئیسماعی پاشایان هێنا خوارەوە و لێیان خست، صەلاحەدین لە جێی داندرا.

دڵفراوانی صەلاحەدین: جارەك بۆ حەسانەوە، لەسەر ئەرز پاڵی داوە، دەستی ڕاستەی لە بن سەری دانا، لەو دەمە بەندەکی خزمەتکار هاتە لای، نەی دیت پێی لەسەر دەستی سولتان دانا، ئیشی خۆی عەرز کرد، سولتان لە تاوی ژانی دەستەکەی بێ دەنگ بوو، وەڵامی نەداوە، کابرایەکە دووبارە ئیشەکەی عەرز کردەوە، ئەمجارە سولتان پێی گوت: {نازانم بە دەستم ئیشەکەت بۆ بکەم یا بە پێم؟}، پیاوەکە سەری شۆڕ کرد، دیتی

ئەوە پێی لەسەر دەستی سوڵتان داناوە، زۆر بەسەر خۆیدا شکاوە، وە ئەو و ئامادەبووەکان، لە نەرمی مەلیك تا ئەم ئەندازەیە، سەرسام بوون.

کارەکانی ئەنجامیدان: دەستی کرد بە: دامەزراندنی لەشکرێکی بەهێز و بە دەستەڵات و توانا، جێبەجێ کردنی ئیش و کاری خەڵکان، دابەشکردنی پارە و ئازوقە و جلوبەرگ، رێکخستنی کاروباری ئاینی و کۆمەڵایەتی، گرتنی چەند شاران و چەند شوێنان و چەند ناوچان، لەوانە: میصر، حیجاز، یەمەن، دیمشق، بەعلەبەك، حیمص، حەلەب، حەما، قودس، غەززە، عەسقەلان، یافا، حەیفا، عەککا، طەبەریە، کەرك، صەفد، کەوکەب، شوبك، صەیدا، بانیاس، بێروت، لازقییە، صەهیۆن، بلاطنس، حەڕان، ڕوها، رقە، رأس العین، سنجار، نوسەیبین، سروج، دیاربەکر، میافارقین، ئەگەر تەمەنی درێژبا، بە یارمەتی خوا دنیای هەموو داگیر دەکرد.

گرتنی قودس: دوشمنان هێزی خۆیان کۆکردەوە، شێست هەزار چەکداریان ئامادەبوون، دەوروبەری (قودس)یان قایم کرد، لە قەڵات و لە سەنگەران خۆیان حەشاردا، بەڵام (ئەگەر خوات یاری کار بی، با دوشمنت هەزار بی)، بە یارمەتی خوای گەورە بە موژدە دانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بی) کە فەرموویەتی: ﴿نصرت بالرعب مسیرة شهر﴾ (ئیمامی ئەحمەد گێڕایتیەوە، الفتح الربانی ٢٢/٤٠)، واتە: (لە دووری یەك مانگە رێ، خوای گەورە وادەکات دوشمنان بترسێن، شەڕ نەکەن ئێمە سەربکەوین)، صەلاحەدین بە ماوەی دوازدە ڕۆژان توانی شاری قودسی پیرۆز لە ٥٨٣ك – ١١٨٧ز لە دەست صەلیبیەکانی پیس و چڵکن ڕزگار بکات، صەلیبەکان بشکێنێ و ئاسەواریان ببڕێنێتەوە، دەنگی (الله أکبر) بەرزبکاتەوە، گۆڕەکانی پێغەمبەرەکان (درودی خوایان لێ بی) پاك بکاتەوە لە شەوێکی وا پیرۆز، کە دەکاتە شەوی هەینی ٢٧ بیست و حەوتی ڕەجەب واتە شەوی ئیسرا و میعراج.

نەخۆشی و کۆچی دوایی: صەلاحەدین نەخۆش کەت، ڕۆژ بە ڕۆژ دەردەکەی گرانتر دەبوو، نورەدین عەلی کوڕە گەورەی کردە جێگری، بانگی سەرۆکی قازیانی

کرد، قورئانی پیرۆزی لەسەر بخوێنێ، ماوەکی زۆری لەسەر خوێند، تا شەوی ٢٧ی مانگی صەفەر، ساڵی ٥٨٩ك – ١١٩٣ز پاش نوێژی بەیانی گەیشتە ئایەتی: ﴿لاالـه الا هو عليه توكلت﴾ (تەوبە / ١٢٩) صەلاحەدین گیانی پاکی بەرەو بارەگای خوای گەورە بەرێکەوت، لە قەلاّتی (دیمشق) بە خاك سپێردرا، لەسەر وەسیەتی خۆی ئەو شمشێرەی غەزای پێدەکرد، لەگەلێیان لەناو گۆڕەکە دانا، بەو مەبەستە ڕۆژی دوایی کە هەستاوە ئەو شمشێرە بە دەست دەگرێ و شایەدی بۆ دەدا، هەروەها وەسیەتی کرد قوتابخانەکی شافیعیان بە خێری ئەو دروست بکرێت، یەك لە پیاوە چاکەکانی ئەو سەردەمی لە خەودا دیتی: {کەوا پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) لەگەڵ کۆمەڵێك لە یارانی دەچن بۆ زیارەتی گۆڕی صەلاحەدین}، پاش مردنی هیچ میراتی لە دوای بەجێ نەما، نە ماڵ، نە باغ، نە زەوی، نە خانوو، چونکە هەرچی دەهاتە چەنگی خەرجی دەکرد، دەیبەخشی نەدەماوە.

کوڕەکانی و مێژووی لە دایکبوونیان، صەلاحەدین شازدە کوڕی هەبوو:

١. عەلی ٥٦٥ك – ١١٦٩ز.
٢. عوسمان ٥٦٧ك – ١١٧١ز.
٣. خضر ٥٦٨ك – ١١٧٢ز.
٤. ظاهیر ٥٦٨ك – ١١٧٢ز.
٥. ئیسحاق ٥٧٠ك – ١١٧٤ز.
٦. مەسعود ٥٧١ك – ١١٧٥ز.
٧. یەعقوب ٥٧٢ك – ١١٧٦ز.
٨. داود ٥٧٣ك – ١١٧٧ز.
٩. محەمەد ٥٧٥ك – ١١٧٩ز.
١٠. ئەحمەد ٥٧٧ك – ١١٨١ز.
١١. تۆرانشا ٥٧٧ك – ١١٨١ز.

١٢. ئەییوب ٥٧٨ك – ١١٨٢ز.

١٣. مەلیکشا ٥٧٨ك – ١١٨٢ز.

١٤. شادی.

١٥. مەروان

١٦. ئەبوبەکر: لە (حەڕان) لە دایکبوو.

صەلاّحەدین تەنیا یەك کچی هەبوو، ناو مونیسەخان، خێزانی مەلیك محەممەد ئەییوبی ئامۆزای بوو.

سەرچاوەکان:


١. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٢١٧.

٢. شذرات الذهب ٤/٢٩٨.

٣. البداية والنهاية ١٣/٣ – ٧.

٤. وفيات الأعيان ١/٢٣٢ /٦/١٣٩ – ٢١٨.

٥. معجم أعلام الكورد ٧٧٥ – ٧٧٨.

٦. شەرەفنامە ١٧٧ – ١٩٠.

٧. معجم البلدان ٢/ ٤٩١.

٨. سيرة صلاح الدين الأيوبي ٤.

٩. اللباب ١/٥١٧.

١٠. مشاهير الكورد وكوردستان ١٩ – ٢٨ – ٤٣١.

١١. الكامل ٩/ ٢٢٥ – ٢٢٨.

١٢. الأعلام ١/٣٨١ – ٣٨٣ /٢/٧٤ /٩/٢٩١ – ٢٩٣.

١٣. تاريخ مشاهير كورد ٣/١٥٨ – ١٦٢.

١٤. مصطفى البارزاني زعيم الحركة القومية المعاصرة ١٥٤.

١٥. پەیامی زانایان ١١/٢٠٠٧ز.

١٦. صەلاحەدینی ئەیوبی گەورەتر لە ڕەخنەگرانی ١٩ - ٢٠.

## یوسف بابا عومەر (١٧٣٨)

ناوی یوسفە، کوڕی بابای کوڕی عومەری کوڕی ڕۆستەمە، مەزهەبی شافیعی بووە، مامۆستا سەخاوی خاوەنی کتێبی (الضوء اللامع) دەڵێ: {لە (مەککە) و لە (مەدینە)م دیت، لەلای منی خوێند، ئیجازەم پێدا، ئێستا کە ساڵی ٨٩٩ك - ١٤٩٣ز یە، لە (مەدینە)ی پیرۆز دادەنیشێ هەموو ساڵ حەج دەکا}.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٤٣٨.

٢. معجم أعلام الکورد ٧٦٧.

## یوسف حوسێن حصکەفی (١٧٣٩)

ناوی یوسفە، کوڕی حوسێنی کوڕی یوسفی کوڕی یەعقوبە، خەڵکی (حصن کیفا)یە، پاش کۆچی دوایی باوکی خەریکی جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی و ئامۆژگاری خەڵکان بوو، لە (بەیتی خوا) قورئان خوێن بوو، ساڵی ٨١٦ك - ١٤١٣ز کۆچی کرد.

سەرچاوە: الضوء اللامع ١٠/٢٨٤.

## یوسف حوسێن سعێرتی (١٧٤٠)

ناوی یوسفە، کوڕی حوسێنی کوڕی مصطەفایە، زانایەکی دیاری سەردەمی خۆی بووە، لە شاری (سعێرت) موفتی بووە، هەر لەوێ لە فوتابخانەی (فەخریە) دەرسی داوە، شاعیر بووە، هۆنراوەی پەسەندکردنی کتێبی (الهدیة الحمیدیة في اللغة الکردیة)ی هەیە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٤٣٠.

٢. معجم أعلام الکورد ٧٧١.

## یوسف حوسێن کوردی (١٧٤١)

ناوی یوسفە، کوڕی حوسێنی کوڕی عوسمانی کوڕی سولەیمانی کوڕی ڕەسولی کوردیە، لەلای مامی خۆی پەروەردە بووە، بوویتە مەلا، لە مزگەوتی (طولون) دەرسی داوە، ساڵی ٨٩٠ك – ١٤٨٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الضوء اللامع ١٠/٢٨٤.

## یوسف حوسێن کوردی (١٧٤٢)

ناوی یوسفە، کوڕی حوسێنە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (دیمشق) دەرسی داوە، کتێبانی: (المسح علی الجوربین) و (تزویج الصغیرة التي لا أب ولا جد لها)ی داناوە هەر لەو شارە ساڵی ٨٠٤ك – ١٤٠١ز کۆچی دوایی کرد.

(مامۆستا) ئیبن تەیمییەی خۆش دەویست، لەگەڵی کۆدەبۆوە، بیروبڕوایەکانی لەلا پەسند بوو، بۆیە مەلا عبدالرحمانی کوڕی خۆی ماوەك هاتووچووی نەدەکرد، پاشان پێکهاتنەوە.

سەرچاوەکان:


١. هدیة العارفین ٦/٥٥٨.

٢. مشاهیر الکورد ٢/٢٢٨ – ٢٢٩.

٣. معجم المؤلفین ١٣/٢٩٤.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٦٣٤.

٥. شذرات الذهب ٧/٤٦ – ٤٧.

٦. الضوء اللامع ١٠/٢٨٤.

٧. الأعلام ٩/٣٠٢ /١٠/١٧٨.

٨. معجم أعلام الکورد ٧٦٧.

## یوسف حەمزە شارەزوری ( ١٧٤٣ )

ناوی یوسفە، کوڕی حەمزەی گۆرانە، ناوبانگی مەلا چاکی ڕۆیی بوو بەو هەشت دانراوەی خۆی، کە یەکیان ناوی (الـذهب المـذاب في مـذهب النحـاة ودقـة الإعـراب)ی لێناوە، لەو کتێبە دەردەکەوێ کەوا: ناوبراو جگە لەم هەشـتانە، هەشـت دانـراوی تـری هەیە، دانەکی دەستنووسی ئەم کتێبە لە (ئەستەمبۆڵ) هەیە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٢/٢٢٥.
٢. إيضاح المكنون ٣/٥٤٤.
٣. تأريخ السليمانية ٢٩٦.
٤. معجم أعلام الكورد ٧٦٩.

## یوسف حەیدەر روحبی ( ١٧٤٤ )

ناوی یوسفە، کوڕی حەیدەری کوڕی حەسـەنە، سـاڵی ٥٣٤ك – ١١٣٩ز لـە جزیرەی بۆتان هاتەدنیا، لە (نوسەیبین) و لە (ڕوحبە) دانیشـتووە، سـەفەری کـردووە بـۆ (بەغدا) و وڵاتانی تر، لە دکتۆری شـارەزا بـووە، لـە ٦٣١ك – ١٢٣٣ز لـە (دیمشـق) کۆچی دوایی کردووە، چەند دانراوی هەیە، لەوانە: (تهذيب شرح أبي الطيب) و (مختصر كتاب المسائل) و (مختصر الحاوي) و (مختصر الأغاني) و (مقالة في الاستفراغ).

سەرچاوە: معجم المؤلفين ١٣/٢٩٥.

## یوسف خضر ( ئەصەم ) ( ١٧٤٥ )

ناوی یوسفە، کوڕی خضری کوڕی ئەبوبەکری کوڕی ئیبراهیمی کوڕی یـەحیای سورانی یە، عەشـیرەتی (کـلاس)ە، لـە (سەردەشـت)ی ئێـران دادەنیشـن، شـایانی باسـە ئیسماعیل پاشا و عومەر ڕەضا کەحالە، ناوی باوکیان بە (محەممەد) نووسیوە، بڕوانە: هدية العارفين ٦/٥٦٥، معجم المؤلفين ١٣/٣٢٩.

هۆی ناوبردنی بە (ئەصەم): دەڵێن: {ڕۆژەك لە بن دارەك دانیشتبوو، خەریکی خوێندنەوە بوو، وازەیی دا بووە کتێبەکە، ئاگادار نەبوو کەوا کاروان و لەشکری سەربازان بەسەری وەربوون، تەنیا لەوکاتە هەستی کرد، کە پڕوشکە ئاوی پێخوستیان بەشێکی کتێبەکەی ڕەش کردەوە}، منیش وام بیستووە: ئەوەی هاتووە مێگەلی بزن و مەڕان بووە، ئەوەی کتێبەکەی شێواندووە تۆزی پێیان بووە، مامۆستا عبدالکریمی (بیارە) (خوا لێی خۆش بێ) دەڵێ: {جارەك یەك دێتە لای مەلا یوسف بۆ پرسیارەکی شەرعی، کە دادەنیشی شتێکی لێ دەقەومێ، کابرا زۆر بەسەرخۆدا دەشکێتەوە، مامۆستا بۆوەی کابرا هەست نەکا ئەو گوێی لێ بووە، دەڵێ: کوڕم وەرە پێش بزانم چ دەڵێی من گوێم گرانە، لە نزیکەوە نەبێت تێ ناگەم، پیاوەکە بەوە دڵی خۆش دەبێ، لە دڵی خۆی دەڵێ: دیارە مامۆستا لە بەسەرهاتەکەی منیش بێ ئاگایە، دوای ئەو ڕووداوەش مامۆستا نازناوی (ئەصەم)ی بۆ خۆی هێشتەوە}.

بەڵام کاکم مەلا طەیب دەڵێ: {حاتەمی کوڕی یوسفی ئەصەمی خوراسانی، زانایەکی مەزنی شەریعەت بووە، لە صەدەی سێی کۆچی ژیاوە، هەروەها محەممەدی کوڕی یەعقوبی کوڕی یوسفی ئەصەم زانایەکی بەرز بووە لە صەدەی چواری کۆچی ژیاوە، (موسنەد)ی ئیمامی ئەحمەدی کۆکردیتەوە، دوور نییە – بە نزیك دەزانم – ئەو مەلا یوسفەی باسی دەکەین، ناوبرابی بە (ئەصەم) – بۆ پیرۆزی – بەناو یەك لەمو دوو زانایانە کرابی}، هەرچۆنی بی، ڕایەکان هەموویان بەڵگەنە بۆ ڕێزداری و زیرەکی و زەین تیژی و هەوڵ و کۆششی بۆ کۆکردنەوەی زانست و خزمەت گوزاری ئایینی پیرۆزی ئیسلام و گەلەکەی خۆی.

بەشێك لە مامۆستایەکانی:

١. مەلا ئیلیاسی بەرۆژی (بانە)ی، ئەوەی بەسەر شەرحی عەقائیدی تەفتازانی دا چووە و حاشیەی لەسەر داناوە.

٢. مەلا ڕەسوڵی سۆرانی.

٣. مەلا عبدالکریم گرگەدەری شارەزوری (خەرقە پۆش).

بەشێك لە فەقێیەکانی:

١. مەلا ڕەسوڵی زەکی سەردەشتی.

٢. مەلا عبدالکریمی خالیدی: پاشان چووە (شام)

٣. مەلا مەحمودی کوردی: دوایی چووە (دیمشق) لەوێ دەرسی دەداوە.

٤. مەلا عیسای کوڕی خۆی.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٠٠٢ك – ١٥٩٣ز لە گوندی (بریسوێ) نزیك شاری (سەردەشت) کۆچی دوایی کرد.

چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. منقول التفاسیر: لە پەرتوکخانەی ئەوقافی (سلێمانی) شەش دانەی هەیە، لە پەرتوکخانەی زانکۆی صەلاحەدین لە (هەولێر) دوو دانەی هەیە، لە (سەردەشت)ی ئێران دانەکی هەیە.

٢. المسائل والدلائل في الفقه.

٣. منقول الأراد.

٤. النفائس في المواعظ: دانەکی لە (دارصدام)ی بەغدا هەیە.

٥. رسالة في شرح (كنت كنزاً مخفياً): بەشێکی لەلای ئێمە هەیە.

٦. بعض حواش على تحفة المختاج.

٧. بعض حواش على (الجامي).

٨. حاشية على حاشية عصام الدين على الجامي: محەممەد صاحیب نەقشبەندی ساڵی ٢٠٠٢ز پلەی (ماستەر)ی لەسەر وەرگرت.

٩. حاشية على حاشية قەرە داود على شرح الشمسية: دانەکی لە پەرتوکخانەی ئەوقافی (سلێمانی) هەیە.

١٠. حواش على الخيالي.

١١. حواش على عبدالغفور.

١٢. حواش على شرح الأنموذج (حدائق الدقائق).

١٣. حاشية على الغزى على قول أحمد في المنطق: دانەکی لە پەرتوکخانەی ئەوقاف (سلێمانی) هەیە.

١٤. حاشية على القرەباغی على حسامكاتي في المنطق: دانەکی لە پەرتوکخانەی ئەوقاف (سلێمانی) هەیە.

١٥. تعليقات على مير أبوالفتح في الوضع: دانەکی لە پەرتوکخانەی گشتی ئەوقاف (موصڵ) هەیە.

١٦. حاشية على حاشية حسين محمود وسيد على الجزيرى على ديباجة شرح الإيجاز.

١٧. تعليقات على المسعودي في علم الآداب: دانەکی لە پەرتوکخانەی گشتی لە ئەوقاف (موصڵ) هەیە.

سەرچاوەکان:

١. حاشية يوسف الأصم الكردي على عصام الدين ٢٠ – ٣٦.

٢. هدية العارفين ٦/٥٦٥.

٣. بوژاندنەوە ١/٢١٧–٢٢١ ، ٢/١٨١ – ١٨٣، ٣/٩٧ – ١٠٠، ٧/٢٠٨.

٤. إيضاح المكنون ٤/٥٨٤.

٥. مشاهير الكورد ٢/٢٢٧ – ٢٢٨.

٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٣١ – ٦٣٣.

٧. معجم المؤلفين ١٣/٣٢٩.

٨. خلاصة الأثر ٤/٥٠٩.

٩. معجم أعلام الكورد ٧٧٤.

## یوسف داود ئەییوبی ( ١٧٤٦ )

ناوی یوسفە، کوڕی مەلیك داودی کوڕی مەلیك عیسای ئەیوبییە، ساڵی ٦٢٨ك – ١٢٣٠ز لە شاری (کەرك) هاتەدنیا، هەرچەند مەلیك بوو، بەڵام لە خوێندن کەمتەرخەمی نەکرد، لەلایەن چەند زانایە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمی خوێندی، تا گەیشتە ئەو پلەیە، دەرسی دەدا، یارمەتی لات و هەژارانی دەدا، زاتەکی بەڕێز و بە حورمەت بوو، ساڵی ٦٩٨ك – ١٢٩٨ز لە (قودس) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٣/٢٩٣.

٢. شذرات الذهب ٥/٤٤٣.

٣. معجم أعلام الكورد ٧٦٨.

## یوسف شریکار عەینتابی ( ١٧٤٧ )

ناوی یوسفە، کوڕی شریکاری خەڵکی (عەینتاب)ە، لە قورئانی پیرۆز شارەزا بووە، سوودبەخش بووە، زمان ڕەوان و قسەخۆش بووە، ئاگاداری لە (تەفسیر) هەبووە، ساڵی ٨٢٢ك – ١٤٢٨ز لە تەمەنی شێست و پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٧/١٥٨ – ١٥٩.

## یوسف ضیاء ئەفەندی ( ١٧٤٨ )

مامۆستا یوسف ضیاء ئەفەندی ساڵی ١٢٥٨ك – ١٨٤٢ز لە (قودس) هاتەدنیا، بۆیە ناسراوە بە (مەقدیسی)، لە نەوەکانی مەولانا خالیدی شارەزوورییە، لە (دیمشق) دانیشتووە، یەکە لە زانایەکانی صەدەی سێزدەی کۆچی.

دوو دانراوی کوردی هەیە:

١. التحفة الحميدية.

٢. عكاظ الأدب.

لە حکومەتی عوسمانی چەند پلە و پایەی پێدرا، ڕەوان کرا بۆ (ڕوسیا)، لەوێ فێری زمانی ئەوان بوو، ناردرا (ڤیەننا) لەوێ دەرسی ڕێزمانی عەرەبی دەدا، ناردرا (بەتلیس) لەوێ کرا کاربەدەستی ناوچەکە، ساڵی ١٣٢٤ک – ١٩٠٦ز کۆچی دوایی کرد، لێکۆڵینەوەی دیوانی (لەبید)ی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. نثر الجواهر والدرر ٢/١٦٨٥ – ١٦٨٦.

٢. تأريخ السليمانية ٢٩٦.

## یوسف طاهر خۆیی (١٧٤٩)

ناوی یوسفە، نازناوی (ئەبو یەعقوبە)، کوڕی طاهیری کوڕی یوسفی کوڕی حەسەنە، خەڵکی (خۆی) ئازربێجانە، لە (نوقان)ی طوس دانیشتووە، لەوێ کرایتە جێگری قازی، کتێبی (فرائد الخرائد في الأمثال والحكم)ی داناوە، لە ٥٣٢ک تەواوی کردووە، هەروەها شەرحی (سقط الزند)ی مەعەری کردووە، (تنزية القرآن الشريف عن وصمة اللحن والتعريف)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٣/٣٠٦.

٢. كشف الظنون ٢/١٢٤٢.

٣. الأنساب ٢/٤٨٠.

## یوسف عبدالله دیاربەکری (١٧٥٠)

ناوی یوسفە، کوڕی عبدالله یە، خەڵکی (ئامەد – دیاربەکر)ە، زانایەکی بە توانا بووە، (هدية الإخوان في قراءة الميعاد من رجب وشعبان ورمضان)ی داناوە، لە ١٧ی ڕەجەبی ساڵی ١٢٢١ک – ١٧٠٩ز تەواوی کردووە، هەروەها (ملل ونحل)ی تورکی هەیە، تەنیا بەرگەکی چاپکراوە، دەربارەی بڕوایە.

سەرچاوەکان:

١. إيضاح المكنون ٢/٧٢٥.

٢. معجم المؤلفين ١٣/٢٩٩.

٣. هدية العارفين ٢/٥٦٨.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٣٥.

٥. معجم أعلام الكورد ٧٦٨.

## يوسف عبدالله عەينتابی (١٧٥١)

ناوی یوسفە، کوڕی عبداللە یە، خەڵکی (عەینتاب)ە، مەزهەبی حەنەفی بووە، (قازی) بووە، حاشیەی لەسەر (قازی میری هیدایة)ی حیکمەت هەیە، ساڵی ١١١٧ك – ١٧٠٥ز لەنێوان (مەککە) و (مەدینە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٣/٣١٤.

٢. هدية العارفين ٢/٥٦٧.

## يوسف عبدالله گۆرانی (١٧٥٢)

ناوی یوسفە، کوڕی عبدالله ی کوڕی عومەری کوڕی عەلی کوڕی خضری گۆرانی یە، لە (هدية العارفين) ناوی باوکی بە (عبدالكريم) نووسراوە، لە زانستی سەرەوە و دەروونی دەستی باڵا بووە، خانەقای لە (میصر) و لە چەند وڵاتان هەبوو.

دانراوی زۆرن، لەوانە:

١. ريحانة القلوب في التوصل الى المحبوب.

٢. بيان أسرار الطالبين في التصوف.

٣. شرح أربعة أحاديث.

٤. بديع الانتفاث في شرح القوافي الثلاث.

٥. سوانح الكتب.

ساڵی ٧٦٨ك – ١٣٦٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الأعلام ٦/٩٧ /٩/٣١٧.
٢. الدرر الكامنة ٤/٤٦٣.
٣. معجم المؤلفين ١٣/٣١٣ – ٣١٤.
٤. معجم أعلام الكورد ٧٧١.
٥. إيضاح المكنون ١/١٧١.
٦. كشف الظنون ١/٢٦٠ – ٩٤٠.
٧. هدية العارفين ٢/٥٥٧ – ٥٥٨.
٨. جامع كرامات الأولياء ٢/٥٣٤ – ٥٣٦.
٩. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/١٦١ – ١٦٣.
١٠. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٢٨ – ٦٢٩.

## يوسف عبدالله ماردينی (١٧٥٣)

ناوی یوسفە، کوڕی عبدالله یە، خەڵکی (ماردین)ە، مەزهەبی حەنەف بووە، چوویتە (قاهیرە) لە (جامع الأزهر) ئامۆژگاری خەڵکانی کردووە، زاتەکی زۆرزان و نەرم و بێ فیز و بەخێر بووە، تەفسیری زۆر لەبەربووە، دوای تەمەنی پەنجا ساڵی، لە ٨١٩ك – ١٤١٦ز بە نەخۆشی تاعون کۆچی دوای کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٧/١٤٤.
٢. الضوء اللامع ١٠/٢٩١.
٣. معجم أعلام الكورد ٧٧١.

## یوسف عبدالجلیل کوردی (١٧٥٤)

ناوی یوسفە، کوڕی مەلا عبدالجلیلی کوڕی مصطفەفای کوردییە، لە (موصڵ) هاتەدنیا، مەزهەبی حەنەفی بوو، زانایەکی شەریعەت زان بوو، لە قوتابخانەی (قەرە مصطفا پاشا) دەرسی دەدا، لە مزگەوتی یونس پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) و لە مزگەوتی (الطغرائية) وەعزی دەدا، ساڵی ١٢٤١ك – ١٨٢٥ز کۆچی دوایی کرد.

چەند کتێبی داناون، لەوانە:

١. الانتصار للأولياء والأخيار: سەرەتایەکەی دەست پێدەکا، بە: (الحمد لله الذي ملأ قلوب أحبته من سر محبتة سروراً، وكسا وجوههم من إشراق ضياء بهجته نورا ..).

٢. كشف الأسرار وذخائر الأبرار.

٣. الإستشفا باحاديث المصطفى.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/١٦٩.

٢. إيضاح المكنون ٣/١٣٠.

٣. اسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ١٥٣.

٤. معجم المؤلفين ١٣/٣٠٦ – ٣٠٧.

٥. هدية العارفين ٦/٥٧٠.

٦. مشاهير الكورد ٤٣١.

## یوسف علی صالاری (١٧٥٥)

ناوی یوسفە، کوڕی عەلییە ناسراوە بە: (صالاری)، زانایەکی شارەزا بووە چەند دانراوی خۆی هەیە، لەوانە:

١. شرح علی الأسئلة: سەرەتایەکەی (ينتقض كل تعريف ...)ە، لەوانەیە شەرحی (الأسئلة الثلاثة)ی فەنناری بێ لە مەنتیق.

٢. حاشية على شرح الأسئلة: سەرەتایەکەی: (قوله: ولا خفاء) یە.

